49
پرۆژەی ئیشک



# ئیمام حەسەن بەننا



نووسینی
مستەفا موحەممەد تەححان

وەرگێرانی
موحەممەد عەبدولڕەحیم

پرۆژەی تیشك - 49

پرۆژەی تیشك

# ئیمام حەسەن بەننا

١٩٠٦ ـ ١٩٤٩م


نووسینی:
مصطفى محمد الطحان

وەرگێڕانی:
محمد عبدول رحیم



2009-1430

پرۆژەی تیشک


ناوی کتێب: ئیمام حەسەن بەننا

نووسینی: مصطفى محمد الطحان

وەرگێڕانی: محمد عبدول رحیم

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٤٣٢) ساڵی (٢٠٠٩)

نۆرەی چاپ: دووەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشك)، ژمارە (٤٩)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:

www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com



## ناوەرۆك

ئیمام حەسەن بەننا

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا
لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ
ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ﴾

**البقرة – ١٤٣**

## پێشەکی

کاتێك شیرازەی ژیانی گەلێك تێکدەچێت, ئەڵقەکانی پەیوەندیان یەك لەدوای یەك لەیەکتری دەترازێن.

کاتێك نەفامی و نەزانین باڵی رەشیان بەسەر دڵ و گیانی مرۆڤەکاندا دەدەن و کەڵبەی ژەهراوییان لە جەستەیان گیردەکەن و نیازیانە هەموو کون و درزێك لە بەردەم رۆشنیدا دابخەن.

کاتێك گەورە پیاوانی وڵات هیمەتیان دە پووکێتەوە و هەڵمەتیان تەنیا بۆ پڕکردنی گیرفان و بۆ تێر کردنی ئارەزووەکانیان دەبێت.

کاتێك پاشای وڵات دەبێتە دۆستی بێگانە و سەرکەوتکەری میللەتی خۆ ئەوەی سەری. بەقەد گوێزێك لێ بکات .. دەبێ بشکێت.

کاتێك لە ئەنجامی بێپلانی و بێ کارەیی بایەقوشی هەژاری لە سەربانی زۆربەی زۆری ماڵەکان دەخوێنێت و پارووی ژیان دەبێتە هیوایەکی دوور و بە ئاسانی دەست پێی ناگات.

کاتێك ڤایرۆسی خۆپەرستی ناخی هەموو بەرپرسەکان دەخوات، لە جێی پارێزگاری لە خەڵك و خاك و بەهای باڵا.. سەرجەم ئەمانە لە بازاڕی نیازە چەپەڵەکاندا هەڕاج دەکرێن.

کاتێك فەرمانی سەرۆکایەتی یان پادشاهی لە سەفارەتی بیانییەوە رەشنووسەکەی دەنوسرێت.

کاتێك بەرپرسیاری دەبێتە دەستکەوت و خواردنی ماڵی میللەت بێ بەرامبەر دەبێتە ئازایەتی و تەمەڵی و کارنەکردن دەبنەشانازی.

کاتێك .. کاتێك... کاتێك...

ئەمانە و شتانی لەم بابەتە دەرئەنجاممن.. دەرئەنجامی ونکردن و لەدەستدانی بنەماکانی ژیانن، ژیان واتە: پێکەوە ژیان و قبوڵکردنی یەکتری.

ئەمانە دەرئەنجامی پاوەنخوازی و قۆرخکردنی دەسەڵات و سامانن.. دەرئەنجامی جیاکاری نێوان چینی فەرمانڕەوا و خەڵکن، تاوەکو دەسەڵاتدارن بگەنە (اعلی علیین) و (قیر بە قەرەس) با میللەت هەر لە (اسفل سافلین) دا بێت.

ئەمانە دەرئەنجامی ئەوەن بەرپرسانی وڵات خێر و بێری وڵات وەکو شاباش بە دوژمنان بدەن و بە میللەتی خۆیان بڵێن: بابیبەن!! چونکە ئێمە خۆمان نازانین بەرهەمیان بهێنین و بۆیشمان بەکارنایەت!! بەوەش نەبێت گیانی پاشا و کورسی پاشا و خۆشی و حەوانەوەی پاشا و تەنانەت سەلامەتی پاسەوان و پارێزکارەکانیشی دەکەونەوە مەترسییەوە.

ئەمانە دەرئەنجامی ئەوەن فەرمانڕەوا بە جیا لە جەماوەر ژیا, ئەو کات گەلی خۆیی لە دەست دەدات، دەبێت لە دەرەوە خەڵکی بێنێت پاسەوانی خۆی و کورسییەکەیی بۆ بکەن.

کۆتایی ئەم دەرئەنجامەمانەش پەرتی وتە و گرۆگرۆیی میللەت و هەرکەس بۆ خۆی دەبێت، ئاشەکەش دوژمنان چۆنیان ویست وا دەیگێڕن و ئەوکاتەش سەرئەنجامی هەموو هاوکێشەکان یەکسانن بەزیانی خەڵك و دواکەوتنی وڵات و لە دەستدانی سەروەری و سامان و .. ریسوابوونیش بەشی فەرمانڕەوا و سەرکردەکانیشی دەبێت، ئەمڕۆ بێت یان سبەی.

بارودۆخی لەو جۆرە دواخستن و راوەستان و خاوەخاو کەڵکی ناخوات.

بارودۆخی لەو جۆرە بانگخوازێکی دەوێت لە جەرگەی گەلەوە راپەڕێت بانگی بۆ چاکسازیی و یەکگرتن و یەکڕیزی و پێکەوە ژیان بکات .. بانگخوازێك لەگەڵ

خەڵکدا وەکو خەڵك بژی و هەنگاو هەنگاو بۆ پێکەوە ژیان و بۆ مەبەست ژیان و بۆ ئازادی هەوڵدان و بۆ گێڕانەوەی سەروەریی بۆ خۆ و سەربەخۆیی بۆ نیشتمان, نەوەی نوێ پێبگەیەنێت.

ئەو بارودرخە سونبولێکی دەوێت هێزی خۆ لەخۆ بەرهەم بێنێت و چاوەڕوانی ئەوە نەبێت دوژمنان رەحمی پێ بکەن! ! یان خەڵکی تر کاروباری بۆ چاك بکەن.

ئەو بارودۆخە پاڵەوانێکی نەفەس درێژی دەوێت، بۆ چاکسازیی ژیان و پێگەیاندنی دانە دانەی میللەتەکەی پلانی هەبێت و وەکو پزیشکێکی لێزان دەست لەسەر ئێشەکان دابنێت و پاش ناسینی هۆکاری هەریەکەیان چارەسەری سازو گونجاویان بۆ بەکاربهێنێت.

ئەو بارودۆخە پێشەوایەکی دەوێت شادی خۆی لە ئاسوودەیی گەلەکەیدا ببینێت و بە کردەوە خەڵکی فێری لەخۆبردن و خۆنەویستی و فیداکاری و پێکەوە بوون و پێکەوە ژیان بکات.

بۆ ناسینی کەسایەتییەکی لەو جۆرە کە خۆی لە قوتابییەکانی سادەتر ژیابێت، بۆ شارەزابوون لە رەوتێکی کاری لەو جۆرە کە هەموو کەسێکی لاگرنگ بێت، بۆ سەرنجدانی کارێکی ئامانج دیار و پلان بۆدانراو و هەمە بابەت و هەمەلایەن.. ئەگەر دامەزرێنەرەکەیشی بڕوات, لەسەر رەوتی خۆی بە هەمان تەوژم و هەمان هێز بێ دوو بەرەکی و پەرتبوون لەسەر چاکسازیی بەردەوام بێت و شێوازی کاری خۆی تێك نەدات و ئامادەیی پێکەوە ژیان و پێکەوە هەڵکردن بێت لەگەڵ هەموو مرۆڤەکاندا.

بۆ بینینی کۆمەڵێك لەگەڵ فشار و زەبرو زەنگ و بێ بەشکردن و رێگا لێ تەسك کردنەوەدا، پڕبەدەم بانگخوازانی هاوار بکەن ئێمە هەر لەسەرپەیمانی

خۆمانین. بۆ بەدیهێنانی ئەو خواستانە ئەم پەڕاوە.. پەڕاوی (الإمام حسن البنا) لە نووسینی (دکتۆر موستەفا موحەممەد الطحان) م وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی تاکو کتێبخانەی کوردی پێی دەوڵەمەند بێت و چاو رۆشنکرنەوەیەك بێت بۆ هەموو ئەوانەی بە هەڵە لەو پیاوە و لە کارەکەی گەیشتوون و پەند و وانەش بێت بۆ ئەوانەی دەیانەوێت دڵسۆزانە خزمەتی گەل و وڵاتیان بکەن و لەگەڵ هەموو چینەکانی خەڵکدا مرۆڤ دۆستانە بژین و بۆ هەموو لارو وێرییەك پرۆسەی چاکسازییان هەبێت.

کۆتایی ئەم ئومەتەش تەنیا بەوە چارەسەر دەبێت سەرەتاکەی پێ چارەسەر بوو.

وەرگێڕ

کانوونی دووەمی ٢٠٠٩



پێشەکی مامۆستا موحەممەد مەهدی عاکف/

رابەری گشتی برایانی موسوڵمان



لەسەر گۆڕەپانی فراوانی جیهانی ئیسلامیی، لە نێو کەمایەتییەکاندا لە دەرەوەی جیهانی ئیسلامیی، ئەگەر کە سێکی پسپۆڕی خاوەن ویژدان سەرنجی دیاردەکانی ژیانەوە و زیندووبوونەوە و هەستانەوە و نوێ بوونەوە و چاکسازی بدات، سەرنجی پڕۆژە ژیارییەکان بدا، رکابەری حەسەن بەننا نابێت، هەروەها لە نێوان بزوتنەوە بێدارییە ئیسلامییەکانی سەردەمیشدا دەبینێت پێشەوای شەهید، حەسەن بەننا سەرکارو پێشەوای ئەم دیاردە مەزنەیە، کە بۆتە جێگەی ئومێد و هیوای موسوڵمانان لە هەموشوێنێك، جا لە نێو رووداوە گەورە و سامناکەکاندا، کە سەرجەم ئوممەتی ئیسلامیی هەژاند و ویژدان و ناخی موسوڵمانانی تەکاندا، نەهێشتنی خەلافەتی ئیسلامیی بوو کە قەلآیەکی سەخت و مەحکەم بوو بۆ سەرجەم موسوڵمانان (هەرچەندە بێ کەموکوڕی

نەبوو) چونکە بە درێژایی مێژووەکەی سپەر بوو، دروشمی (واسلاماە) لەسەر زاری ئوممەت بوو، لە ژێر سایەی ئەو دروشمەدا هەموو گەلان کۆ بوونەوە و کارلێکی هەبوو لەسەر هزر و دڵ و دەروونیان، چ لەسەر ئاستی تاك و چ لەسەر ئاستی جەماوەر. بە درێژایی مێژووی ئیسلام و موسوڵمانان ئەو دروشمە پرۆسەی بەرهەڵستکاری بوو.

ئەو دروشمە سەر لەنوێ سەری هەڵدایەوە.. لە کاتێکدا کە بەڵاو رووداوی گەورە بە بەرپابوونی جەنگی جیهانی یەکەم روویاندا.

دوای تەواوبوونی جەنگ کۆمەڵێك لە زانا و خەمخۆران و بیریاران لە قاهیرە کۆبوونەوە و کۆمەڵی لاوانی موسوڵمانانیان پێك هێنا.

جا لەو کەش و هەوایەدا حەسەن بەننا لاوی تەمەن بیست ساڵ لەگەڵ سیان لە هاوەڵانیدا هەندێ جار دەگریان بۆ لە ناوچوونی دەوڵەتی خەلافەت و ئەو بارودۆرخەی کە ئوممەتی ئیسلامیی تێکەوتبوو، لە هەمانکاتیدا بیریان دەرکردەوە کە چی بکەن باشە، تا فریای ئوممەت بکەون و لەو هەڵدێرە سامناکە رزگاری بکەن. جا لەو حاڵەتە دەرونییەی کە ئەم لاوە تیایدا دەژیا بۆمانە دەدوێت و دەڵێت: مەگەر خوا بزانێ کە چەندەها شەو شەونخونیمان کردوە و باسی ئەو بارودۆخەمان دەکرد، کە ئومەتی تێکەوتووە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، نەخۆشییەکانمان شی دەکردەوە، چارەسەریانمان باس دەکرد، هەندێ جار دەستمان دەکرد بە گریانی بە کوڵ بۆ ئەو بارودۆخەی کە تێیکەوتبووین، جاری وا هەبوو سەرسام دەبووین کاتێ کە خۆمان دەبینی لە حاڵەتی دەروونی ئاوادایین، دۆستان و هاوەڵانێ سەرگەردانیش لە چایخانەو یانە گەندەڵ و ناپوخت نا لەبارەکاندا گرنگترین کاتەکانی تەمەنیان بەسەر دەبرد، ئینجا ئاماژەدەکات بۆ ئەو بڕیارەی کە خۆیی و سێ هاوەڵەکەی لە ساتێکی



مێژویدا لەسەری ڕێکەوتین: (بێگومان ئەو ڕووداوانە کارلێکی زۆری هەبوو لەسەر دڵ و دەروونم و سەرنجی ڕاکێشام بۆ ئەوەی بە گەرم و گوڕی دەست بدەینێ و ڕێبازی خۆ دروستکردن بگرینەبەر، دوای ئەوەی بێداربوینەتەوە، پێویستە دوای لێکۆڵینەوە خۆمان ڕێك بخەین).

ئا بەو شێوەیە لە ساڵی ١٣٤٧ ك ١٩٢٨ ز ئەو ساتە مێژوییە سەرەتا بوو بۆ گۆڕانێکی بەرچاو کە بە خەمخۆری حەسەن بەننا دروست بوو وە بوو بەهۆی بەرەو پێش چوونی پڕۆژەی ئیسلامیی بە شێوەیەکی شارستانی و ژیاری نوێ و تازە کردنەوەی دنیای موسوڵمانان بە نوێ کردنەوەی تێگەیشتن لە ئیسلام.

لە ڕاستیدا ئەو ساتەوەختە مێژوییە پیرۆزەی کە ئەم پیاوە هەڵکەوتووە کارامەیە بڕیاری تێدا دا، کاتێك بوو بەرهەڵستی زۆر هەبوو، لە زۆر کە لێنەوە هێرش کرابوو، بەلاًکان هەموو لایەکیان گرتبوو، دەیزانی کە پێویستە کار لەو بارودۆخە لە نێوان کەسانێکی کەمی هەڵبژاردەوە کە کۆمەڵی(العروة الوثقى) و (الشبان المسلمين) یان پێك هێنابوو، بگوێزرێتەوە بۆ بازنەیەکی فراوان، تا ببێتە خەمی ئوممەت و لەگەڵ ئەو خەمخۆرانەدا بگەنە ئاستێك کە جەماوەر لەگەڵ ئەو دەستە تایبەتییەدا بەرەنگاری کۆسپ و لەمپەرەکان ببنەوە.

ئیتر ئەوە بوو حەسەن بەننا توانی ئەو بەرهەمە مێژووییە گەشەپێبدات و کارکردێکی بەرچاوی هەبێت لە ژیانەوەی کاری ئیسلامییدا، ئەویش بەوەی کە بەردی بناغەی پڕۆژەی ژیاری و بەرنامەی نوێ کردنەوەی تێگەیشتن لە ئایین و دنیای ئومەتی داڕشت، بە شێوازێکی ڕوون و فراوان، بەشێوەیەك کە بگونجێت لەگەڵ ئەو واقیعەی کە تازە بەرپابووە و ئەو گۆڕانکاری و ئاستەنگانەی کە پەیدابوون.

لە راستیدا ئا ئەوساتە وەختە مێژوییە بوو کە بەرەبەیانێکی نوێی بەشوێندا هات و هەر ئەوەش بوو بەهۆی گۆڕانکاری و گەشەیەکی تایبەتی لە مێژووی بزاوتی ئیسلامیی نوێدا، وە هەر ئەوەش جێ دەستی ئاشکرای لە بێداری ئیسلامیی سەردەمدا چەسپاند.

لە راستیدا کەسایەتییەکی بێدار و شارەزابوو لە یاسای پلە بە پلە و قۆناغبەندی لەم پڕۆژە ئیسلامییەدا، بۆیە هەر لەو سۆنگەیەوە دەیوت بەوانەی کە پەلەیانە و دەیانەوێت قۆناغەکان ببەزێنن: (ئەی برایانی موسوڵمان بە تایبەت ئەوانەتان کە زوو هەڵدەچن و پەلەتانە... وەرن یەك بڕیاری روون و دڵنیا بەخشم لێوەربگرن: ئەم رێگەو رێبازەی ئێوە گرتووتانەتەبەر، نەخشەی بۆ کێشراوە، سنوورەکانی دیاریکراوە, منیش بڕیارم داوە سەرپێچی لەو سنوورانە نەکەم کە دڵنیام چاکترین نەخشە و بەرنامەیە بۆ گەیشتنە ئامانج، بەڵێ رەنگە رێگەو رێبازێکی دوور و درێژبێت، بەڵام چارە نییە، چونکە رێگەی ترنییە، پیاوی پیاوانەش بەخۆگری و ماندوو نەناسی و گەرموگوڕی و کاری بەردەوام دەردەکەوێت، جا ئەوەی دەیەوێت میوەکان پێش پێگەیشتنی لێبکاتەوە, یاخود گوڵەکان پێش کاتی خۆی بقرتێنێ، ئەوە من بە هیچ شێوەیەك لەگەڵیدانیم، و من پێم باشە کە رووبکاتە کۆمەڵێکی تر، بەڵام ئەوەی خۆی دەگرێ تا تۆوەکە گەشە دەکات، درەختەکە دەڕوێت و کاتی لێکردنەوەی بەرەکەی دێت، ئەوە پاداشتی لەسەر خوای گەورەیە، بێگومان بێ بەشمان ناکات لە یەکێ لەو دوو سەرئەنجامە: سەرکەوتن و دەسەڵات، یاخود شەهید بوون و بەختەوەری). بەڵێ ئەو پیاوە خۆی گرت و زۆرێکیش لەگەڵیدا خۆیان گرت، پێشەواو رابەرانیش بەدوایدا هاتن، هەتا تۆوەکان روان و درەختەکان گەشەیان کرد، ئەوەتە ئێستە دەبینین ئەو کۆمەڵەی ئەو



دایمەزراند، کاروانی بێداری ئیسلامیی لەژێر سێبەرەکەیدا لە ڕۆژھەت و ڕۆژئاوای زەویدا کاری بەردەوامی خۆی دەکات و بەکارکردن بۆ ئایینی خوا ئاسوودە دەبێت, دەبینین ئەو پڕۆژە ژیارییەی کە لەگەڵ خەمخۆرانی نوێکردنەوەدا ڕێکیانخست بووەتە هیواو ئاواتی موسوڵمانان لەھەموو شوێنێکی سەر زەویدا.

زیادەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین: کەسایەتی و بانگەواز و کۆمەڵەکەی ئەو سەرقافڵەی نوێکەرەوەی سەدەی چواردەھەمی کۆچییە بەرامبەر سەدەی بیستی زاین و دواتریش.

ئەم کتێبەی کە لە بەردەستتدایە لە دانانی برای بەڕێز (مصطفى محمد الطحان) بەوەوەنەوەستاوە کە ژیان نامەی ئەو سەرکردە و پەروەرشکارە بخاتەروو، بەڵکو وەکو بیرو بۆچون و پڕۆژە ئامادەی کردووە کە کارکردی بەردەوامە و مێژوویەکی نەخشێنراوە و بەردەوام ڕۆڵی خۆی دەبینێت، پەیوەندی لە نێوان بیروبۆچوون و پیادەکردندا لەسەر ئاستی شێوازە جیاوازە و بوارەکانی کاردا پتەو دەکات , بۆیە بووەتە حاڵەتێك کە شایستەی گرنگی پێدانە، ھەمووان ھەوڵدەدەن کە ئەم بانگەوازە و ئەم کۆمەڵە بناسن و تێبگەن لە سەرچاوەی ھێزو بیرو بۆچوونی لە ھەموو بوارەکاندا.

خوای گەورە پاداشتی برای بەڕێز (مصطفى محمد الطحان) بداتەوە لەسەر ئەم ھەوڵەی بۆ ڕونکردنەوەی بانگەوازی پێشەوای شەھید و کۆمەڵەکەی, ھەروەھا لە خوای گەورە داواکارین کە بەم بەرھەمە سوود بە ھەموو موسوڵمانان بگەیەنێت.

محمد مهدی عاكف

ڕابەری گشتی برایانی موسوڵمان / ٢ موحەرەم ١٤٢٩ / ٥ شوباتی ٢٠٠٨

## بۆچی دەربارەی حەسەن بەننا دەنووسین؟

ئەمڕۆ ئێمە بەشوێن سونبولەکانی ئوممەتدا دەگەڕێین.. ئەوانەی لەکاتی تەنگانە و پێویستدا دەردەکەون... تەنگژە و تەمومژەکان دەڕەوێننەوە بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵدەسن و لەکرداری بوژاندنەوەی ئوممەتدا بەگوێرەی ئەو بارودۆخەی تێیدان ئەرکی خۆیان ئەنجام دەدەن.

ئەو سونبولەی بۆی دەگەڕێین دەگونجێ جێنشینێکی پێگەشتوو بێت، وەکو عومەری کوڕی خەتتاب، یان سەرکردەیەکی سەربازی بێت، وەکو ئەبو عوبەیدە یان خالیدی کوڕی وەلید یان صەلاحەدینی ئەیوبی، یان پەروەرشکارێکی گیانی بێت وەکو عەبولقادری گەیلانی، یان حەسەن بەننا.

دەگونجێ ئەو سونبولە مامۆستایەك یان زانایەکی ئایینی یان دنیایی بێت. . دەگونجێت عەرەبێك بێت لەوڵاتی عەربستانەوە یان کوردێك بێت لە کوردستانەوە و، یان داغستانییەك بێت لە قۆقازەوە، چونکە ئەم ئوممەتە پەیامی پێکەوە ژیانی بۆ هاتووە و، بۆ ئەو مەبەستەش خوا لە ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری رزگاری کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ئەوەی بانگەواز بۆ دەمارگیری بکات لەئێمە نیە).

دەگونجێت ئەو سونبولەی لێی دەگەڕێین لاو بێت کە زۆر جار سونبولەکان لاون، چونکە ئەوان جەستە بەهێز و عەقل تیژ و چاکتریش تێدەگەن، دەشگونجێ تەمەندارێك بێت کە سەختییەکانی رۆژگاری شێلابێتی و کەسێکی لێهاتووی لێ دارِشتبێت و بوبێتە یەکێك لەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەیان فەرموویەتی: (خوای گەورە لەسەری هەر سەدساڵێکدا کەسێك دەنێرێت کە کاروباری ئایین نوێ بکاتەوە).



—ئێمە بەدوای ئەو سونبولانەدا دەگەڕێین.تا لەگەڵیان بژین و لەلایەنەکانی گەورەییان بکۆڵینەوە، تا گرنگترین لایەنی ژیانیان بزانین، ئەمەش لەبەر ئەوەنا عەودالی مێژووین.بەڵکو لەبەر ئەوەی عەودالی ژیانسازیین.. ژیانسازییش پێویستی بەمامۆستا و قوتابی هەیە، پێویستی بە پێشەنگێکی بەرێزە ببێتە سەر قافڵە، پێویستی بە گەنجێکی هیممەت بەرزە دڵی بێتە جۆش و شوێن پێی ئەو سەرقافڵەیە هەڵگرێت و رێگای کارکردنی خۆی پێ بدۆزێتەوە.

ئەمە رێزگرتنی ئوممەتە لەسونبولەکانی. بەڵکو لەو لاوانەش کە باوەڕیان بە پەروەردگاریان هێناوە و پەروەردگاریش بە شوێنکەوتنیان بۆ سونبولەکان رێنوێنی زیاتریان پێ دەبەخشێت.

ئەو لاوانە ئەگەر سونبولی زەمانی خۆیان نەدۆزنەوە، رێگای بەردەمیان درێژ دەبێتەوە و ئەرکی سەرشانیان قورستر دەبێت و، گەیشتن بە ئامانجیان لێ تێك دەچێت.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەرخستنی ئایینەکەی برایەتی خستبێتە نێوان کۆچەریان و پشتیوانان، ئەمڕۆ ئێمە بۆ هێنانەوەی ئەو مێژووە و دووبارە دارشتنەوەی ژیانی خواناسین پێویستە برایەتی بخەینە نێوان سونبولەکانی رابوردوو و ئێستا. بۆیە پێویستە دەربارەی حەسەن بەننا یان هەر سونبولێکی تری کاروانی ژیانسازیی بنووسین..



شێخ محمد رشید رضا



شێخ محمد رشید رضا

ئەمە لەلایەك لەلایەكی تریشەوە لە دووسەدەی رابوردوودا سەرزەمینی ئیسلام كەوتە ژێر چنگی خاچ پەرستان. خوێنی موسوڵمانانیان بەناهەق رشت، سامانیان بەتاڵان برد، بۆ شێواندنی ئایین و هزری موسوڵمانان چیان بۆ كرا درێغییان نەكرد.. كەسانێكیان پەروەردە كرد كە بەزمانی ئێمە بدوێن و زێوانی پەرستگاكانی ئەوان بن، ئەمانەیان كردە سونبول و ئەوەندەیان پیاهەڵدان تا لاوانی ئێمە پێیانەوە سەرسام بن، بۆیە ئەمڕۆ لەهەموو كات زیاتر پێویستمان بە سونبولی راستەقینەیە، كە خاوەنی باوەڕی دامەزراو هزری ورد و هەستی ناسك و ویستی بەهێز بێت، بەشێوازێكی جوان بكەوێتە بەرچاوی لاوانمان، تاوەكو بەهۆیەوە راستی ببیننەوە و هەست بەئازارەكانی ئوممەت بكەن و دەردەكانی دیاری بكەن و دەرمانەكانی بۆ بدۆزنەوە و دۆست و ناحەز بناسن.

جا حەسەن بەننا لەو سونبولانەیە كە ئێمە بۆی دەگەڕێین.

مامۆستا (**محمد الغزالي**) لەپێشەكی پەڕاوی (**دستور الوحدة الثقافية**)دا دەڵێت: ئەو حەسەن بەننایەی من و چەندانی تر وەسفی دەكەین، بەوەی كە نوێخوازی سەدەی چواردەهەمی كۆچییە. كۆمەڵێك بنەمای داناوە، پەرتەكان كۆدەكەنەوە و ئامانجیان بۆ روون دەكەنەوە و موسوڵمانان لەدەوری پەڕاوی خوا و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ كۆدەكەنەوە و چارەسەری لارو وێری و شل و شۆڵی لەمەو پێش دەكەن و هۆكارەكانی لاوازی و تەمەڵی لە گۆڕ دەنێن.

ئیمام بەننا زۆر شەیدای قورئان خوێندن بوو، بەدەنگێكی ناوازە دەیخوێندەوە و چاك لەماناو مەبەستەكانی تێدەگەیشت، لەتەفسیر و لێكدانەوەكەیدا دەتوت: (**طبري**) یان (**قرطبي**)یە، بەئاسانی لەمانا گرانەكان دەگەیشت و بەشێوازێكی زۆر ئاسان گوێبیستانی لێیان تێدەگەیاند.



ناونیشانی سۆفیەتی هەڵنەگرتبوو، دووریش کەوتەوە لەو تەریقەتە سۆفیەتیەی بنەماڵەکەی لەسەری بوون.. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێبازی بۆ پەروەردە کردن و خەمخواری بۆ شوێنکەوتووانی و گەشەدانی بەگیانی خۆشەویستیی خوایی ئەوەندە جوان روون کربووەوە، شاکارە پەروەردەییەکانی (**حارس المحاسبي**) و (**أبوحامد الغزالي**) دەهێنایەوە یاد.

ئیمام بەننا لای باوکی زانستەکانی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ خوێندبوو باوکی (**مسند الإمام أحمد**)ی دووبارە داڕشتبووەوە، وە هەروەها زانینی فیقهیشی خوێندبوو، لەبەرامبەر زانایانی پێشین و دوایین چاوی کرابووەوە و پاشان ڕێگەی کەوتبوە سەر ڕێبازی مامۆستا (**محمد عبده**) و لەگەڵ مامۆستا (**محمد رشید رضا**) کەخاوەنی گۆڤاری (المنار) بوو گفتوگۆیەکی ناوازەیان ئەنجام دابوو، هەرچەندە لە ڕووی ئاست و توانای زانیارییەوە پێیەوە سەرسام بوو، سوودیشی لێوەر دەگرت، بەڵام نەئاڵا لەوەی ئەو لێی ئاڵا بوو[١].

ئەو لەبەرزکردنەوەی ئاستی جەماوەردا زۆر کارا بوو، جگە لەوەش هەمیشە لەخەمی ئەوەدابوو لە دیاردەی دەمارگیری و هۆکاری جیاکاری بەدوور بێت.

لەمێژووی ئیسلامدا زۆر شارەزا بوو، هەموو هۆکارەکانی گەشەسەندن و پوکانەوەی سەرجەم سەردەمەکانی چاك دەزانی و زۆر بەقووڵیش لەبارودۆخی جیهانی ئیسلامیی سەردەمی خۆی و هەموو ئەو پیلانانەی دژی دەکران لەلایەن داگیرکەرانەوە تێگەیشتبوو.

بەم شارەزاییانە و بەو هەموو خەمخۆری و لێبڕانەوە، ئەم پیاوە دەستی کرد بەگەڕان بەناو شار و دێهاتەکانی میسردا، پێم وایە هەموو شارەکان و زیاتر لە

---

(١) مەبەست لەوە ئەوەیە کە مامۆستا (محمد رشید رضا) زۆر بەتوندی هێرشی دەکردە سەر زانا ئەزهەریەکان و رەویەکانی سۆفییەتی کە شێوازێکی لاسایی کردنەوە و چەق بەستوییان بەرجەستە دەکرد. (الإخوان المسلمون، یوسف القرضاوي ص ٥٣).

سیّ چواریەکی دێهاتەکان گەڕابێت و لەماوەی بیست ساڵدا جەماوەرێکی زیندووی تازە نەفەسی تەیار کردو هەژاندنی...ئەو جەماوەرە بناغەی سەختی داگیرکردنی رۆشنبیری و سەربازی ورد و خاشکرد.

ئێستا دەزانیت بۆچی لەسەر حەسەن بەننا دەنووسین؟ کەواتە ئەم کتێبە بۆ رابواردن و کات بەسەربردن نیە، بەڵکو نووسینێکە ورە بەهێز دەکات و کاروبارەکان رێك دەخاتەوە و ژیانسازیی دەخاتەوە دەست نەوەی نویّ.

## سونبولسازیی:

ئیمام بەننا دەستی دایە کاری سونبولسازیی، ئەوەش کارێکی سەخت و گرانە، مەگەر خوا بۆ کەسێکی ئاسان بکات. لەپەروەرشکارانی زۆر دەبیسین کەلاوان بۆ پێگەیشتن و دەرکەوتن هان دەدەن، بەڵام کەمیان بەرهەمیان دیار و کاریگەر دەبێت. ئەگەر بەشوێنی هۆکارەکانی سەرکەوتنی بەرهەمدارەکاندا بگەڕێین دەبینین بریتییە لە: دڵسۆزی (**الإخلاص**).

دڵسۆزی ئەو کارەیە کە کۆمەڵی بانگخوازان جیادەکاتەوە.. بەوە جیایان دەکاتەوە کە بۆ خۆشەویستی و پەروەردەی لاوان لێدەبڕێن و بۆ رزگاری دەستیان دەگرن و بۆ مەشخەڵداری پێیان دەگەیەنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرووی هەموو ئەوانەوەیە کە بە بانگەوازەکەی خۆشەویستی دەخستە نێوان خۆی و ئەوانەی بانگی دەکردن، هێندە خۆشی دەویستن، ئەو بوویە خۆشەویستترین کەس لەلایان. . کە لە کەسوکار و خەڵك و لە خۆشیان زیاتر خۆشیان دەویست. بەرهەمی ئەو خۆشەیستیەش پێگەیشتنی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە بوو (**أبوبكر و عمر و أبوعبيدة و خالد و**) ئەوانەی کە بۆ هەتا هەتایە ئەستێرەی گەشی ئاسمانی مرۆڤدۆستین.

ئیمام بەننا لەسەر رێنوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە رێگا. . لاشە متبووەکانی جوڵاند. . لەسەر شەیدایی بۆ یەکتری دەستی لاوانێکی وەکو (**حامد ربيع**) و (**توفيق الشاوي**) و (**سيد سابق**) و (**محمد الغزالي**) و (**بهي الخولى**) و (**القرضاوي**) و (**كامل شريف**) و (**عمر التلمساني**) و چەندینی تری گرت. ..ئەمانەی بە وشەی جوان و هەڵوێستی کرداری و دڵسۆزانە کردە بانگخوازانی گەورە.

لەعەممان ئامادەی ئاهەنگێك بووم کە برایانی موسوڵمانی عەممان بەبۆنەی سەدهەمین ساڵیادی لەدایك بوونی ئیمام بەنناوە سازیان دابوو، لەو ئاهەنگەدا (**كامل شريف**) کە لەکاتی خۆیدا بەرپرسی خەباتگێڕانی برایان بوو لەفەلەستین قسەی کرد، لەناو قسەکانیدا وتی: مامۆستا حەسەن بەننا بۆ سەردانی خەباتگێڕان هات بۆ فەلەستین، لەو سەفەرەدا پێی وتم: ئەگەر بهاتمایە فەلەستین و تۆم نەدیبا، وام دادەنا کە لە سەفەرەکەمدا سەرکەوتوو نیم. بێگومان ئەم پێزانینە چی لە لاوێکی تازە پێگەیشتووی وەك (**كامل شريف**) دەکات؟ وە چۆن گیانی خۆشەویستی لە نێوان سەرکردەو سەربازدا دروست دەکات، چۆن پێی دەبێتە سونبولێکی گەورە و سەرکردەیەکی خەباتگێڕ.

جیاوازی زۆرە لە نێوان قسە گەلێکی وشك و کاڵ، کە کەسێك دەیڵێت و بەردڵ ناکەوێت ،لەگەڵ وشە و هەڵوێستی سەرکردەیەکی خواویست و دڵسۆز کە بەشەوق و خۆشەویستییەوە لەگەڵ براکانیدا دەژی، ئەوانەبۆ گەشەسەندنیان تەنیا پێویستیان بەتاکە وشەیەك یان تاکە هەڵوێستێك هەیە، کە لەمەیداندا لەسەرکردەکەیانی ببیستن یان ببینن.

## ئەو دەوروبەرەی ئیمام بەننا ی تێدا پێگەیشت:

چاکسازان نەوەی دەوروبەر و بارودۆخی ژیانیانن، ئەوەی بێتە ناو گەلێکی ژێر دەستە و داگیرکراو، کەچی باس لە سۆفیەتی و خەڵوەتی ناو مزگەوت و دوعا و پاڕانەوە بکات بەچاکساز دانانرێت. ئەوەی لەناوچەیەکی پڕ لە نەزانین و نەفامیدا. سەرقاڵی کاری بازرگانی و دنیاگەرایی بێت بەچاکساز دانانرێت.

بەڵکو چاکساز کەسێکە فریای خەڵکی دەڤەرەکەی دەکەوێت و خەمیان دەخوات و بۆ چارەسەری دەردەکانیان دەگەڕێت.

کاتێك کە قورەیش لەمەککەدا هاوەڵانیان دەچەوساندەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە و پێی فەرموون: حەبەشە پادشایەکی دادپەروەری لێیە و لەسایەی دەسەڵاتی ئەودا کەس ستەمی لێناکرێت.

هەندێکیان کۆچیان کرد، بەڵام ئەوە لای قورەیش سەخت بوو کە ئەوانە لە دەستیان دەرباز بن، بۆیە دووپیاوی زۆر زانیان (**عبدالله ی کوڕی أبو ربیعة**) و (**عەمری کوڕی عاص**)یان ناردە لای نەجاشی، بۆ ئەوەی ئەو موسوڵمانە پەنابەرانە وەدەرنێت، نەجاشی لە موسوڵمانەکانی پرسی: ئەو ئایینە چییە کە بە هۆیەوە لەو خەڵکە جیابوونەتەوەو لێرەش پێویستتان بەئایینەکەی ئێمە نیە؟ (**جەعفەر**)ی کوڕی (**أبوطالب**) خوا لێی رازی بێت بەناوی پەنابەرانەوە هەستا و وتی: (ئەی پادشا! ئێمە گەلێکی نەفام بووین، بتمان دەپەرست مردارەوەبوومان دەخوارد، داوێن پیسیمان دەکرد، پەیوەندی خزمایەتیمان دەپچڕاند، لەگەڵ دراوسێ خراپەمان دەکرد، بەهێزمان لاوازمانی دەچەوساندەوە، تاکو خوای گەورە لە خۆمان پێغەمبەرێکی بۆ ناردوین، پێغەمبەرێك رەچەڵەکی دەناسین شارەزای راستی و دەست پاکی و داوێن پاکی



هەین، بانگی کردین بۆ لای خوای تاك و تەنیا تاکو بیناسین و بیپەرستین و واز لەو بتە بەردینانە بێنین کە باوباپیرانمان دەیانپەرستن، فەرمانی بەراستگۆیی و سپاردە پارێزیی و بەهێزکردنی پەیوەندی خزمایەتی و پاراستنی دراوسێی پێ کردین، هەروەها فەرمانی پێکردین کە واز لە خوێنڕێژی و حەرامخۆری و داوێن پیسی و درۆ و بوهتانکردن بێنین، ئێمەش باوەڕمان پێی هێناو شوێنی کەوتین. لەسەر ئەمە خزمان کەوتنە سزادان و ئەشکەنجە کردنمان، بۆ ئەوەی لەم ئایینە وازبێنین و بگەڕێینەوە بۆ بت پەرستی و ئەو هەموو کارو رەوشتە چەپەڵانەی کە پێشتر لەسەری بووین، بۆیە ناچار لەدەست ستەم و ئازاردانیان هەڵاتین و رووومان لەم وڵاتەی ئێوەنا، بەئومێدی ئەوەی لای ئێوە ستەممان لێ نەکرێت).

(جەعفەر) بەم روونکردنەوە جوان و رەوانە چی دەویست؟ دەیویست نەجاشی لەو بارودۆخە تێبگەیەنێت کە موسوڵمانان لەمەککە تێیدا دەژیان، کە پێشتر بە بت پەرستیی حاڵیان چۆن بووەو ئێستا بە باوەڕداری حاڵیان چۆنە؟ و دەیویست وەسفی پێغەمبەری ﷺ بۆ بکات، کە کەسێکی ناسراو و مێژوو دیار و مەبەست چاکە و ئامانجەکانی پاکی و بەرزی و راستین.

ئێمەش ئەگەر بمانەوێت ئیمام بەننا بناسین پێویستە شارەزای ئەو بارودۆخە بین کە تێیدا ژیاوە. .. چونکە هەر چاکسازێك کوڕی دەورویەرەکەی خۆیەتی.

# بارودۆخی ژیانی ئیمام بەننا

## بارودۆخی نێودەوڵەتی:

ئەو بارودۆخە نێودەوڵەتییەی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بەسەر جیهانی ئیسلامییدا سەپێنرا بوو، بەم شێوەیە بوو:

– لەساڵی (١٨٩٧ ز ) دووەم کۆنگرەی زایۆنی لە بازل بڕیاری کارکردنی دا بۆ لابردنی سوڵتان (عبدالحمید) و کۆتایی هێنان بەدەوڵەتی خەلافەت، چونکە سوڵتان رازی نەبوو فەلەستین بەجولەکە ببەخشرێت، هەرچەندە هرتزل خۆی پێشنیاری کرد کە سەد ملیۆن لیرەی زێڕ وەك دیاری بدرێت بەسوڵتان و سەد ملیۆنیش وەك قەرزێکی بێ سوود –بەمەرجێ دەوڵەت قەیرانی ئابووری هەبوو.

– لەساڵی (١٩٠٥ ز) کۆنگرەی کامبلێ لە لەندەن بەسترا کە هەموو دەوڵەتە داگیرکەرەکانی وەکو هۆڵەندا و بەریتانیا و فەرەنسا و بەلجیکا و ئەسپانیا و پورتوگال و ئیتالیای تیا بەشدار بوون، کە هەموویشیان دەستیان کردبوو بەداگیرکردنی وڵاتانی ئیسلامیی و بڕیاری ئەوەیان دا، هەر لایەکیان هەر وڵاتێکیان داگیر کردوە و دەستی بەسەریدا بگرێت و چەندی تریشیان بۆ داگیر دەکرێت داگیری بکەن، خەلافەتی ئیسلامیی کۆتایی پێ بهێنن و لە جێیدا رژێمی عیلمانی چەشنی رۆژئاوا دامەزرێنن و دەوڵەتی ئیسرائیلیش لە فەلەستین دامەزرێت، تاکو گەلانی ناوچەکە بەکێشەکانی خۆیانەوە سەرگەرم بن و بواریان نەبێت تا بیر لەدامەزراندنی خەلافەت بکەنەوە.

– لە ساڵی (١٩٠٩ ز) دا بەنەخشەی سێ پیلانگێڕی ناپاك، رۆژئاوا و جولەکە و ماسۆنیزم سوڵتان (عبدالحمید) یان لەسەر کار لابرد، کە بۆ بەرگری کردن لەفەلەستین کێوێکی دامەزراو بوو. بەم لابردنەش یەکەم ئامانجی خۆیانیان دەستەبەر کرد.

– لە ساڵی (١٩١٤ ز ) بەهۆی پارتی (**اتحاد و ترقي**)یەوە کە پارتێکی عەلمانی ڕۆژئاوایی بوو، دوای سوڵتان (عبدالحمید) کاروباری وڵاتی دەبرد بەڕێوە، دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی جیهانی یەکەم ئالێنرا، کە سەرئەنجامەکەی پارچە پارچە کردنی ئەو دەوڵەتە و سڕینەوەی لەسەر نەخشە لێکەوتەوە.




نەخشەی دابەشکرنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست

بە پێی ڕیکەوتتنامەی سایکس بیکو

بەمەش داگیرکەران دووەم ئامانجی خۆیانیان هێنایە دی.

– لەساڵی (١٩١٦ز) هەردوو وەزیری دەرەوەی بەریتانیا و فەرەنسا پەیماننامەی (سایکس بیکۆ) یان واژوو کرد، کە بەپێی ئەو پەیماننامەیە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکرد.

– لەساڵی (١٩١٧ ز) بەریتانیا بەڵێنی (بلفۆر)ی راگەیاند و تیایدا بڕیار درابوو کە فەلەستین بدرێت بە جولەکە و، دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر پێشێلکردنی مافی گەلی فەلەستین دامەزرێت.

– لەساڵی (١٩٢٣ ز) کودەتاچییانی تورکیا بەسەرۆکایەتی ئەتاتۆرك، لەگەڵ دەوڵەتە رۆژئاواییەکاندا پەیماننامەی لۆزانیان واژوو کرد، تاکو لە تورکیا بەتەواوی پەردە لەسەر ئایینی ئیسلام دابدرێتەوە و، ببێتە دەوڵەتێکی عەلمانی رۆژئاوا ئاسا، چ لەڕووی دەستور و یاساوە چ لە ڕووی خوێندن و زمان و کەلتورەوە.

– لەساڵی (١٩٢٤ ز) خەلافەتی ئیسلامی بەشێوازێکی فەرمی وەلانرا.

بێگومان لەو بارودۆخە سەختەدا موسوڵمانان خۆیان لە بەردەم روداوانێکی گەورەدا بینییەوە، بێ خەلافەت و بێ سەرکردە مانەوە، نیشتمانیان بەپارچە پارچە کراویی لەژێر پێی دەوڵەتاندا بوو،

شەریفی مەککە لەحیجاز خۆی بە جێنشین (خەلیفە) دەناساند و مەلیك فوئادی میسریش دەیوت: ئەو شایستە ترە بەجێنشینێتی و، ئاغا خان لە هیندستان بەهەمان شێواز بیری دەکردەوە.

بەمەش خەلافەتی موسوڵمانان لە یاساو دەوڵەتێکی فەرمانڕەوای گەورەوە بوویە بوکە شوشەیەك بەدەستی ئینگلیز و داگیرکەرانی ترەوە، بەمەیلی خۆیان یارییان پێ دەکرد.



## بزوتنەوەکانی تەبشیر و بەگاورکردن:

لەگەڵ ئەم روداوە سیاسییە سەختانەدا و بەشوێن داگیرکاری سەربازیدا لەهەموو ناوچەکانی جیهانی ئیسلامدا بزوتنەوە تەبشیرییەکان بۆ بەگاور کردنی موسوڵمانان کاراکران و لایان وابوو ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە دوای داگیرکردنی وڵاتانی موسوڵمانان دڵی رۆڵەکانیشی داگیر بکەن و بۆ دواجار ئایینی ئیسلام لە ژیانیان وەدەرنێن و لەگەڵ کەلتور و ئایین و ژیانی رۆژئاوا ئاوێتەیان بکەن، بۆ ئەمەش رۆڵی گرنگیان بەگاوران دەدا.

بۆ نموونە لەمیسر رۆڵی قیبتییەکان کە (٣٪)دانیشتوان نابن لەبەڕێوەبردنی وڵاتدا زۆرتربوو لە رۆڵی موسوڵمانان.


سوڵتان عبد الحمید

هەروەها لە سودان، بەریتانیا سیاسەتی باشور دۆستی پیادە دەکرد و لەساڵی (١٩١٧ ز)دا ئەو هێزانەی سەر بە باکور بوون، کە زۆربەیان موسوڵمان بوون فەرمانیان بۆ دەرکرا کە لە باشور نەمێنن و لە ساڵی (١٩٢٢ ز) ناوچەکانی باشوری کردە چەند پارێزگایەك، نەیدەهێشت باکوریەکان هاتوچۆی بکەن بەمۆڵەتی تایبەتی نەبوایە.


مصطفی کمال ئەتاتورك

⊥ فێرگە ئیسلامییەکانیان بەرەو پووکانەوە برد و قوتابخانەی نوێیان بەپرۆگرام و سیستەمی رۆژئاوایی کردەوە و بەستنیانەوە بە تەبشیرەوە و کاریان بۆ دوورخستنەوەی زمانی عەرەبی و قورئانی دەکرد و برەویان بەزمانە ناوچەییەکان دەدا و دەیانویست نووسین بەزمانی لاتینی بێت و لەهەندێك شوێن بەتایبەتی لەتورکیا پیادەکرا.

لەوناوەدا بۆشاییەکی رۆشنبیری دروست بوو، بەهزری دوور لەئایینی پڕیان کردەوە و بۆ ئەو مەبەستە بنکە و دەزگایان دروست کرد کە بەناوی بانگ کردن بۆ ژیار و زانست و هزری رۆژئاواوە گاڵتەجاڕییان بە بیروباوەڕ و پەرستش و ئاکاری موسوڵمانان دەکرد بەمەش:

⊥ ئەو ئوممەتەی کە خوای گەورە بەئایینی پیرۆزی ئیسلام رێزی گرتبوو گەڕاندیانەوە بۆ دەمارگیری و دژایەتی هۆزایەتی.

⊥ مەزهەب گەرایی و جیاوازی ئایینییان هێنایەوە کایە.

⊥ یاسا شەرعییەکانیان گۆڕی بەیاسای وڵاتانی ئەورووپی.

⊥ کاریان بۆ هەڵوەشاندنەوەی خێزان کرد، ئافرەتیان بەرەو رووتبوونەوە و داوێن پیسی برد.

⊥دەستیان گرت بەسەر چارەنووسی موسوڵمانان و بەسەر سەروەت و سامان و ئابوریاندا و وڵاتانی ئیسلامیی بوونە بازاڕی ساغکردنەوەی کاڵاکانی ئەوان. بەکورتی کەسایەتی ئیسلامییان سڕیەوە.

## بارودۆخی ناوچەیی لەمیسر

## یەکەم: بارودۆخی سیاسی

میسر کەوتبووە ژێر چەپۆکی داگیرکاری بەریتانی..دوای سەرنەکەوتنی شۆڕشی (**أحمد عرابي**) لەساڵی (١٨٨٢ ز)دا سەربازانی بەریتانیایی بەدرێژایی و پانایی وڵاتدا دەست رۆیشتوو بوون و بەرژەوەندی خۆیانیان دەپاراست، کار لەدەستی ئەواندا بوو، شای تاج بەسەریش یاری دەستیان بوو!!



گەلی میسر دانەمرکا و کڵپەی شۆڕش دژی داگیرکار بەهۆی کەسایەتییە نیشتمانییەکانی وەکو (**مصطفى كامل**) و (**محمد فريد**) تاودەدرا و گیانی نیشتیمان پەروەریی و ئازادیخوازی و نەتەوایەتی دەبوژایەوە،



مصطفى كامل



سعد زغلول



ئەزهەر

لە یەکەم چواریەکی سەدەی بیستەمدا ڕووداوانی گەورە ڕوویاندا، کە کاریگەری گەورەیان لەسەر کۆمەڵگەی میسری هەبوو، لەوانە:

## ١-شۆڕشی گەلی میسر ساڵی (١٩١٩ ز):

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم و بەستنی کۆنگرەی ڕێکەوتن (الصلح) لەپاریس، نیشتیمان پەروەرانی میسر بڕیاریاندا بەسەرۆکایەتی (سعد زغلول) شاندێك لە سیاسەتمەدارانی میسر بنێرن بۆ پاریس، تاکو پرسی سەربەخۆیی میسر بخاتە بەردەم کۆنگرەکە، ئینگلیزەکان کە بەمەیان زانی ڕێگەیان نەدا شاندەکە سەفەر بکات، و (**سعد زغلول**) و ژمارەیەك لە هاوڕێیانی لە (٦)ی ئاداری (١٩١٩ ز) دا دەستبەسەر کران و دوور خرانەوە بۆ دورگەیماڵتە، ئەمە بوویە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش و خۆپیشاندان لە شارو دێهاتەکانی میسرەوە دەستی پێکرد، هەموو چینەکانی گەل. لەزانایان و قوتابیان و مامۆستایان و کرێکاران و جوتیاران و لاوان و پیران و ژنان بەشدارییان تێدا دەکرد. شەقامەکانیان کردە شانۆی نواندنی توڕەیی گەل وداوای ئازادی و سەربەخۆیی و چارەی خۆنووسینیان دەکرد.. ڕێپێوانەکان لە مزگەوتەکان و لەئەزهەرەوە دەردەچوون. ئەزهەر سونبولی ئیسلامەتی و تاکە پەیمانگەی ئەو سەردەمە بوو.




نەخشەی مصر

## ٢-لیژنەی لۆرد و میلنەر:

پاش گەشەسەندنی گیانی تورەیی و بەرگری لەلایەن گەلی میسرەوە و بەردەوامی رێپێوانەکان، بەریتانیەکان بۆ لەباربردنی ئەو شۆڕشە لە (٢٢ ی ئەیلولی ١٩١٩ ز)دا لیژنەیەکیان بەسەرۆکایەتی وەزیری وڵاتە داگیرکراوەکان ئەلفرێد میلنەر پێکهێنا.

بۆ بەرپەرچدانەوەی کاری ئەم لیژنەیە کڵپەی شۆڕش جارێکی تر هەڵگیرسایەوە، هێزەکانی ئینگلیز دەستیان کردەوە لە جەماوەر، ژمارەیەك شەهید و بریندار بوون، لە (٧ کانونی یەکەمی ١٩١٩ ز) لەگەڵ گەیشتنی

لیژنەکە ڕێپێوان تەشەنەی سەند و قوتابیان مانیان گرت و بازرگان و پارێزەرانیش لەگەڵیان.

لەڕوویەڕووبونەوەی یەکێك لە ڕێپێوانەکاندا سوپای ئینگلیز هەڵی کوتایە سەر حەرەمی زانکۆی ئەزهەر و بێ حورمەتی بەرامبەر مزگەوت کرد و دەستیان کردە ترساندن و لێدانی ئەوانەی لەوێدا بوون.

دوای دوو ساڵ لەدانوستان و هێنان و بردن و فرتوفێڵ کۆتایی بەدەسەڵاتی بەریتانیا هێنرا و سەربەخۆیی میسر ڕاگەیەنرا و ناونرا: ڕاگەیاندنی شوباتی (١٩٢٢ ز).

دەقی ڕاگەیەنراوەکە ئەمە بوو، کە نوێنەرایەتی بەریتانیا بۆ میسر کۆتایی دێت و میسر دەبێتە وڵاتێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەریی، بەڵام بەریتانیا چوار خاڵی بۆ خۆی دیاری کردبوو، کە بەپێی ئەو چوار خاڵە گۆڕانێکی ئەوتۆ رووی نەدا و وڵات هەر داگیر کراو بوو [٢].

## ٣-دەستوری ساڵی ١٩٢٣ ز:

بەدوای ڕاگەیاندنی شوباتی (١٩٢٢ ز) دا میسر چەند هەنگاوێکی بەرەو سەربەخۆیی نا. شا **فؤاد** لە١٥ ئاداری (١٩٢٢ ز) دا پاشایەتی خۆی بەسەر میسردا ڕاگەیاند و دوای ململانێیەکی سەخت و درێژ لەنێوان گەل و کۆشکدا **شا فؤاد** لە (١٩) نیسانی (١٩٢٣ ز) دەستوری ڕاگەیاند و ئەو دەستورە کاری پێکرا، هەتا شۆڕشی (٢٣) تەمموزی ساڵی (١٩٥٢ ز) کۆتایی پێهێنا[٣].

---

(٢) ئەو چوار خاڵەش بریتی بوون لە :

١- دابینکردنی هاتوچۆی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لەمیسر. ٢- بەرگری کردن لە میسر بەرامبەرهەر دەستدرێژییەك. ٣- پارێزگاری بەرژەوەندی دەوڵەتانی بیانی و کەمایەتیەکان. ٤- پرسی سودان.

(٣) أوراق من تأريخ الإخوان المسلمين، جمعة أمين /٤٦/١.

- النظام الدستوري المصري. د.مصطفى أبوزيد فهمي ص ٥٢.





مەلیك فوئاد

## ٤-ململانێی نێوان خوازیارانی خەلافەت و نیشتمانیانی میسری:

دوای وەلانانی سوڵتان عبدالحمید بەدەستی (**إتحاد و ترقي**) لەساڵی (١٩٠٩ ز) ئەڵقەکانی رماندنی خەلافەت بەدەستی (**مصطفى كمال**) یەك لەدوای یەك کرانەوە، تا لە ئاداری (١٩٢٤ ز) کۆتایی بەخەلافەتی ئیسلامیی هێنرا و تورکیای کردە دەوڵەتێکی عەلمانی و یاسای رۆژئاوایی لەوڵاتدا سەپاند و کەوتە بەرهەڵستی ئیسلام و دیاردەکانی.

هەرچەندە جیهانی ئیسلامیی پەرت و لاواز بوو زۆربەی وڵاتانی لەژێر چەپۆکی داگیرکاراندا بوو، بەڵام ئیعلانی کۆتایی هێنان بە خەلافەت رووداوێکی کاریگەر بوو. .. چونکە بۆ یەکەمین جار دوای چواردە سەدە جیهانی ئیسلامیی بێ خەلیفە کرا، بۆیە دوای چوار رۆژ لە کۆتایی هێنان بەخەلافەت شانزە زانای ئەزهەر بەیاننامەیەکیان واژوو کرد و تیایدا بڕیارەکەی ئەتاتۆرکیان بە پووچەڵ

- تطور الحركة الوطنية في مصر ١٩١٨ -١٩٣٦، عبدالعظيم رمضان ص ٣٦٥.
- في اعقاب الثورة المصرية، عبدالرحمن الرافعي ص ٤٣.

داناو بانگەشەیان کرد کە کۆنگرەیەکی بەپەلە ببەسترێت، بۆ تاوتوێکردنی ئەو بڕیارە ناڕەوایە و ئاسەوارەکانی.



الشريف حسين

لەحیجاز (**شريف حسين**) لە (١٤) ئاداری (١٩٢٤ ز) ئاهەنگێکی سازدا، لەو ئاهەنگەدا بەیعەتی بوون بەخەلیفەی موسوڵمانانی پێدرا.

هەروەها هەندێك (**شا فؤاد**)یان پاڵاوتبوو تاببێتە خەلیفەی موسوڵمانان و شێخ (**يوسف الدجوى**) سەرۆکی لیژنەی راپەڕینی ئیسلامیی لیژنەیەکی بۆ خەلیفایەتی پێکهێنا و داوای کردبوو لە (**شا فؤاد**) کە کۆنگرەی خەلافەت لە قاهیرە ببەسترێت(٤).

لەو ماوەیەدا میسر بوو بوە چەقی ململانێی نێوان دوو لایەن، یاخود دوو بەرە: لایەنێك بەرگری لە خەلافەت دەکرد و بۆ یەکخستنی موسوڵمانان بە پێویستی دەزانی، پێشەنگی ئەمانە شێخ (**مصطفى صبري**) بوو، کە لەسەردەمی سوڵتان (**عبدالحميد**) دا نازناوی (**شيخ الإسلام**)ی پێدرابوو، کە دوای کودەتاکەی (**مصطفى كمال**) ناچار بوو تورکیا بەجێ بهێڵێت و پەنا بەرێت بۆ میسر.



مەلیك فاروق

(٤) الإتجاهات الوطنية في الدب المعاصر– محمد محمد حسين / ص٤٧.



بەرەی دووەم خەریکی کاری نیشتیمانی و ناوچەیی بوون و دەیانویست میسر لەولاّتانی تری جیهانی ئیسلامیی دابڕن. ئەمانە بەیارمەتی داگیرکار بانگەشەیان بۆ نەتەوەگەری میسر دەکرد و دروشمیان (ئایین بۆ خوا نیشتیمان بۆ هەمووان) بوو.

لەوماوەیەدا چەند پەڕاوێك بڵاوکرانەوە کەبەرهەڵستی ئایینی ئیسلامیان دەکرد بەگشتی و بیرۆکەی خەلافەت بەتایبەتی، لەوانە پەڕاوی (**الإسلام و أصول الحكم**) کە (**علي عبدالرزاق**) لەساڵی (١٩٢٥ ز) دا نوسیبووی باسی لە بیرۆکەی روخاندنی خەلافەت دەکرد. ، وە ئەوەی رەت دەکردەوە کە خەلافەت و دادوەری و پێگەکانی فەرمانڕەوایی و مەڵبەندی حوکمڕانی لە ئاییندا هەبن. ئەو چەمکانەی وا پێناسە دەکرد کە کارانێکی دنیایی پەتین و ئایین کاری پێیانەوە نیە، بەڕای ئەو خەلافەت نەگبەتییەك بوو بەسەر ئیسلام و موسوڵمانانەوە.



شێخ علی عبدالرازق



شێخ محمد الخضر حسين

لەبەر ئەوەی دانەری ئەم پەراوە لەزانایانی ئەزهەر بوو، گروپی گەورە زانایانی ئەزهەر لە (١٢) ئابی (١٩٢٥ ز) دا بڕیاری وەدەرنانیان لەریزی زانایانی ئەزهەر بۆ دەرکرد و لەکارەکەی کە دادوەری شەرعی بوو دووریان خستەوە[٥].

لەساڵی (١٩٢٦ ز) دوو زانای گەورەی ئەزهەر دوو پەڕاویان دەرکرد، بەرپەرچی شێخ (**علی عبدالرزاق**)یان دایەوە. ئەو دوو زانایە یەکەمیان شێخ(**محمد نجیب المطیعي**) موفتی میسر بوو کە پەڕاوی (**حقیقة الإسلام و أصول الحکم**) ی نوسیبوو و ئەوی تریان شێخ (**محمد خضر حسین**) بوو کە پەڕاوی (**نقض کتاب الإسلام و أصول الحکم**) ی نوسیبوو، هەروەها شێخ (**محمد رشید رضا**) پەڕاوی (**الخلافة أو الإمامة العظمی**) ی دەرکرد و (**شیخ الإسلام مصطفی صبري**) یش پەڕاوی (**النکیر علی منکري النعمة من الدین و الخلافة و الأمة**)ی دەرکرد.

لەو ماوەیەدا ئەو پەڕاوەی کە دەنگۆی گەورەی نایەوە چ لە رۆژنامەکان و چ لە ئەنجومەنی نوێنەراندا، پەڕاوێکی (**طه حسین**) بوو، لەسەر شیعری دەورەی نەفامی کە لەساڵی (١٩٢٦ ز) دەرکەوت و چیرۆکەکانی قورئانی دەربارەی ئیبراهیم و ئیسماعیل بەئەفسانە دادەنا و دەیوت بۆ پاڵپشتی ئیسلام لەبەرامبەر بت پەرستییدا هەڵبەستراون[٦].

لەوقۆناغە سەختەی مێژووی ئیسلامییدا چەند جوڵانەوەیەکی جۆراوجۆر دەرکەوتن، هەندێك فەرمانڕەوا چاویان بڕیبووە وەرگرتنی خەلافەت و هەندێك سەرکردەی کلاسیکیش خۆیان بەمیراتگری خەلافەت دەزانی و پارتانێکی نەتەوەییش بانگەشەیان بۆ لیبراڵی لەسەر مۆدیلی تورکیا دەکرد، مامۆستا

(٥) سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٧

(٦) سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٨٠.



حەسەن بەنناش لەگەڵ چەند برایەکیدا هەستا بەدامەزراندنی (کۆمەڵی برایانی موسوڵمان)، وەکو بانگەوازێکی ئیسلامیی هەمەلایەن، لە ئامانجەکانی هێنانەوە کایەی دەوڵەتداری بوو بۆ ئوممەتی ئیسلامیی، بە رزگارکردنی خاك و زیندووکردنەوەی شکۆمەندی و نزیك خستنەوەی کەلتور و کۆکردنەوەی دەنگی. ... تاکو ئەمانە هەموویان ببنە بناغەی هێنانەوەی خەلافەتی لە دەستچوو و بەدیهێنانی ئەو یەکیەتییەی کە مەبەستە(٧).



شێخ مصطفى صبري



طه حسين

ئیمام بەننا دەڵێت: زەمانێکی سەخت هاتبوو بەسەر ئیسلام و موسوڵماناندا، نەهامەتییەکان یەك لەدوای یەك بوون، دوژمنان کاریان لەسەر شاردنەوەی جوانییەکانی ئیسلام و دوورخستنەوەی فەرمانڕەواکانی و لاوازکردنی سەربازەکانی و سەرگەردان کردنی رۆڵەکانی و، رووپۆشی فەرمان و ئامۆژگارەیەکانیان دەکرد. . جارێك بەوەی ناتەواوە و جارێکی تر بەوەی زیادە و جارێکی تریش بەلێکدانەوەی هەڵە بۆیان. ئەوەش ئەم هەلەی بۆ سازاندبوون تیاچوونی دەسەڵاتی سیاسی و پەرتبوونی ئیمپراتۆریەت و نەمانی سوپا و ژێر چەپۆك بوونی گەلانی ئوممەت بوو لەلایەن خوانەناسەکان و داگیرکەرانەوە(٨).

(٧) رسالة التعاليم ركن العمل للإمام حسن البنا.

(٨) رسالة الى الشباب للإمام حسن البنا.

## دووم: بارودۆخی كۆمەڵایەتی میسر:

**١-لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا یاسای چینایەتی باڵی بەسەر كۆمەڵگەی میسریدا كێشابوو، هەموو بەدەست ئەو یاسایە دەیانناڵاند:**

-چینی سەرەوە كە (٠,٥٪)ی خەڵك بوون خاوەنی (٣٥٪) زەوی وزار و دامودەزگا دارایی و ئابووری و پیشەسازیەكان بوون.

-چینی مامناوەند كە بازرگانە ناوەنجییەكان و فەرمانبەران و زۆرێك لە رۆشنبیران بوون، ئەمانە گرنگیان بە پرسە سیاسیەكان دەدا، زۆربەیان نەوەی خێزانە هەژارەكان بوون، هەوڵیان بۆ خۆڕزگاركردن لە چنگی نەزانین و هەژاری دەدا.

-چینی خوارەوەش كە زۆربەی هەرە زۆری خەڵك بوون، لە حاڵیان مەپرسە چەندە پەست و سەخت بوو.

**٢-بزوتنەوە تەبشیرییەكان:**

دەوڵەتە داگیركەرەكان دوای باڵادەست بوونیان بەسەر وڵاتانی ئیسلامییدا، دەستیان دایە هێرشی تەبشیری گەورە، كە قەشە زوەیمیری پرۆستانتی، گەورەی شاندی نێرراوی تەبشیری عەرەبی لەبەحرەین، دیارترین پیلانگێڕیان بوو... ئەو بانگەشەی بۆ بەستنی كۆنگرەیەكی تەبشیری جیهانی دەكرد، كەیەكەم كۆنگرەیان لەساڵی (١٩٠٦ ز) لەقاهیرە و دووەم كۆنگرەشیان لەقودس لەساڵی (١٩٢٩ ز) بەسترا.


صموئیل زویمر

ئەم قەشەیە دەیوت: ئەوە مەبەست نیە موسوڵمانەکان ببنە گاور، بەڵکو مەبەستی گرنگ ئەوەیە موسوڵمانان لەچاکی و سوودمەندیی ئایینەکەیان بکەونە گومان [٩].

ئەم تەبشیرییانە لە میسر بۆ چالاکیەکانیان پشتیان بە کۆمەکی ئینگلیز و مۆڵەتی شا فؤاد و کاربەدەستان بەستبوو.

بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان دەستی کارایان هەبوو لە رووبەڕوو بونەوەی بزوتنەوە تەبشیرییەکاندا و هەمیشە هەڵوێستی بەرگرییان دەگرت نەك هێرش کردن، لەو بوارەدا دوو جۆر پلانیان هەبوو:

یەکەمیان: تێگەیاندنی خەڵك لەمەبەست و مەرامی تەبشیرییەکان و دووەمیان: پشت بەستن بەبەڵگەی زانستی لەبەرامبەر ئیدیعاکانی ئەوانەوە [١٠].

**٣-ئازادی ئافرەت:**

بانگەشەی ئازادی ئافرەت بەپەڕاوی (**تحرير المرأة**) لە لایەن (**قاسم أمين**)ەوە لەساڵی (١٨٩٩ ز)دا دەستی پێکرد، و پاشان پەڕاوی (**المرأة الجديدة**) کە لەساڵی (١٩٠٠ ز) بە چاپی گەیاند.

کار هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو ئافرەت بەرگی فڕێدا و لەسەر کەناری دەریا بەڕووتی خۆی نواند. و ئەم کارەش زۆر بەخێرایی پەرەی سەند، ئەوانەی یارمەتی ئەم پەرەسەندنەی دەدا چینی فەرمانڕەوا وخاوەن موڵکە گەورەکان بوون، کە بەپەنجەی داگیرکەران هەڵدەسوڕان و لە کۆتاییشدا دەوڵەت بەفەرمی و یاسایی مۆڵەتی بەکاری لەشفرۆشی دا.

(٩) الغارة على العالم الإسلامي. أ.ل.شاتلية ص ٢٨.
(١٠) مذكرات الدعوة و الداعية، للإمام حسن البنا، ص ١٧١.

### ٤-دارمانی ئاستی رەوشت و دینداری:

شەپۆلی ئەم دارمانە بەناوی راو بیری ئازادەوە لە میسر زۆر بەهێز بوو، پاشان بەناوی ئازادی تاکە کەسییەوە خۆی کوتا بۆ زۆربەی نەریت و رەوشت و پیشەکان. .. شانۆ و سینەما و ئێزگە رۆڵی برەوپێدانیان دەبینی، تیمەکانی شانۆ لە شامەوە دەهاتن لە میسر دەمانەوە، لەم بوارەدا ئافرەت بەتەواوی بەکاردەهێنرا و خۆی بەنرخێکی هەرزان دەفرۆشت !!

هاوکات لەگەڵ بانگەشەی ئازادی ئافرەتدا، ئافرەت بۆ لاسایی کردنەوەی ئافرەتانی رۆژئاوا هاندەدران، چ لەڕووی خۆڕووتکردنەوەو چ لەڕووی تێکەڵاوییەوە...ئەمانە بوونە شەپۆلێکی سەختی بێ باوەڕی و بێ ئابڕوویی و شکاندنی هەموو سنوورەکان، رووداوەکان و بارودۆخەکەش یاریدەدەری بوون[١١].

## سێیەم:رەوتی ئیسلامیی لەمیسر:


جەمالەدینی ئەفغانی

بانگەوازی برایانی موسوڵمان ئەنجامی سروشتی ئەو بارودۆخە تایبەتییە بوو کە بەسەر میسردا (وەکو دەوڵەتێکی سەنتەر لە جیهانی ئیسلامییدا) هات، لەکاتێکدا کە داگیرکاری بەریتانی بەسەر سنگییەو پارتە سیاسییەکان لە دۆڵێك و گەلیش لە دۆڵێکی تردا بوو، کۆشکیش هەمیشە لە ریزی نوێنەری بڵندی بەریتانیدا بوو، داگیرکاری

(١١) مذكرات الدعوة و الداعية للإمام حسن البنا. ص ٤٧.
عمر التلمساني شاهداً على العصر / ابراهيم قاعود، ص ١٥.

**هزری** و کەلتوریش **هە**وڵی داڕنینی ئیسلامی دەدا، نەك **هە**ر لەواقیعدا بەڵکو **هە**وڵی دەدا لەنێو ناخ و دڵی میسرییەکاندا ریشە کێشی بکات و لەسوچی مزگەوتەکاندا قەتیسی بکات.

جێی خۆیەتی و ئینساف بەکار**هێ**نانە پێشەنگیی و سەرقافڵەیی حەسەن بەننا ئەڵقەیەك بێت لە ئەڵقەکانی بووژاندنەوەی ئیسلامیی **ها**وچەرخ و بەقۆناغێکی تایبەت لە ڕووی چەندێتی و چۆنیەتیەوە دابنرێت، کەلەئەنجامی درێژبوونەوەو گەشەسەندنی **هە**وڵ و خەباتێکی بێ وچان، کە کەڵە پیاوانی **ها**وچەرخی وەکو (**جمال الدين الأفغاني**) کە بەردی بناغەیان بۆ دانا و، مامۆستا (**محمد عبده**) ئەندازیاری تازەکردنەوەی **هزری** بوو و لە ڕێگای شێخ (**محمد رشيد رضا**) وە بەسپاردە گەیشتە دەستی حەسەن بەننا و ئەویش گەیاندییە ئەو شێوازە **ها**وچەرخییەی کە ئێستا دەبینریت [١٢].

ئیمام بەننا لەکاتی لاوازی رەوتی چاکسازیی ئیسلامییدا پێگەیشت، بۆیە **ها**ت و **هۆ**کارەکانی ئەو لاوازییەی دۆزییەوە و، سوودی لەخاڵە بە**هێ**زەکان وەرگرت و، دەستی دایە کاری ئیسلامیی لەسەر شێوازی (**جمال الدين الافغاني**) و لەگەڵ بە**هە**ندگرتنی کاری پەروەردە و لەسەر شێوازی (**شێخ محمد عبده**).

کەواتە ئاڵای تازەکردنەوەی لە چاکسازان و بانگخوازانی پێش خۆی وەرگرت و خۆیشی ئەوەی کە لەبانگەوازی برایاندا **هە**یە و لەبانگەوازەکانی تردا نیە بۆی زیاد کرد و بوو بە ئەو خشتەی کەخوای گەورە قەڵای **هزری** ئیسلامیی و کاری ئیسلامیی پێ پتەوکرد.

راوێژکار (**طارق البشري**) دەڵێت: (**جمال الدين**) بیرۆکەی خەباتی ئیسلامیی داڕشت و(**محمد عبده**)نوێکاری لەفیق**ە** و تەفسیردا بۆ کردو(**محمد**

---

(١٢) خمسون عاماً على استشهاد حسن البنا. د.محمدعمارة / المجتمع الكويتية ١٩٩٩/٢/٩.

**رشید رضا**) نوێکردنەوەی لەگەڵ سەلەفییەت وکارلێکی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکاندا بەیەکەوە گرێدا و حەسەن بەنناش گشتگیریی ئیسلام و پەیوەندیی بەهێزی نێوان بیروباوەڕ و شەریعەت و سیاسەتی پێ زیاد کرد، پەیوەندی نێوان هزر و کاری سیاسی ڕێکخست و فیقهی ئەزهەر و سۆزی سۆفیەتی و نیشتیمانویستی پارتە نیشتیمانییەکانی پێکەوە ئاوێتە کرد و گرێیدان[١٣].

کەس لەوە لاری نیە کە بانگەوازی برایان و بزوتنەوەکەیان لەناوەوەو دەرەوەی جیهانی ئیسلامییدا رای گشتییان بەخۆیانەوە خەریك کرد، بەهۆی ئەوەوە کە تێگەیشتنێکی سیاسی و کارایان بۆ ئیسلام پێشکەش کرد، کە ئیسلام ئایین و دەوڵەت و بیروباوەڕ و یاسای ژیان و شەریعەت و ژیارە و قسەکانیان کردە کار. بەجەنگان لەگەڵ ئینگلیز لەکەناڵی سوێس و لەگەڵ جولەکە لە فەلەستین فەرزی جیهادیان زیندووکردەوە، هەروەها دەستیان دایە کاری عەمەلی لەبواری چاکسازیی کۆمەڵایەتیدا بەکردنەوەی خوێندنگا و نەخۆشخانە و کۆمپانیای خزمەتگوزاری و، لەبواری پەروەردەدا نەوەیەکی نوێیان لە زۆر لەوڵاتانی ئیسلامییدا پەروەردە کرد بەئامانجەکانی بانگەوازەوە دڵبەند ودڵدامەزراو و دڵنیا بوون[١٤].

جا لەبەر بارودۆخی ناوەکی و دەرەکی، کە دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامی روبەڕووی بوونەوە.. بزوتنەوەی ئازادیخوازیی لە زۆربەی ولاتانی ئیسلامییدا بۆ وەدەرنانی داگیرکەران هەڵسان و لەگەڵ ئەوانیشدا بزوتنەوە

(١٣) الملامح العامّة للفكر السياسي الإسلامي في التأريخ المعاصر، طارق البشري ص ١٦٨.
(١٤) الإخوان المسلمون – محمد فريد عبدالخالق ص ١٠.



ئیسلامییەکانیش هەڵسان و گرنگترینی ئەو بزوتنەوانەش برایانی موسوڵمان بوو، کە پێشەوا حەسەن بەننا لەساڵی (١٩٢٨ ز) لە میسر دایمەزراند.

# بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان. .

## بانگەوازێك لە كرۆك و ناخی ئیسلامەوە:

بانگەوازی برایان لەیەکەم رۆژەوە بانگەوازێکی دیار و رۆشن بوو، بانگەوازێك بوو لە ناخ و کرۆکی ئیسلام خۆیەوە هەڵقوڵابوو، پشتی بەو دەبەست و ئامانجیشی هەر ئەو بوو[١٥]. ..دروشمەکانی ئیسلامیی بوون (خوا مەبەستمانە، پێغەمبەر ﷺ سەرمەشقمانە، گەورەیی و سوپاسگوزاری هەر بۆ خوایە) (**الله غایتنا و الرسول قدوتنا – الله اکبر و لله الحمد**).

خەڵکی دەپرسن: ئەی برایان ئێمە هێشتا لێتان تێنەگەیشتوین!! ئێوە چین؟ لەخۆتان تێمان بگەیەنن و ناونیشانێك بۆ خۆتان دابنێن تا بەهۆیەوە بتانناسین.

شایانی باسە ئیمام بەننا خۆی وەڵام دەداتەوە و دەچرکێنی بەگوێی زەمان و زەمیندا و دەڵێت: ئێمە بانگخوازی قورئانین و گشت لایەنەین، ئێمە رێبازێکی سۆفیەتی و کۆمەڵێکی خێرخوازی و دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی و پارتێکی سیاسی خاوێنین.

دوای ئەمەش هێشتا هەر دەپرسن: هێشتا هەر رۆشن نین، پێیان بڵێن: هۆی ئەوەیە چرای رووناکیتان بەدەستەوە نیە، کەلەبەر رۆشناییدا ئێمە ببینن، ئەوەی ئێمە بانگەشەی بۆ دەکەین ئیسلامە. . ئەوەی لێی تێبگات ئێمە وەك

(١٥) الإخوان المسلمون٧٠ عاماً في الدعوة و التربية و الجهاد، يوسف القرضاوي ص ٢٤–٢٥.

خودی خۆی دەناسێت، کەواتە لە ئیسلام تێبگەن، دوای ئەوەبەویستی خۆتان هەرچی دەربارەمان دەڵێن بیلێن(١٦).

لەپێگەیەکی تردا ئیمام بەننا پێناسەی بانگەوازەکەی دەکات و دەڵێت:

ئەی برایانی موسوڵمان. . ئەی خەڵکان هەمووتان.




دروشمی ئیخوان

دڵنیابن ئێمە پارتێکی سیاسی نین و بەس، هەرچەندە سیاسەتکردن لەسەر بناغەی ئیسلام لە کرۆکی بیرو باوەڕمانەوەیە.

ئێمە کۆمەڵێکی خێرخوازی و چاکسازی نین و بەس، هەرچەندە کاری چاك و چاکسازی گەورەترین مەبەستمانە.

ئێمە تیمێکی وەرزشی نین و بەس، هەرچەندە وەرزشی جەستەیی و گیانی لە هۆکارە گرنگەکانی کارمانە.

بەڵام ئەی خەڵکینە، ئێمە هەڵگری باوەڕ و هزرێکین و پیادەکاری یاسا و پرۆگرامێکین پەیوەستە بەهەموو جێگایەکەوە و بەستراوە بە هەموو رەگەزێکەوە و سنووری جوگرافیا نایوەستێنێت و تا ئەو رۆژەی ئەم زەوییە و

(١٦) خطاب الإمام حسن البنّا في اجتماع رؤساء المناطق في ١٩٤٥/٩/٨.

دانیشتوانی مابن کۆتایی پێ نایەت. چونکە ئەوە یاسای خوای پەروەردگار و ڕێبازی پێغەمبەری پارێزەرﷺ..

ئەی خەڵکینە –بەبێ فەخر– ئێمە لەسەر ڕێگای هاوەڵانی پێغەمبەری خواین و لەدوای خۆی هەڵگرانی ئاڵاکەی ئەوین. بەرزکەرەوەی ئەو ئاڵایەین هاوەڵان بەرزیان کردەوە و بڵاوکەرەوەی بانگەوازەکەیانین، وەکو ئەوان قورئان لەبەر دەکەین و دەیپارێزین.

مژدە بەخشی سەرکەوتنی بانگەوازین، وەکو ئەوان مژدە بەخش و ڕەحمەت و بەزەیی خوا بوون بۆ هەمووان.. خوای گەورەش دەفەرموێت ﴿**ولتعلمن نبأه بعد حين**﴾ سورەتی الحجر/٨٨. واتە: پاش ماوەیەك هەواڵی ڕاستەقینەی دەزانن[١٧].

## بزوتنەوەی ئیسلامیی ڕێکخراو:

کۆمەڵی برایانی موسوڵمان (**الإخوان المسلمون**) ناوەکەیان پێناسەیە. بزوتنەوەیەکی ئیسلامیین. بزوتنەوەش پێش هەموو شتێك کارکردنە، کارکردنێکی بەردەوام و نەپچڕاو، تەنیا قسە نیە بوترێت، تەنیا وتار نیە بخوێنرێتەوە و تەنیا پەڕاونیە بنووسرێت. هەرچەندە هەرکام لەمانە پێویستن، بەڵام هەریەکەیان بەشێکی کەمی بزوتنەوەکەن، نەك هەمووی. . چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿**وقُلْ اعملُوا فَسيرى الله عملكُم ورسولُه والْمؤمنونَ**﴾ **سورەتی التوبة**/ ١٠٥، واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ کاربکەن خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی و باوەڕدارانیش کارەکانتان و ئاسەوارەکانیشیان دەبیننەوە. ..

(١٧) الإخوان المسلمون تحت راية القرآن / حسن البنّا ص ١٩٧ مجموعة الرسائل ص ٨٨.

بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان کارێکی جەماوەرییە لەسەر بناغەیە بێداربوونەوەی عەقڵ و قەناعەتی مرۆڤ وەستاوە، لەسەر باوەڕ بوون بە ئیسلام بۆ رازیکردنی پەروەردگار، بەبێ مەبەستێکی دنیایی ئەنجام دەدرێت.

بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان کارێکی رێکخراوی بەکۆمەڵە, رێکخستنیشی لەسەرکردایەتیەکی بەرپرس و قەواعیدێکی پێکەوە بەستراو و، چەمکانێکی روون پێکدێت، کە پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی و قەواعید دیاری دەکات، و بڕیارەکانی سەرکردایەتی شورایەکی هەڵبژێررا و بەگوێکراو دەیدات و قەواعیدیش لەسەر تێگەیشتن و بەرچاو روونی گوێڕایەڵ دەبێت.

## تازەکردنەوەی کاری ئیسلامیی:

گرنگی بزوتنەوەی ئیسلامیی تازەکردنەوەی شێوازی کاری ئیسلامییە، بۆ ئەمەیە کە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: (**إنّ الله يبعث لهذه الأمّة على رأس كلّ مائة سنة من يجدّد لها دينها**) واتە: خوای گەورە لەسەرەتای هەر سەد ساڵێکدا کەسێك بۆ ئەم ئوممەتە دەنێرێت، کە ئاییینەکەی بۆ تازە بکاتەوە.

تازەکردنەوەی ئایین واتە: تازەکردنەوەی تێگەیشتن لێی و تازەکردنەوەی باوەڕ پێی و، تازەکردنەوەی چۆنێتی کارکردن بە فەرمانەکانی و، چۆنیەتی رەفتار بە ئاکارەکانی و تازەکرینەوەی چۆنیەتی بانگەوازکردن بۆی و خەباتکردن لە پێناویدا.

ئەوەی لەم سەدەیەدا رۆڵی گەورەی ئەم تازەکردنەوەی ئەنجامداوە برایانی موسوڵمان بوون.

* پێگەی تازەکردنەوەی ئیمام بەننا لەبەرامبەر ژیارەکانی ترەوە مامناوەندێتی بوو. کەنارگیری و بەسەر خۆدا داخرانی لاپەسەند نەبوو،



هەروەکو شوێنکەوتنی کوێرانە و لاسایی کردنەوەشی لا ناپەسەند بوو، هەڵوێستی رەخنەگرانە بوو، جیاوازی دەکرد لەنێوان ئەوەی هاویەشی گشتی مرۆڤایەتییە لەگەڵ ئەوەی کە تایبەتمەندیی و باوەڕیی و فەلسەفی و کەلتورییە.

* هەڵوێستی کرانەوەیەکی ژیرانە بوو بەڕووی دنیادا، بێ ئەوەی شوناسی خۆ ون بکرێت، یان کەمتەرخەمی بەرامبەر گیانی ژیاریی خۆ بکرێت. بەمە لەخەڵکی تر جیادەکرێنەوە. لەڕووبەڕووبونەوەی ئەو دواکەوتن و جێماوییەی ئوممەتی ئیسلامیی تێی کەتبوو، ئیمام بەننا بانگەشەی تازەکردنەوەی دەکرد و روون و راشکاونە دەیگوت: بانگەوازەکەی یەکێکە لەبانگەوازەکانی تازەکردنەوە بۆ ژیانی گەلان و ئوممەتی ئیسلامیی.

* لەتێڕوانینی رەخنەییدا بۆ فەرهەنگ و مێژوو، داوای دەکرد کە جیاکاری بکرێت لەنێوان ئەوەی نەگۆڕی ئایینە، لەگەڵ ئەوەی بەرهەمی هزری مرۆڤ و مومارەسە کردنیەتی، ئەمە مانای ئەوەیە لە بواری جێبەجێکردنی پرۆگرامی تازەکردنەوەدا بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە گرنگ و خاوێن و پارێزراوەکان لەقورئان و سوننەتی راست و راشکاو، کە ئەوانە پیرۆز و سەپاون. لەبەرامبەرەوە هزری ئیسلامیی و بۆ ماوەی ژیاریی و ئەزموونەکانی مێژوو هیچیان پیرۆز و سەپاونین و بۆیە وەکو گەنجینەیەك دوور لە دەمارگیری و سەپاندن سوودیان لێ وەردەگرین. ..

دەربارەی ئەم پرۆگرامی تازەکردنەوەیە ئیمام بەننا خۆی دەڵێت: بناغە و سەرچاوەی چەمکە ئیسلامییەکان قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، ئەو دوانەی هەرکەس پێیانەوە پابەند بێت هەرگیز رێی لێ وون نابێت، زۆرێکیش لەو ڕاو بۆچوون و زانیاریانەی پەیوەندیان بەهزری ئیسلامییەوە هەیە

بەرەنگی ئەو چەرخە رەنگ کراون کە تێیدا هاتوونەتە بوون و بۆ ئەو گەلانە دەستدەدەن کە لە نێوانیاندا لە دایك بوون، بۆیە پێویستە یاسا ورێسا ئیسلامییەکان بۆ ئەمڕۆ لەسەرچاوە زولاڵە بێگەردەکەوە هەلگۆزرێت، پێویستە لە ئیسلام وا تێبگەین کە هاوەڵان و چاکانی پێشین لێی تێدەگەیشتن.لەو سنوورەدا بوەستین کە خوا و پێغەمبەر ﷺ بۆیان دیاری کردووین و خۆمان نەبەستینەوە بە قەید و بەندێکەوە کە خوای نەیویستوەو خۆمانی پێوە پابەند بکەین و ناکرێت ئەم سەردەمە بە رەنگی سەردەمێکی تر رەنگ بکەین کە لەگەڵی نەگونجاوە، چونکە ئیسلام ئایینی خوایە بۆ مرۆڤ لەهەموو سەردەمێکدا.

ئێمە کاتێك لەم بەرنامەی تازەکردنەوەی حەسەن بەننا تێدەفکرین، سەرنجی وتەکانی پێشەوەی دەدەین، داڕشتنەکەی (**محمد عبده**)مان بۆ هەمان بەرنامە بیردەکەوێتەوە کە دەیوت: من بانگەشە بۆ ئازادکرنی هزر لە کۆت و بەندی لاسایی کردنەوە و بۆ تێگەیشتن لە ئایین لەسەر رەویەی پێشینی ئەم ئوممەتە دەکەم، بەمەبەستی بەدەستیهێنانی شارەزایی ئایینی لەسەرچاوەی یەکەمیەوە.

بەم شێوەیە گەڕانەوە بۆ پێشین، بۆ ئازادکردنی هزر و بۆ تازەکردنەوەی تێگەیشتن لە ئایین بەدوور لە چەقبەستوویی و لاسایی کردنەوە هەر لێرەشەوە تازەکردنەوەی ئیسلامیی لە نوێگەرایی –بەمانا رۆژئاواییەکەی– جیادەبێتەوە، هەروەکو پشت لەچەقبەستویی و لاسایی کردنەوەش دەکات.

چەقبەستوویی و لاسایی کردنەوە، بەرهەمەکانی هزری ئیسلامییان بەشێوەیك کردۆتە سەرچاوە، خەریکە رێگرمان بن لەسەرچاوە خاوێن و بنەڕەتییەکەی ئیسلام، کارێکی کردووە کە راگەیاندنی قورئانی و

روونکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو راگەیاندنە نەگاتە گوێی خەڵکی ئەم چەرخە. ..

پاشان نوێگەرایی -بەمانا رۆژئاواییەکەی- دەیەوێت دابڕانێکی گەورەی مەعریفی لە نێوان خەڵك و سەرمایەی مەعریفی بەرەکانی پێشدا دروست بکات، بەتایبەتی لەگەڵ مەعریفی ئاییندا. بەوەش بۆشاییەکی گەورە دروست دەکات، نەسەرمایە مەعریفییە کە دەهێڵێت ونە دەشگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی سەرەتا.

حەسەن بەننا بۆ ئەو خواستە تازەکردنەوەییەی کە هەیبوو رەخنە گرانە دەوەستا مێژووی ژیاری دەوڵەتانی ئیسلامیی پێشووی هەڵدەسەنگاند و هۆکارەکانی لێك هەڵوەشاندنیانی شیدەکردەوە، کە هەڵوەشاندنەوەی ئەوان ئەو بۆشاییەی دروستکرد، دەوڵەتی نەتەوەیی نوێ لەسەر شێوازی رۆژئاوایی تێدا پێکبێت. حەسەن بەننا هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتانی ئیسلامیی لە مێژوودا بەمانە دانا:

١- ناکۆکی سیاسی و دەمارگیری و ململانێ لەسەر دەسەڵات و پێگە.

٢- ناکۆکییە ئایینی و مەزهەبییەکان.

٣- رۆچوون لە رابواردن و چێژبردندا.

٤- گواستنەوەی دەسەڵات بۆ کۆمەڵە کەسانێك کە بەشێوەیەکی دروست لە ئیسلام ئێنەگەیشتبوون و وەکو پێویست دڵیان بەنووری قورئان و مانا جوانەکانی رۆشن نەبووبوویەوە.

٥ - پشتگوێ خستنی زانستە کرداری و سروشتییەکان و کات و توانا فەوتاندن لە بابەتی تیۆری نەزۆرك و زانیاری بێ بەرهەمدا.

٦- بوغرابوونی سوڵتانەکان بەدەسەڵات و هێز و گوێنەدان بەگەشەی کۆمەڵایەتی گەلانی تر، کە پێشیان کەوتن و سەرەنجام لە پڕ دایان بەسەریاندا.
٧- خەڕۆبوونی خاوەن دەسەڵاتەکان بە ڕیابازی نەیارەکانیان و سەرسامبوون بەشێوازی ژیانیان و لاسایی کردنەوەیان لەو شتانەیاندا کە زیانیان هەبوو نەك سوود.

بەم ڕەخنەگرتنە پڕ لە ژیرییەوە وەکو (**د.محمد عمارە**) دەڵێت: حەسەن بەننا تەرازووی هەڵسەنگاندنی یاسای حوکمی ئیسلامیی لە مێژووی ئیسلامدا دایە دەست نەوەی نوێی موسوڵمانان(١٨).

## بزوتنەوەیەکی ئامانج دیار:

ئیمام بەننا دەڵێت:

١- تاکێکی موسوڵمانمان دەوێت کە لەبیرکردنەوە و باوەڕ و ڕەوشت و سۆزو کردار و ڕەفتاریدا موسوڵمان بێت.
٢- دوای ئەوە خێزانێکی موسوڵمانمان دەوێت، لەبەر ئەمە چ بایەخێك بەپیاو دەدەین بەژنیشی دەدەین و گرنگی بەمنداڵان دەدەین وەکو لاوان.
٣- پاش ئەوە، بەهەمان شێوە گەلێکی موسوڵمانمان دەوێت، بۆیە سوورین لەسەر ئەوەی بانگەوازی ئێمە بگاتە هەمو ماڵێك و، دەنگی ئێمە لە هەموو جێیەك ببیسترێ و بگاتە هەمووشوێنێکی ئاوەدان لەشار و دێهات و پەناگە وهەوارگەیەك.
٤-دوای ئەمانە: حکومەتێکی ئیسلامییمان دەوێت کە دەستی خەڵك بۆ شوێنکەوتنی ئایین و ژیان لەژێر ڕۆشنایی ئەودا بگرێت و، کاردەکەین بۆ

(١٨) دراسة عن التجديد عند الإمام البنّا/ د.محمد عمّارة بمناسبة ذكرى ١٠٠ عام لميلاده.



ناسینی دروستی یاسای ئیسلامیی کە خۆشبەختی ژیانی خەڵکی دەوێت و کاردەکەین کە حکومەت بەپێی ئەو یاسایە پێکبێت.

٥- پاش ئەوە، دەمانەوێت پارچەکانی نیشتیمانی ئیسلامیی کە سیاسەتی رۆژئاوا پارچە پارچەی کردوون یەکبخەینەوە و، بە لامانەوە ئەم دابەشکردنانە نادروستن و ئەو رێکەوتنە نێو دەوڵەتیانەی وڵاتانی ئیسلامیی کردووەتە چەندین دەوڵەتۆکەی لاواز هەڵەن و، دەربارەی ژێردەستەیی گەلانی موسوڵمان بێ دەنگ نابین.

٦- دوای ئەوە دەمانەوێت ئاڵای خواناسین بەسەر ئەو ناوچانەوە کە پێشتر بەئیسلام بەختەوەر بوون و دەنگی بانگی خواییان پێگەیشتبوو[19]

**هۆکارەکانیش روون و دیارن :**

١- بڵاوکردنەوەی هۆشیاری گشتی و دەرخستنی کەم و کوورِییەکانمان بەرامبەر فەرمانەکانی ئیسلام.

٢- دەرخستنی پێویستی گەرِانەوە بۆ ئیسلام بەپێی ئەو گرێ بەستە ئیمانییەی لەگەڵ خوادا هەمانە و، بەگوێرەی ئەوەی سەربەرزی نەتەوەییمان بۆ گەل و تاکمان دەوێت.

٣- روونکردنەوەی ئەوەی کە بەگەرِانەوە بۆ ئیسلام لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا، لەهەموو روویەکەوە دەستمان دەکەوێت، بەتایبەتی لەلایەنی رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەوە.

٤- روونکردنەوەی بەرپرسیارێتی دەسەڵاتداران و سەلماندنی بەڵگە لەسەریان کە بەرامبەر چاکسازیی ژیان بەرپرسن و پێشنیاری بەرنامەی چاکسازیی بۆیان.

---

(١٩) مجموعة الرسائل الى الشباب، حسن البنّا ص ١٧٨.

٥- هەڵبژاردنی کەسانی چاك و بەتوانا و ئامادە بۆ کارکردن و توانا بەکارهێنان و جوان ئەنجامدانی ئەرکەکانیان و، بۆ ئەو مەبەستە پەروەردەیەکی تێرو تەسەل بکرێن.

٦- قۆناغبەندنی لە هەنگاوەکاندا کە بەناساندن و شارەزاکردن دەستپێدەکات، پاشان بە پێکهێنان و گەشەسەندندا دەڕوات و ئەنجا بە جێ بەجێ کردن کۆتایی دێت.

پاشان ئیمام بەننا وتەکانی دەربارەی هۆکارەکان کۆتایی پێ دێنێت و دەڵێت:

**ئەی برایانی موسوڵمان !**

حەز و ئارەزووەکان بەتێڕوانینی عەقڵی ببەستنەوە و بەتیشکی عەقڵ گڕی سۆزەکان رووناك بکەنەوە و جڵەوی خەیاڵ و ئەندێشە بەراستی و حەقیقەت بگرن و راستییەکان لەژێر رووناکی جوانیی ئەندێشەدا بدۆزنەوە.

لارەسەنگ سەیری ژیان مەکەن، لەگەڵ یاساکانی بووندا تەریب بن و بۆ سوودی خۆتان لێیان بەهرەمەند بن و، هەوڵ بدەن ئاراستەکانیان بگۆڕن و بۆ زاڵبوون بەسەر هەندێکیاندا کۆمەك لەهەندێکیان وەربگرن و چاوەڕوانی کاتی سەرکەوتن بن. چونکە کاتی سەرکەوتن دوور نیە [٢٠].

## سەرکردەی دامەزرێنەر:

ئیمام حەسەن بەننا کە لەساڵی (١٩٢٨ ز) بزوتنەوەی برایانی موسوڵمانی دامەزراند (**د.ریتشارد میتشیل**) دانەری پەڕاوی (**الإخوان المسلمون**) دەربارەی دەدوێت و دەڵێت: کاتێك بەننا لە قاهیرە نیشتەجێ بوو کاتێکی پڕ

(٢٠) رسالة المؤتمر الخامس من مجموعة الرسائل، حسن البنا ص ١٢٧.



لە جۆشی جونبوشی سیاسی و هزری بوو، کە میسری بیستەکانی سەدەی بیستەمی گۆڕی، ئەویش بەچاوی گەنجێکی گوندنشینی دیندار دەیڕوانیە ئەو دیمەنە... ئەوەی لای ئەو گیروگرفتی کاریگەر بوو بەم شێوەیە دیاری کرد.

٨هەردوو پارتی وەفدو ئازادیخوازانی دەستووری سیاسی بەململانێی بەدەستێهانی دەسەڵاتی میسرەوە سەرقاڵ بوون و، گفتوگۆیەکی سیاسی توندو شپرزەییەکی دیار دوای شۆڕشی (١٩١٩ ز) سیمای کۆمەڵگەی میسری ئەو رۆژگارە بوو.

٨بانگەشە بۆ ئیلحادو ئازادی رەها دەوری جیهانی ئیسلامیی گرتبوو.

٨هێرشکردنە سەر نەریت و بیروباوەڕەکانی خەڵك. ئەم هێرشکردنە شۆڕشی کەمالیزم –کە خەلافەت و نووسینی عەرەبی وەدەرنا– پشتگیری دەکردو بە شێوازێکی پلاندار بزوتنەوەی (رزگاری هزری و کۆمەڵایەتی) پێی هەڵدەسا و پاشان رەوتە نائیسلامییەکانی تری میسر کە بۆچوونیان وابوو کۆمەڵگە نابێتە عەلمانی تاکو دژی ئایین شۆڕش نەکات و باو ونەریتە کۆمەڵایەتییەکان تێك نەشکێنێت.

٨جگە لەمانەش ئەو کۆڕ و ئاهەنگ و کۆمەڵە و پەڕاو و گۆڤار و رۆژنامانەی بازاڕی ئەو بیرو بۆچوونەیان گەرم دەکرد، تاکە ئامانجیان لاوازکردنی کاریگەریی ئایین بوو[٢١].

(٢١) الإخوان المسلمون، ریتشارد میتشیل، ص ٧١–٧٢.




ئیمام حەسەن بەننا

کاردانەوەی ئەم وێنەیە لەسەر حەسەن بەننا و تێڕوانینی بۆیان بەم شێویە بوو، کە خۆی باسی لێوە دەکات و دەڵێت: جگە لەخوا کەس نازانێت چەندین شەومان دەبردە سەر بە باسی بارودۆخی نالەباری ئوممەتەوە کە چۆن گەیشتۆتە ئەو حاڵەتە نەخوازراوە و هۆکارەکانمان شیدەکردەوەو چارەسەرمان دیاری دەکرد، کاریگەریی ئەو بارودۆخە لەسەرمان هەندێ جار دەیگەیاندینە گریان.

کە حەسەن بەننا گەیشتە قاهیرە هەندێ پەیوەندی لەگەڵ پەیڕەوانی ڕێڕەوی (**الحصافية**) کرد. .. بەڵام سەرنجی دا سوود ناگەیەنێت، بۆ ساڵی دووەم پەیوەندی کرد بە (کۆمەڵەی رەوشتە جوانە ئیسلامییەکان)ەوە، کە گرنگی بە موحازەرەدان دەدا لە بابەتە ئیسلامییەکاندا، بەڵام ئەوەش بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە گەورەیەی کە لەنێوان موسوڵمانان و بیروباوەڕ و خواستەکانی ئەو بیروباوەڕەدا دروست بوو بوو بەس نەبوو.

دوای ئەوەی قەناعەتی بۆ دروست بوو خەمەکانی بوو بە خەمی بڵاوکردنەوەی بیروباروەڕ بەناو خەڵکدا، کەتەنیا مزگەوت بۆ ئەو کارە بەس

نەبوو، ئەو هەنگاوێکی تری پێنا ئەویش ئەوە بوو، کە لە قوتابیانی ئەزهەر و (دار العلوم) کۆمەڵێکی ڕێکخست، تا لەسەرکاری ئامۆژگاری و ڕێنمایی خۆیان رابێنن و پاش ماوەیەك ئەمانە بۆ ئامۆژگاری کردن چوونە ناو مزگەوتەکان، گرنگتر لەوەش ئەم ڕێبازی ئامۆژگارییە کاتێك لەمزگەوتەوە گوێزرایەوە بۆ چایخانە و شوێنی کۆبوونەوەکانی خەڵك، سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێنا. ئەمەش بەمەبەستی بەهێزکردنی بیرۆکەی ئیسلامیی و بڵاوکردنەوەی دووبارەی. پاشان کۆمەڵێك لەم وتاربێژ و ئامۆژگاریکارانە دوای راهێنان، لەقاهیرەوە ناردە شار و دێهاتەکان بەمەبەستی بانگەوازکردن بۆ پەیامی ئیسلام و ڕێخۆشکردن بۆ بیرۆکەی کاری برایان کە لە ئاییندەدا دادەمەزرێت.

لەو ماوەیەدا ئیمام بەننا پەیوەندی بەخاوەنی کتێبخانەی (**السلفية**) ەوە کرد، کە ئەو کاتە(**محي الدين الخطيب**) بەڕیوەی دەبرد هەروەها پەیوەندی کرد بە مامۆستا (**رشيد رضا**) وە، کە گۆڤاری (**المنار**)ی دەرکرد و، خەمەکانی بۆ زاناکانی ئەزهەر باس دەکرد، کە لەسەر زمانی شێخ (**دجوي**) وەڵامیان دایەوە، باهەرکەس بۆ خۆی کاربکات و خۆی لەم بەڵایە رزگار بکات.

تا لەکۆتاییدا لە ئاداری (١٩٢٨ ز) دا گەیشت بە کۆمەڵێك لە برایانی کەپێکەوە کۆمەڵی برایانی موسوڵمانیان دامەزراند بۆ ئەوەش بڕیاری دابوو قبوڵی هەرچی تاڵی و سەختی هەیە بکات، تا ئەو پردە تەسکەی نوێخوازانی پێش ئەو بەسەریدا گوزەریان کرد بوو، ئەویش بەسەریدا گوزەر بکات، بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ئەو کۆمەڵەی دامەزراند.

ئیمام بەننا لەیاداشتەکانیدا دەڵێت: (لە میسر و لە وڵاتانی تری ئیسلامدا هەندێ ڕووداو گیان و ڕۆحیان دەسووتاندم و سۆزی دڵیان دەجۆشاندم، لەوە تێیان گەیاندم کە دەبێت چاکی لێبکرێت بەلادا و دوای بێداربوونەوە ڕێگای

پێکهێنان بگیرێتە پێش و دوای لێکۆڵینەوە کۆمەڵێك بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە پیرۆزە دامەزرێنرێت).

دەڵێت: قسەم لەگەڵ زۆرێك لە گەورە پیاواندا کرد، کەپێویستە راپەڕین و رێگای کارو پێکهێنان بگرێنە بەر، هەندێك خاویان دەکردمەوە و هەندێکیش هانیان دەدام و هەندێ کەسیش پێیان وتم: پەلە مەکە بەڵام کەسێکم دەست نەکەوت، رێکخستن و بە کردارکردنی هەوڵەکانی لامەبەست بێت.

بۆیە رووم کردە هاورێیان و ئەو برایانەی کە لەکاتی خوێندندا خۆشەویستی و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لەنێوانماندا دروست بوو بوو، لەوانەوە ئامادەگییەکی باشم بینی، لەگەڵیان پەیمانماندا کە هەریەکەمان بۆ ئەو مەبەستە کار بکەین، تاکو ئاراستەی ئوممەت بەرەو ئاراستەیەکی ئیسلامیی چاك و پاك ببەین.

بۆیە لە ئیسماعیلییەوە یەکەمین ناوکی پێکهێنانی ئەم بیرۆکەیە دامەزراو، یەکەم دەستەی بچووکی ئەم کارە هاتە بوون، و پەیمانی گوێڕایەڵی لێبڕاوانەی لە ژێرناوی(برایانی موسوڵمان) دا بەخوادا. ئەوەش لەمانگی (**ذوالقعدة**)ی ساڵی (١٣٤٧ ك) رێکەوت لەگەڵ مانگی ئاداری ساڵی (١٩٢٨ ز) دا بوو[٢٢].

بەم شێوەیە ئەم بیرۆکەیە لەسەر دەستی ئەو سەرکردە کەم وێنەیەدا بوویە بزوتنەوە. ..پاشان گەورە بوو بوو, بە پڕی دنیا و خەڵکیشی خستەگەڕ.

(٢٢) قائد الدعوة، أنور الجندي ص ١٣٧ .

# ژیاننامەی پێشەوای تازەکەرەوە حەسەن بەننا ( ١٩٠٦ ز– ١٩٤٩ ز )

قسەکردن دەربارەی بزوتنەوەی برایان خوازیاری ئەوەیە ژیاننامەی دامەزرێنەرەکەی شارەزابین، تابزانین چۆن دایمەزراند و چۆنیش لە میسر، پاشان لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییدا گەشەی سەند.

## شوێنی لە دایکبوونی و خێزانی:

حەسەن بەننا (٢٥) ی شەعبان ساڵی (١٣٢٤ هـ) هاوکات لەگەڵ (١٤)ی تشرینی یەکەمی (١٩٠٦ ز) لەشاری مەحموودییەی سەر بە پارێزگای (**البحيرة**)، کە (١٥٠ کم) لە باکوری خۆرئاوای قاهیرەوە دوورە، چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

ئەو سەر بە خێزانێکی دێهاتی مامناوەند بووە، کە لە گوندی (شمشێرە)ی نزیك شاری (رەشید)ی کەنار دەریا لەدەلتای نیلدا بەکشوکاڵەوە خەریك بووە، باوکی (**شێخ أحمد عبدالرحمن البنا**) ئیجازەی زانستی هەبووە و پێشنوێژی مزگەوت و لێکۆڵەری زانستی سوننەت بووە، چەندین پەڕاوی لەسەر فەرموودەی پیرۆز نووسیوە، گرنگترینیان پەڕاوی (**الفتح الربّاني في ترتيب مسند الإمام أحمد بن حنبل الشيباني**)یە، باوکی خۆی بە قوتابی (**شێخ محمد عبده**) دادەنا. وەکو پیشەش بەرگی پەڕاوی دەگرت و سەعاتسازیشی دەکرد، بۆیە نازناوی (الساعاتی) لێنرابوو.

دایکی بە (**أم سعد**)ناسرابوو کچی پیاوێکی چێودار بوو لە دێی (شمشێرە). براکانی (**عبدالرحمن**) کە (کۆمەڵەی ژیاریی ئیسلامیی) لە (قاهیرە) دامەزراند و (**محمد و عبدالباسط و أحمدجمال الدين**)بوون، خوشکەکانی (**فاطمة**)

هاوسەری مامۆستا (عبدالحكیم عابدین) بوو و (**فوزیة**) هاوسەری پارێزەر (عبدالكریم منصور) بوو.

## قۆناغەکانی خوێندنی:

حەسەن بەننا لەماڵێکی خواناس و زانستدۆستدا پێگەیشت، سەرەتا لە قوتابخانەی رەشادی ئایینی لای شێخ (**محمد زهران**) قوتابی بوو، مامۆستاکەی کە دووەمین کەس بوو دوای باوکی کاریگەریی باشی هەبووە لە پێگەیشتن و گەشەکردنی ئەم قوتابییە گچکەیە.

ئیمام بەننا دەربارەی ئەم مامۆستایە دەڵێت: ئەو پیاوە لەگەڵ ئەوەشدا زانستی پەروەردە و دەروونناسی نەخوێندبوو کەچی لەوانەبێژیدا شێوازێکی کاریگەرو بەرهەمداری هەبوو و پەیوەندی ناخیی لەگەڵ قوتابییەکانیدا دروست دەکرد، لەو ماوەیەدا زۆرهەستم بەخۆشەویستیی زیادی مامۆستا دەکردو منیش ئەوم زیاد خۆشدەویست.لەم قۆناغەدا تەمەنی٨–١٢ساڵی بەسەربرد[٢٣]



أحمد عبدالرحمن البنا

(٢٣) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص ١٤.



پاشتر چوویە ئامادەیی مەحمودییە، لەوماوەیەدا زۆر زوو بایەخی بەکاری ئیسلامیی دا، لەگەڵ هەندێ لەهاوەڵانیدا بەسەرپەرشتی (**شێخ محمد ئەفەندی**) کۆمەڵەی (**الأخلاق الأدبية**) و پاشان کۆمەڵەی (**منع المحرّمات**) یان دامەزراند و هەر لەوێ ئاشنایی لەگەڵ (**الطريقة الحصافية**)ی سۆفییەتیدا پەیداکرد، ئاشنایی بەو پەیڕەوە سۆفیەتییە ماناکانی پاکێتی و زوهد و خۆ یەکلاکردنەوەی لە دڵیدا چەسپاند، لەکاریگەری ئەو پەیڕەوەوە هاوەبەشیی لەدامەزراندنی کۆمەڵەی (**الحصافية الخيرية**) دا کرد هەرچەند تەمەنی (١٣) ساڵ بوو، بوو بە ئەمینداری ئەو کۆمەڵەیە کە (**أحمد السكري**) سەرۆکی بوو، ئەم کۆمەڵە نوێیە دوو ئامانجی هەبوو: هەوڵدان بۆ پارێزگاری لە ئاکار و رەوشتی ئیسلامیی لەگەڵ بەرهەڵستی لەکاری نێرراوە تەبشیرییە مەسیحییەکان، ئەم کۆمەڵە بوویە سەرەتایەك بۆ دروستبوونی کۆمەڵی برایانی موسوڵمان[٢٤].

ئیمام بەننا لەو ماوەیەدا کاتەکانی دابەش کردبوو، بەیانیان خەریکی وانە خوێندن و دوای عەسر تا کاتی عیشا بەسەعات سازییەوە خەریك دەبوو، پاشان تا کاتی خەوتن پیاچوونەوەی وانەکانی دەکرد و داوی نوێژی بەیانیانیش ئەندازێك قورئانی لەبەر دەکرد [٢٥].

ئەم لاوە لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی کردبوو بە رێڕەوێکی سۆفییەتییەوە. . بە ویرد و یادکردن و نوێژ و سەردانی ئەولیایانەوە خەریکبوو، ئەوانە رێگایان لێ نەدەگرت کە هاویەشی بزوتنەوە نیشتمانییەکان بکات، بەڵکو سەرپەرشتی رێکخستنی ئەو رێپێوان و مانگرتنانەی دەکرد کە لە قوتابخانەکەیدا رێکدەخرا:

---

(٢٤) الإخوان المسلمون كبرى الحركات الإسلامية، اسحاق موسى الحسيني، ص ٤٧.

(٢٥) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص ١٥.

ئیمام بەننا دەڵێت: هێشتا ئەوەم لەبیرە کە ڕۆژێك مامۆستا (محمد خلف نوح) هاتە لامان و ئەسرین لەچاوانی دەباری. . لێمان پرسی چی ڕوویداوە؟ وتی: (محمد فرید بەگ) مردووە و دەستی کرد بە باسکردنی ژیان و ماندوو بوونی لەڕێگای نیشتیماندا. ئەوەش نیگای هەندێ هۆنراوەی پێ بەخشیم کە لەو کاتەدا هۆنیمەوە، تیایدا هاتبوو:

**أفريد نم بالأمن و الإيمان　　　أفريد لا تجزع على الأوطان**

واتە: ئەی فەرید بەئاسودەیی و باوەڕەوە بخەوە، ئەی فەرید خەم بۆ نیشتیمان مەخۆ. .. (بەو مانایەی ڕۆڵەکانی بەرگری لێدەکەن). هەروەها دەڵێت: ئەوەشم لە یادە کە چۆن خەڵکی باسی لیژنەی (میلنەر)یان دەکرد و هەموو کۆدەنگ بوون لەسەر پووچەڵکردنەوەی. ئەو هەستە هێنامییە گۆ و وتم:

**یــــا ملنر ارجع ثم سل　　　وفداً بباريس اقام**

**وارجع لقومك وقل لهـم　　　لاتخدعوهم يالئام**[٢٦]

واتە: ئەی میلنەر بگەڕیوەو بپرسە لەو شاندە لەپاریس ڕێکخراوە، بگەڕێرەوە بۆلای گەلەکەت و پێیان بڵێ: ئەی چاوچنۆکان فێڵیان لێ مەکەن.

بەننا دوای ئەوەی بۆ خوێندن چوویە خوێندنگای مامۆستایانی دەمەنهور، لەسەر هاوبەشیکردن لە چالاکییە نیشتیمانییەکان کە دژ بە ئینگلیز و دارو دەستەکەی دەکران، بەردەوام بوو، چونکە باوەڕی وابوو خزمەتکردن بەنیشتیمان ئەرکێکی ئاییننییە، دەبێت ئەنجام بدرێت[٢٧].

---

(٢٦) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص ٢٣.

(٢٧) ظروف النشأة و شخصية الإمام المؤسس، جمعة أمين، ص١٧٩.

ئیمام بەننا لەساڵی (١٩٢٠ ز)دا رووی لەخانەی مامۆستایانی دەمەنهور کرد، هەرچەندە دوو کۆسپ لەبەردەمیدا هەبوون. .. یەکەمیان کۆسپی تەمەن کە ئەو تەمەنی چواردە ساڵ و نیو بوو، مەرجی ئەو خانەیەش بۆ قبوڵکردن گەیشتن بوو بەپازدە ساڵیی، کۆسپی دووەمیش ئەوە بوو، هێشتا هەموو قورئانی لەبەر نەکرد بوو. .. بەڵام سەرپەرشتیاری خانەکە مامۆستا (**بشير الدسوقي**) چاوپۆشی گرفتی تەمەنەکەی لێکرد و بەڵێنی لێوەرگرت کە ئەو چواریەکەی قورئان کە هێشتا لەبەری نەکردبوو لەبەری بکات، ئیمام بەننا لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی گونجاو کاتەکانی رێك خستبوو، رۆژەکانی دەوامی لەوێ بەسەر دەبرد و دوای نیوەڕۆی پێنج شەممە دەگەڕایەوە بۆ مەحموودیە و بەیانی شەممە دەگەڕایەوە بۆ دەمەنهوور.



ئیمام حەسەن بەننا

لەمەحموودیە لەرۆژدا سەعاتسازی دەکرد و شەویش لەگەڵ برایانی رێڕەوی (**الحصافية**)دا خەریکی ویردو زیکر بوو. لەو ماوەیەدا ئەزمونی لێهاتن (**الكفاءة**)ی دا، لە قوتابخانەکەی خۆیان یەکەم و لەسەر ئاستی وڵات پێنجەم بوو[٢٨].

(٢٨) مذكرات الدعوة و الداعية ص٤٦.

لەساڵی (١٩٢٣ ز)دا لە (دار العلوم) ی قاهیرە وەرگیرا. لەوێ ئاسۆی نوێ و فراوان لە بەردەمیدا والآبوو. جگە لە هاوبەشیی کۆڕەکانی پەیڕەوانی (**الحصافية**)ی سۆفییەتی، سەردانی کتێبخانەی (**السلفية**)ی دەکرد و لەوێ پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵێك زانا و پیاوچاکان دروست کرد، لەسەرووی هەموویانەوە (**محب الدين الخطيب**). هەروەها هاوبەشی (کۆڕی زانایانی ئەزهەر)ی دەکرد، کە شێخ (**رشيد رضا**) سەرۆکیان بوو. ئەمانەهەوڵێ سەرکەوتووانەیان هەبوو لە بەرپەرچدانەوەی فێڵ وپیلانەکانی دوژمنانی ئیسلام.

هەر لەقاهیرە ئیمام بەننا بە مامۆستایان (**فريد وجدي**) (أحمد تيمور) و شێخی پێشووی ئەزهەر (**محمد خضر حسين**) و (**محمد أحمد الزهراوي**) یەوە سەرسام بوو، ئەمانەی بەپشتیوانی چاکی پرسی ئیسلامیی دەبینی و هاندەری هەموویان بوو بۆ کارکردن بۆ ئیسلام و بۆ رێگرتن لەو تەوژمە عەلمانییەی دوای وەلانانی خەلافەت چنگی بەسەر گۆڕەپانی سیاسیدا گرتبوو، هەروەها بۆ رێگرتن لەو تەوژمە بێ باوەڕیی و بێ رەوشتییەی رووی لە میسر نابوو و کە جگە لەوەی بانگەشەیان بۆ بێ باوەڕی و بێ رەوشتی، داوایان دەکرد کە زمانی عەرەبی بەپیتی لاتینی بنووسرێت و لاسایی کەمالیزمیان دەکردەوە و کاریان گەیاندە ئەوەی داوای گۆڕینی یاسای باری کەسێتی بکەن و وەقف یاساغ بکەن و پێگەی موفتی لەپەرلەماندا نەمێنێت.

ئیمام بەننا دەربارەی هەست و نەستی بەرامبەر ئەم رووداوانە دەڵێت: لەلایەن خۆمەوە بریاری کارێکی پۆزێتیڤمدا و، وتم: بۆچی هەڵگرتنی ئەو کۆڵە قورسە نەسپێرم بەو زانا گەورانە و بانگیان نەکەم بۆ ئەوەی بەهێزتر لەبەرامبەر ئەو تەوژمەدا بوەستن و پشتگیری لە ئیسلام بکەن؟ ئەگەر رازیبوون



ئەوە چاکە و ئەگەر نا هەڵوێستێکی ترمان دەبێت، ئەوسا بڕیارمدا و دەستم دایە جێبەجێکردن[٢٩].

ئەم دەستپێشخەرییە بوو بەرهۆی دەرچوونی گۆڤاری (**الفتح الإسلامية**)کە ژمارەی یەکەمی لە (١٠)ی حوزەیرانی (١٩٢٦ ز) دەرچوو. پاشان دامەزراندنی (کۆمەڵەی لاوانی موسوڵمان) لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٧ ز)دا، کە کەسایەتییەکانی پارتی نیشتیمانی و پەیڕەوانی شێخ (**محمد عبده**) وەکو (**د.عبد الحكيم سعيد**) و (**يحيى الدرديري**) و شێخ (**محب الدين الخطيب**) هەڵسان بەدامەزراندنی.



محب الدين الخطيب

دوای ئەوەش کە ئیمام بەننا لە ئیسماعیلییە وەکو مامۆستا دەستبەکار بوو، لەوێ بوویە پەیامنێری گۆڤاری (**الفتح الإسلامية**)کە شێخ (**محب الدين الخطيب**) بەڕێوەبەری کتێبخانەی (**السلفية**) و یەکێك لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی لاوانی موسوڵمان) دەری دەکرد[٣٠].

## بانگەواز لەچایخانەکاندا:

ئەوەی کە ئیمام بەننا، لەدیاردەکانی هەڵوەشان و خراپەکاری لە قاهیرە بینی، بۆی دەرکەوت، کە تەنیا گەیاندنی ئیسلام و فێرکردنی لە مزگەوتەکاندا بۆ خەڵك بەس نییە، پێی وابوو ئەوانەی لە چایخانەن زیاتر پێویستیان

(٢٩) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص٣٢.

(٣٠) الإخوان المسلمون كبرى الحركات الإسلامية، اسحاق موسى الحسيني، ص ٢٣.

بەبانگەواز و ئامۆژگارییە، تا ئەوانەی لەمزگەوتن، چونکە ئەوانە پەیوەندییان لەگەڵ ئایین زیاتر کاڵبووەتەوە و دەمێکە لەئامۆژگاری بڕاون. جا بۆچی ئامۆژگاریکردنەکە نەگوێزرێتەوە بۆ لایان؟ ئەمە دەرخەری داهێنەریی عەقڵی ئیمام بەننا بوو !

هەروەها ئەمەشی بۆ کۆمەڵێك لەهاوەڵانی لە (دارالعلوم) و لە زانایانی (ئەزهەر)یش پێشنیار کرد کەبچن بۆ چایخانە و شوێنە گشتییەکان، لەوێ پەیامی خۆیان بگەیەنن. ئەم ئەزموونە سەرکەوتنێکی چاکی بەدەست هێنا و بوویە هاندەریان کە لەسەری بەردەوام بن.

هەروەها لقی کەشیان لێ جیابوویەوە، کە لەپشووی هاویندا، لەشار و دێهاتەکاندا کاری بانگەوازییان ئەنجام دەدا، بەمەش بوونە جێگای متمانەی خەڵك و بەجوان باسیان دەکرا و، هەر لەمەیشەوە لە کۆڕەکانیاندا لەسەر شێوازی جوان دواندنی خەڵك راهاتن [٣١].

## چۆنیەتی دامەزراندنی بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان:

وا دەردەکەوێت بیرۆکەی دامەزراندنی (برایان) لەمێشکی ئیمام بەننادا لەو کاتەوە کە لە (دار العلوم) بوو، گەڵاڵە بوو بوو، چونکە کاتێك داوای لێکرا دارشتنێك بنووسێت لەسەر ئەوەی: (دوای تەواوکردنی خوێندن ئاوات و هیواکانی ژیانت چیین؟) نووسیبووی: گەورەترین ئاواتم دوای تەواوکردنی خوێندن دوانن: یەکێکیان تایبەتی و ئەوی تریان گشتییە. ئاواتە تایبەتییەکەم ئەوەیە چەندە بتوانم خێزان و خزمەکانم بەختەوەر بکەم، ئاواتە گشتییەکەشم

(٣١) روح و ريحان، أحمد أنس الحجاجي ص ٩٧، الإخوان المسلمون و المجتمع المصري، محمد شوقي زكي، ص ١٥، الإمام حسن البنّا، د.جابر قميحة، ص٦٠.



ئەوەیە کە ببمە مامۆستایەکی ڕێنیشاندەر، بە ڕۆژ بەفێرکردنی منالآنەوە خەریك ببم و شەویش بۆ فێرکردنی گەورەکان تەرخان بکەم. ..ئامانجی ئایین و سەرچاوەی بەختەوەرییان بە وتاردان و گفتوگۆکردن و نووسین و پەڕاودانان و بەگەڕان و گەشتکردن بۆ روون بکەمەوە [٣٢].

کاتێك لە ساڵی (١٩٢٧ ز)دا (دار العلوم)ی بەیەکەمی تەواو کرد، بەمامۆستا لە شاری ئیسماعیلییەی کەناڵی سویس دامەزرا. لەکاتی ماڵئاواییدا لەمامۆستایان و هاوڕێیانی (**محمود أفندي الشرنوبي**) کە پیاوێکی خواناس و چاکەخواز بوو، پێی وت: پیاوی باش بچێتە هەرکوێ دوای خۆی شوێنەوارێکی چاك بەجێ دەهێڵێت. .. ئەم وشانە لەگیانی ئەم ڕێبوارەدا جێگای خۆیان کردەوە.




شاری ئیسماعلیە

(٣٢) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص٦٠.



بیری لەشێوازێکی پلان بۆ دانراوی بانگەواز کردەوە، لەچاپخانەکاندا پەیوەندی بەخەڵکەوە دەکرد و بەرەو مزگەوتی دەبردن، هەوڵی دەدا هەنگاو بەسەرخاڵە جیاوازەکانی نێوان خەڵکدا بنێت. لەکاتێکدا ئەو جیاوازییانە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیی ئەو سەردەمەشدا باوبوون!!

بەوەش توانی بناغەی بانگەوازێکی ئیسلامیی بەهێز دابمەزرێنێت و لەگەڵ شەش کەس لە **هاوەڵانی** پەیمانیان دا یەکەمین شاندی ئەو کۆمەڵەیە پێك بهێنن، کە دواتر بە کۆمەڵەی برایانی موسوڵمان (**الإخوان المسلمون**) ناسرا.

ئەو شەش برایە بەمامۆستا بەننایان وت: ئێمە بیستمان و تێگەیشتن و ناخمان جۆشا، بەڵام رێگای کرداری بۆ بڵند کردنی ئیسلام و موسوڵمانان نازانین، ئێمە لەم ژیانە... ژیانی ژێر دەستەیی و کۆت بێزارین، دەشبینین کە موسوڵمانان لە کاروباری ئەم وڵاتەدا بێبەشن و پێگە و رێزێکیشیان نییە. . ئێمەش تەنیا خوێنمان هەیە کە بەدەمارەکانماندا بەگەرمی دەسوڕێتەوە و گیانمان هەیە کە بەرۆشنایی باوەڕ و رێزی مرۆڤ بوون دەدرەوشێتەوە و چەند درهەمێکمان هەیە کەهۆکاری بژێوی خێزان و منداڵەکانمانە. ئێستا ئەوەی لەتۆمان دەوێت چیمان هەیە دەیخەینە خزمەتت و چی دەتوانین ئەنجامی دەدەین، تا لە بەرپرسیارێتی بەردەمی خوا رزگار ببین. هەروەها ئەم کۆمەڵە دڵسۆزانە پەیمان بەخوا دەدات، کە بۆ ئایینەکەی ئەو بژی و لەپێناوی ئەودا بمرێت، بەوەش تەنیا رەزامەندی خوا بخوازێت، کۆمەڵی ئاواش شایانی سەرکەوتنە با ژمارە کەم و کەم تفاقیش بن[(٣٣)].

ئەمە لەمانگی (**ذو القعدة**) ی ساڵی (١٣٤٧ ك) رێکەوتی ئاداری (١٩٢٨ز) دا بوو، ئەو برایانەش بریتی بوون لە: (**حافظ عبدالحمید**، **أحمد الحصري** ،

---

(٣٣) الإخوان المسلمون، ریتشارد میتشل، ص ٧٧.



**فؤاد ابراهيم**، **عبدالرحمن حسب الله**، **اسماعيل عزت** ، **زكي المغربي**) [٣٤]
و هەموویان لەوانە بوون وانە و وتارەكانی مامۆستا كاریگەری لەسەریان دروست كردبوو، یەكێك لەوانە پرسی: خۆمان ناو بنێین چی؟ ئایا كۆمەڵێك بین یان یانەیەك؟ یان رێبازێكی سۆفییەتی؟ یان سەندیكایەك یان. .. تاكو شێوازی فەرمی خۆمان بگرین.

ئیمام بەننا دەڵێت: وتم: واز لەشێوەو شكڵ و شێواز بێنن، جارێ با لەسەر بیرۆكەو مەعنەویات و كاركردن كۆببینەوە، ئێمە برایانێكین، خزمەتكردنی ئیسلاممان دەوێت، كەواتە ئێمە برایانی موسوڵمانین لێرەوە ناوەكە لە پڕ هات و یەكەم شانەی برایانی موسوڵمان (**الإخوان المسلمون**) لەو شەش كەسەی كە لە دەوری ئەو كۆبوونەوە بەم شێوازە و بەم ناوەوە هاتە بوون [٣٥].

ئیمام بەننا بۆ ئەم بانگەوازە بێ دەنگە دەنگ كاری دەكرد، بەمەش متمانەی زۆری بۆ خۆی و خەڵكی و بانگەوازەكەی كۆ دەكردەوە. . بانگەوازەكەی رۆژ بەرۆژ زیاتر خەڵكی روویان تێدەكرد و دەبوونە پشتگیر و سەربازی، گوند و شارۆچكە نەما سەریان لێ نەدات و لەگەڵ خەڵكەكەیان كۆنەبێتەوە. .

ئەوسەردانانەی لە رۆژەكانی پشووی هەفتە و پشووی هاویندا بوون، لەیەكەمیاندا سەری لە شوێنە نزیكەكان دەدا و لە دووەمیاندا دەچووە شوێنە دوورەكان، ئەم سەردانانەی دوای دوو ساڵ بەرهەمیان پێكهێنانی سێ لق بوو لە (**أبوصوير**، **پورسعيد و البلاح**). بۆ ساڵێ سێیەم لقێكی تری لە سویس زیاد كرد و بۆ چوارەم ساڵ بوونە دە لق و پەیمانگایەكی پەروەردەی كچان لە ئیسماعیلییە، تایبەنە (رێكخراوی خوشكانی موسوڵمان)، چونكە ئیمام بەننا بایەخی گەورەی بە ئافرەت دەدا، ئەوەش یەكەم ئەزموونی گرنگیدان بە

(٣٤) لماذا اغتيل الإمام البنّا، عبدالمتعال الجبري، ص ٣٧.
(٣٥) مذكرات الدعوة و الداعية، ص ٦٦، كبرى الحركات الإسلامية، محمد السيد الوكيل،ص ٣٨.

ئافرەت بوو لە نیشتیمانی عەرەبدا، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئافرەت و گەشەدان بەلایەنی فیکری و کۆمەلایەتی و سیاسی ئەو.

بەمشێوەیە بناغەی یەکەمی کۆمەڵی برایان بەچەند کەسێکی کەم و کەم توانا دامەزرا، لەوێوە بەکارکردنی رۆژانە لەسەر ژیان کەوتە رێ و لە رێگادا پرس و کێشەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵکی چارەسەر دەکرد.

لەو رۆژگارەدا خەڵك لە ژێر کاریگەریی کۆمپانیای کەناڵی سوێسدا بوون. .... ئیمام بەننا کاری بۆ ئەوە دەکرد متمانە بۆ کەسایەتی موسوڵمان بگێڕێتەوە، بەوە شارەزای بکات تا ماف و ئەرکەکانی خۆی بزانێت و ماناکانی رێزی مرۆڤ و بڵندی موسوڵمان لە ناخیدا بچەسپێت و، سامی بیانی و داگیرکەرانی لێ دوورر بخرێتەوە.

لەپێناوی ئەمەدا لقی رێکخستن کرایە مزگەوت و قوتابخانە، چونکە رێگای سەرکەوتنی بانگەوازی ئیسلامیی خەڵکی دیندار و شارەزای دەوێت، بەننا لە یاداشتەکانیدا لەژێر ناونیشانی (نیگای ئیسماعیلییە)دا نوسیوویەتی: ئەم شارە نیگایەکی سەرسوڕهێنەری هەبوو، سەربازگەی ئینگلیز بەو هەموو دەسەڵاتەوە لەرۆژئاوایەوە بوو، داخ و خەمی دەکرد بەدڵی هەر نیشتیمانویستێکی غیرەتداردا، ئەو هەمووە خانووە گەورانەی کە لەگەڕەکی بیانییەکاندا کارمەندە بیانیەکانی لێ دادەنیشتن و لەبەرامبەرەوە گەڕەکی کرێکارە عەرەبەکان چەندە پەرپوت و بچووك بوون. جگە لەمانەش ناوی هەموو شەقامەکان بەشەقامی مزگەوتیشەوە تەنیا بە زبانی بیانی داگیرکار لەسەر تابلۆکان نوسرابوون. ئەمانە هەموو هۆکاری کاریگەر بوون بۆ جێ بوونەوەی بانگەواز و کاریگەر بوونی (٣٦).

---

(٣٦) مذكرات الدعوة و الداعية، ص ٧٥.

دوای پێنج ساڵ لە دامەزراندنی ئەو بانگەوازە لە ئیسماعیلییە ئیمام بەننا ساڵی (١٩٣٣ ز) گوێزرایەوە بۆ قاهیرە.

## ئەو گرفتانەی سەرەتا روویان لە بانگەواز کرد:

ئیمام بەننا لە یاداشتەکانیدا باس لەو گرفت و کێشانە دەکات کە لەو سەرەتایەوە رێگەیان بە بانگەوازە ساواکەی گرت، هەروەها چۆنیەتی زاڵبوون بەسەریاندا روون دەکاتەوە، ئێمەش بۆ سوود وەرگرتن لێیان، هەندێکیان لێ باس دەکەین، لەوانە:

١-کاتێ خەڵك بەم بانگەوازە دڵخۆش بوون و لەدەوری کۆبوونەوە خێرا دووپشکی ئێرەیی و کینە لە دڵی ناحەزانیدا جوڵا، بەمەیلی خۆیان دەستیان دایە قسە و قسەڵۆکی بێ جێ دەربارەی بانگەواز و بانگەوازکاران و هەر جارەی بە شتێك تۆمەتباریان دەکردن، دەیانوت: ئەمانە بانگەشە بۆ مەزهەبی پێنجەم دەکەن، یان دەیانوت: ئەمانە لاوانێکی سەرکەشن، جارێکی تر دەیانوت: ئەمانە ماڵی خەڵکی بەناڕەوا دەخۆن !!

ئیمام بەننا دەڵێت: ئەو هەموو ژاوەژاوەم دەبیست بەڵام هیچ گوێم نەئەدایە و، وەڵامیشم نەدەدانەوە. . هیچ رێسایەك لە رێگری کرداری بانگەوازدا ئەوەندەی ئەو رێسایە سوودم لێ نەدیوە، کە دەڵێت: شائیعە و درۆ و دەلەسە بەرەد دانەوە بەریان لێ ناگیرێت، بەڵکو بەکاری بەسوود و پەسەند لەناو دەبرێن، هەر ئەوەش راستییەکان روون دەکاتەوە و زمانەکان بەراست وتن دێنێتە گۆ (٣٧).

٢-لەگەڵ بەردەوامی سەرکەوتنمان پیلانگێڕیی و ئاژاوەنانەوە بەرامبەرمان دەستی پێکرد. . دەست درایە قسە هەڵبەستن و راپۆرت نووسین بەناوی

---

(٣٧) مذكرات الدعوة و الداعية، ص ٩٥.

خوازراوەوە بۆ دەسەڵاتدارانی ناوچەیی لە پۆلیس و نوێنەرانی پەرلەمان و پێگەکانی تریش. کاتێ کە هەر سوودی نەبوو، سکاڵایەکیان بۆ سەرۆکی حکومەت نووسی کە چەند شتێکی سەیری تێدا بوو لەوانە: ئەم مامۆستایە شیوعییە، یان وەفدییە و دژی حکومەت کاردەکات و شتانی تریش لەو بابەتە، کاتی لێکۆڵینەوە هات بینیم کە خوا چۆن پاریزگاری لە باوەڕداران دەکات: ﴿**إن الله يدافع عن الذين آمنوا**﴾ الحج / ٣٨.

٣- لەو وانانەی کە لەوێ فێربووم ئەوە بوو کە بانگخواز هەمیشە دەبێت لە دوو توێژ لە خەڵك بەدوور بێت و هەرگیز نەیانخاتە ناو برگەکانی کارکردنەوە... ئەو دوانەش یەکەمیان: بێ باوەڕ، باخۆیشی بەچاك بداتە قەڵەم، دووەمیان: ساڵحێك کە رێزی یاسا ناگرێت و مانای گوێڕایەڵی وەکو خۆی نازانێت ،ئەم چەشنە لەخەڵك رەنگە بەتەنها سوودمەند بن، بەڵام لەناو کۆمەڵدا ئەندامان تێك دەدەن. بە ساڵحییەکەی دەیانخەڵتێنێت و بە بێ گوێییەکەی پەرتیان دەکات (٣٨).

٤- لەکاتی گواستنەوەم بۆ قاهیرە براکان دەیانویست کەسێکیان بۆ دیاری بکەم، کە دوای من بەرپرسیارێتی بگرێتـە ئەستۆ، منیش شێخ (**علي الجداوي**)م دیاری کرد کە باشترینی براکان بوو لە رەوشت و پەرستشدا، بۆیە ئەوانیش بەکۆی دەنگ پەسەندیان کرد، بەڵام لە نێوانیاندا مامۆستایەك هەبوو حەزی لەو پێگەیە دەکرد و خۆیشی بەشایستەتر دەزانی، بۆ یە دەستی کرد بە پەیوەندی لاوەکی سێ کەسی تریش لەدەوری کۆبوونەوە، لەریزەکانی برایاندا، دەستیان دایە فیشاڵ بڵاوکردنەوە. ویستم رەگی ئەو ئاشوبە بقرتێنم و لەهەمان کاتدا ئەو چوار برایەش بپارێزم، بۆیە هەموو براکانم بۆ

(٣٨) سەرچاوەی پێشوو، لا ١٠٨.

کۆبوونەوەیەکی نا ئاسایی بانگ کرد و هەمان بابەتم بۆ باسکردن، هەر لایەك راو بۆچوونی خۆی وت و ئەنجامی دەنگ دانەکە چوار دەنگ بوو لەبەرامبەر زیاتر لە پێنج سەد دەنگ بۆ شێخ (**علي الجداوي**). بەڵام دەروونەکان ئەگەر ئارەزووی خۆویستی لەهەر لایەکەوە هێلانەی تێیاندا کرد، لە ئاستی چاکە کوێر دەبن، ئالێرەوە ئەو چوارە کۆڵیان نەدا و بەناوی چاکە ویستییەوە دەستیان کردە شائیعە کردنی خراپ بۆ کۆمەڵ و بانگەوازەکەش و, کەوتنە راپۆرت نووسین بۆ بەرپرسان کە سەرۆکی برایان (**حسن افندي**) ماڵ دەپژێنێت و بێ ئەوەی مافی ئەوەی هەبێت خەرجی دەکات.

بیرم کردەوە کە ئەنجومەنی بەڕێوەبردن کۆبکەمەوە تا بڕیاری دەرکردنیان بۆ دەربکات، بەڵام ئەوان دەستیان پێشخست و سکاڵای وازهێنانیان پێشکەش کرد.

پیلانگێڕیی ئەوانە بەوەش کۆتایی پێنەهات، بەڵکو دەستیان دایە چاپکردنی بڵاوکراوە و بڵاوکردنەوەی شائیعە کە بەننا بنەمای شورا پێشێل دەکات و ئازادیی رادەربڕین لەناو کۆمەڵی برایاندا بزرە [٣٩].

## حەسەن بەننا لە قاهیرە

لەکۆتایی ساڵی (١٣٥١ ك) رێکەوتی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٣٣ ز) ئیمام بەننا گوێزرایەوە بۆ قاهیرە، بەو بۆنەیەشەوە مەڵبەندی گشتی برایان گوێزرایەوە بۆ ئەوێ. دوای ساڵێك لەمانەوەی لە قاهیرە بانگەوازی برایان تەشەنەی سەند و خۆی هاوێشت بۆ پەنجا شاری وڵاتی میسر و لەهەریەك لەو شارانەدا پرۆسەیەکی گرنگ یان دەزگایەکی سوودبەخش یان زیاتریان تێدا کردەوە. بۆنموونە:

(٣٩) مذكرات الدعوة و الداعية، ص ١٣٩.

لەئیسماعیلییە مزگەوتی برایان و یانەی وەرزشی و پەیمانگەی (**حراء**) بۆ فێرکردنی کوڕان و خوێندنگای دایکی باوەڕداران بۆ فێرکردنی کچانیان کردەوە. لە(شیبراخیت) مزگەتێك و یانەیەك و پەیمانگایەکی فێرکردن بۆ کوڕان و خانەیەکیان بۆ فێربوونی پیشە کردەوە بۆ ئەو لاوانەی ناتوانن خوێندن تەواو بکەن، هەر بەو شێوەیە لە (مەحموودییە) کارگەیەکی چنین و پەیمانگەیەکیان بۆ لەبەرکردنی قورئان کردەوە، بەوشێوە هەموو لقەکان لە (ئیدفۆ) وە تا (ئەسکەندەریە).

لە قاهیرە (کۆمەڵەی ژیاری ئیسلامیی) کە (عبدالرحمن)ی برای ئیمام بەننا دایمەزراند بوو بەهەموو ئەندامەکانیەوە لەگەڵ کۆمەڵی برایاندا یەکیان گرت.

ئیمام بەننا گەشتی بەردەوام و یەك لەدوای یەکی بۆ سەرجەم ناوچەکان دەرکرد و برایانێکی تازەهاتووی لەگەڵ خۆی دەبرد و فێری رەوشتی بانگخواز و فیقهی بانگەوازی دەکردن و پێیدەگەیاندن، تاکو بەئەرکەکانی بانگەواز هەڵسن.

کە رۆژی پێنج شەممە دەهات جانتاکەی هەڵدەگرت و وەکو کەسێکی ئاسایی سواری شەمەندەفەر دەبوو، تێکەڵیی رێبوارەکانی دەکرد و لەکێشە و گرفتەکانیانی دەپرسی، ئەوەی لەگەڵ باس دەکردن کە خۆی وبراکانی چییان بۆ خەڵك و وڵات دەوێت.

ئیمام بەننا بەم گەشتانەی گەنجینەیەکی مەعریفی گەورەی دەربارەی باری دەروونی و کۆمەڵایەتی خەڵك کۆکردەوە، کە کەسی چاکەخواز و چاکساز بۆ دیاریکردنی دەردەکان و ناسینی نیشانەکانیان و دیاریکردنی چارەسەر بۆیان زۆر پێویستی پێیەتی [٤٠].

(٤٠) روح و ريحان، احمد أنس الحجاجي، ص ١٧٩.




یەکەمین کۆبونەوەی ئیمام بەننا لەگەڵ بەڕێوبەرانی ئیخوان موسلمین

ئیمام بەننا بەو شێوەیە زۆر بەوردی و خۆنەویستییەوە بەدواداچوونی کارەکانی ئەنجامدەدا... تاکو چالاکییەکانی بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان هەموو لایەکی میسری گرتەوە.

لەو ماوەیەدا گۆڤاری هەفتانەی (**الإخوان المسلمون**)ی لە ساڵی (١٩٣٣ ز) ی دەرکرد، کە سەرۆکی نوسینەکەی (**مامۆستا طنطاوي جوهري**)، و بەڕێوەبەرەکەی (**محب الدين الخطيب**) بوو، تا چوار ساڵ بەردەوام دەردەچوو.

پاشان گۆڤاری هەفتانەی (**النذير**)ی سیاسی دەرکرد و یەکەم ژمارەی لە(٢٩)ی رەبیعی یەکەمی ساڵی (١٣٥٧ ك) دەرچوو، ئەم گۆڤارە لەگەڵ هەندێك ئەندامدا کە لەبرایان جیابونەوە برایە دەرەوە.

پاشان ساڵی (١٩٣٩ ز) ئیمام بەننا دوای وەفاتی شێخ (**رشيد رضا**) سەرپەرشتی دەرچوونی گۆڤاری (المنار)ی کرد.

لە ساڵی (١٩٤٢ ز) دەستکرایەوە بەدەرکردنی گۆڤاری (**الإخوان المسلمون**) و بەردەوام بوو تا ساڵی (١٩٤٨ ز) کە فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایان دەرچوو.

هەروەهاساڵی (١٩٤٧ ز) ئیمام بەننا گۆڤارێکی مانگانەی بۆ لێکۆڵینەوەی پرسە ئیسلامییەکان، لە ژێر ناوی (الشهاب)دا دەرکرد.

لەساڵی (١٩٣٣ ز)دا ئیمام بەننا چاپخانەیەکی بچوکی دامەزراند کە لەساڵی (١٩٤٦ ز)دا بوویە چاپخانەیەکی گەورە[٤١].

## بناغەی هزری و پرۆگرامی کردەیی بانگەوازی کۆمەڵی برایان:

ئیمام بەننا نزیکەی پانزە پەیامی نووسیوە، لەشێوەی زنجیرەیەکی یەك بەداوی یەکدا و بەگوێرەی گەشەسەندنی کاروباری کۆمەڵی برایان و چوونە پێشی بزوتنەوەکەیان و کارلێکی ئەوان لەگەڵ رووداوەکان و رای گشتیدا. . لەناویاندا راڤەی ئامانجەکانی کۆمەڵ و هۆکارەکانی گەیشتن بەو ئامانجانەی کردووە. ئەو پەیامانە لەو کاتەوە ئێستاشی لەگەڵدا بێت بناغەی هزری و پرۆگرامی کردەیی ئەو کۆمەڵە و بانگەوازەکەینی.

## ئیمام بەننا و شێخ ( طنطاوي جوهري ) :

بانگەوازی برایان لەکاتی دامەزراندنییەوە لە ئیسماعیلییە لەساڵی (١٩٢٨ ز) دا زۆر خێر بەناو خەڵکدا بڵاوبوویەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی لە ڕووی هزری و پرۆگرامیی و مومارەسەی کردەییەوە میانەڕەو بوو، هەموو لایەنەکانی ئیسلامییی بەرجەستە کردبوو، لەساڵی (١٩٣٣ ز) بەگواستنەوەی ئیمام بەننا

(٤١) الإخوان المسلمون، محمد فريد عبدالخالق، ص٥.



بانگەوازیش گوێزرایەوە بۆ قاهیرە، چینێکی پاك و خاوێنی دەستکەوت کە بەخێرایی و بە خۆشەویستییەوە قۆستیانەوە و بەناو چینەکانی کۆمەڵگادا بڵاویان کردەوە. تا گەیشتنە لای زانایانیش، گەیشتنە لای شێخ (**طنطاوي جوهري**) کە زانایەکی گەورەی ئەو سەردەمە بوو, پێشتر دەربارەی بەننا شتی بیستبوو، بۆیە چوو بۆ لای و پرسیاری لێکرد: بۆچی بانگی خەڵك دەکات؟ ئەویش وتی: بۆ لای قورئان، پێی وت: واز لەو وشەیە بێنە چونکە ئەو وشەیە ستەم لێکراوە !! هەر کۆمەڵ و لایەنێك لە دەوڵەتی ئیسلامدا هەڵسابن، هەرچەندە پووچەڵ و نیاز خراپیش بووبن، هەر ئەوەیان وتووە کە بانگەواز بۆلای قورئان دەکەن، کەواتە تۆ وردەکاری بانگەوازەکەتم پێ بڵێ و لەهەموو رویەکی ژیانەوە بۆم روون بکەرەوە کە بانگەشە بۆ چی دەکەیت؟ دەڵێت: وردەکاری بانگەوازەکەی بۆ راڤە کردم، بینیم لەسنووری قورئاندایە.


شێخ طنطاوي جوهري

دوای قەناعەتکردنی شێخ (**طنطاوي**) بەبانگەوازەکەی پێی وت: جا مامۆستای گەورەم، تۆ مامۆستامانی و مامۆستای هەمووانی و دانای ئیسلامی و وادەبینم کە تۆ رێگا نیشاندەری بۆ ئەم بانگەوازەو لەمن شایستەتری، دەستم بدرەیێ با بەیعەتت پێ بکەم. شێخ (**طنطاوي**) وتی: نا براکەم، تۆ خاوەنی بانگەوازەکەیت و چاکتر لەمن دەزانیت پێشەوایەتی بکەیت، تۆ بەو کارە شایستەیت، من پەیمان بە تۆ دەدەم، ئیتر پەیمانی داو بەردەوام پابەندی ئەو پەیمانە بوو، تاکوماڵئاوایی لەم ژیانە کرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری –رەحمەتی خوای لێ بیت –.

هەر ئەو رۆژە هەندێ لە زانایان پێیان وت: کە تۆ زانایەکی گرانقەدر و گەورەیت، چۆن رازی بوویت شوێنکەوتەی کەسێك بیت کە ئاستی لە تۆ کەمترە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە، کە ئەگەر تۆیش وەکو من ئەو کەسایەتییە بناسیت خۆتت پێ ناگیرێت و خێرا لەسەر سەرخستی ئیسلام پەیمانی پێ دەدەیت.

پاشان وتی: ئەو کەسایەتییە لەبەرچاوی من ئاوێتەیەکی سەر سوڕهێنەرە لەخواناسی و لێزانیی سیاسی، ئەو دڵی (**علي**) و عەقڵی (**معاويە**)یە، ئەو گیانی سەربازیی کردووە بە باڵای بانگەوازێکی پڕ لە هۆشیارییدا و گیانی ئیسلامخوازیی کردووە بە بەر نیشتمانپەروەریدا، بەمەش ئەم بەرە ئیسلامییەی ئێستا نوسخەی دووەم و تەواوی بەرەی یەکەمی موسوڵمانانی زەمانی پێغەمبەری خودایە ﷺ.

دواتر شێخ (**طنطاوي**) هەڵبژێررا تا ببێتە نوێنەری ئەنجومەنی راوێژکاری برایان، بۆ نوێنەرایەتی برایانی قاهیرە و بوویە سەرۆکی نوسەرانی رۆژنامەی (**الإخوان المسلمون**) کە ژمارەی یەکەمی لە (٢٢)ی سەفەری (١٣٥٢ ك) هاوکات لەگەڵ (١٥) ی حوزەیرانی (١٩٣٣ ز) دەرچوو، یەکەم وتاری شێخ (**طنطاوي**) تێیدا لە ژێر ناونیشانی (بۆ خوێنەرانی بەڕێز) بوو.

هەروەها لەمەڵبەندی گشتی وانەیەکی تەفسیری قورئانی پیرۆزی بۆ دانرا، کە تیایدا تەفسیری قورئانی بەگوێرەی زانیاری سەردەم دەکرد و پەیوەندی نێوان ئایەتەکان و راستییەی زانستییەکانی رووندەکردەوە، کە ئەوە داهێنانێکی نوێ بوو لە تەفسیردا. ئەو زانا بەڕێزە دەستێکی باڵای هەبوو لە لێکدانەوەی ئایەتەکان و لەقەناعەت پێکردنی خەڵکدا، هەروەکو لە تەفسیردا شارەزاو کارامە بوو، هەروەها لە زانستە سروشتیەکانیشدا شارەزاو کارامە بوو.



دیارترین شوێنەواری شێخ (**طنطاوي**) لەناو بانگەوازدا ئەوە بوو کە ئەو یەکەمین کەس بوو کۆمەڵێك لە خوێندکارانی زانکۆی لەدەور بوو، بەردەوام رێنمونی دەکردن بۆ ئەوەی بچنە ناو بانگەوازی برایانی موسوڵمانەوە، ئەوەش لەساڵی (١٩٣٣ن)دا بوو، کاتێك ئیمام بەننا لە ناوچەکانی کەنار دەریا لەگەشتێکی بانگخوازیدا بوو، کۆمەڵێك لە خوێندکارانی زانکۆ کە سەر بە چەند کۆلیجێك بوون، سەردانی شێخ (**طنطاوي**)یان کرد، ئەمانە پەیوەندییەکیان پێکهێنابوو بەناوی لاوانی ئیسلام (**شباب الإسلام**)ەوە و تێیدا سەرکەوتوو بوون. پێشتر چووبوونە لای شێخ (**حامد السعفان**)کە ئەویش شیتەڵی بارودۆخی بۆ کردبوون و پاشان پێی وتبوون: من رێگاکەتان بۆ کورت دەکەمەوە و پێتان دەڵێم: پەیوەندی بە (کۆمەڵی برایانی موسوڵمان) ەوە بکەن، ئەو کۆمەڵە تازە پێگەیشتووەی کە لە گۆڤارەکەیانەوە هەست بە ئیسلامدۆستییەکی گەرم دەکرێت و، لە شێوازی نووسینەکانیانەوە دڵسۆزی و راستگۆیی و خەباتگێڕی بەدی دەکرێت، ئەوەندەش بەڵگە بەسە کە زانایەکی پایەداری وەك شێخ (**طنطاوي**) لەناو ئەو کۆمەڵەدایە و سەرۆك نووسەرانی گۆڤارەکەیانە (**الإخوان المسلمون**)، لەکاتێکدا کە ئەو زانایەکی گەورەیە و لەسەرجەم کتێب و نوسراوەکانیدا راوبۆچوونەکانی ئیسلامی لەگەڵێ رووەوە روونکردووەتەوە.

ئەو خوێندکارانە چوونە لای شێخ (**طنطاوي**) وپێیان دڵخۆش بوو و وتی: کەواتە چەرخێکی نوێ دەستی پێکردو خۆری راپەڕینێکی نوێ گزنگیدا، پاشان پێی وتن: کوڕەکانم! خۆتان بەکەم مەزانن، ئێوە هێزێکن کەئەگەر راستەڕێ بگرێت، دەوڵەت ئەم دیو و ئەو دیو دەکات، وزەیەکن گەر گڕبگرێت رێگا رۆشن دەکاتەوە. . ئێوە مادام ئیسلامتان ناسیوە و کەوتوونەتە سەر رێگای بانگەواز

و کارکردن بۆی دیاره كه ڕێگاتان دۆزیوەتەوه و كاتی ئەوه هاتووه میسر ڕاپەڕێت و پێشبكەوێت و بزوتنەوەی برایانی موسوڵمانیش بزوتنەوەیەكی نوێیه، لەگیانی ئیسلامەوه پرۆگرامی پەروەرده وەردەگرێت و پیاوان لەسەر شێوازی بانگەوازی یەكەمی ئیسلام پێدەگەیەنێت.

پاشان پێی وتن: گرنگترین شتێك بەننا لەكەسانی تر جیا دەكاتەوه ئەوەیه كه كەسایەتییەكانی ئەم سەردەمه دوو جۆرن: یان سیاسین و لەبارەی ئیسلامەوه شارەزاییەكی ئەوتۆیان نیه، یان زانایەكی ئایینین و لەسیاسەتدا شارەزا نین، لەبەر ئەمەیه بزوتنەوه چاكسازییەكانی میسر سەركەوتنیان بەخۆوه نەدیووه. بەڵام دڵنیابن كه ئیمام بەننا هەردوو شارەزاییەكەی كۆكردۆتەوه، فیقهزانێكی نایابه و سیاسەتمەدارێكی لێهاتوویشه.

شێخ (**طنطاوي**) چاوەڕێی گەڕانەوەی ئیمام بەننای نەكرد، دەستبەجێ نامەیەكی بۆ نووسی ئەو مژده دڵخۆشكەرەی دایه و ناوی نا سەركەوتنی ئاشكرا (**الفتح المبين**) كه بەراستی بۆ بانگەواز سەركەوتنێكی ئاشكرا بوو، لەنامەكەشیدا داوای كردبوو لێی كه زوو بگەڕێتەوه، ئەویش زوو گەڕایەوه و لەقاهیره پێیان گەیشت و بەیعەتیان لەسەر كاركردن بۆ ئیسلام دایه.

یەكەمین و لەپێشترینی ئەوانه لەبەیعەتداندا شەش بوون:

١–**محمد عبدالحميد أحمد** كۆلێژی ئاداب.

٢–**ابراهيم أبو النجار** كۆلێژی پزیشكی.

٣–**أحمد مصطفى** كۆلێژی بازرگانی باڵا.

٤–**محمد جمال الفندي** كۆلێژی زانستەكان.

٥– **محمد صبري** كۆلێژی كشتوكاڵی باڵا.

٦–**محمد رشاد الهواري** كۆلێژی یاسا.



شێخ (**طنطاوي**) دیارترین کەسی مێژووی بانگەواز بوو، لەگەڵ تەمەنی زۆریدا بیٚ ماندوو بوون و کۆڵنەدەرانە کاری دەکرد، هەرچۆنێك خزمەتی ئیسلامی بۆ بکرایە دەیکرد.

## هاوسەرگرتنی ئیمام بەننا:


سیف ئیسلام حسن بەننا

ئیمام بەننا لەساڵی (١٩٣٢ ز) کاتێك لە ئیسماعیلییە بوو، لە خێزانێکی بازرگانی مامناوەندی ئەویٚ بەناوی خانەوادەی (**الصولي**) هاوسەری گرت، لەو هاوسەرەی پێنج کچ و کوڕێکی هەیە، کچەکانی (**سنا، وفاء، رجاء، هالة، استشهاد**) و کوڕەکەشی (أحمد سیف الإسلام)ە. شایانی باسە بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارو بژێوی خێزانی لەسەر رەویەیی باوکی بوو، بیٚ زیادەڕەوی و دوور لە دیاردەی بەفیڕۆدان و ئیسرافکردن ژیانی دەگوزەراند.

## لەنێو خانەوادەکەیدا:

ئیمام بەننا لەناو خێزانەکەیدا چ لەڕووی بیرکردنەوەو چ لەڕووی رەفتارەوە پابەندبوو بەئاکارە ئیسلامییەکانەوە، کوڕێکی گوێڕایەڵ بوو بۆ دایك و باوکی و هاوسەرێکی دڵسۆز و دڵپڕ لە خۆشەویستی بوو بۆ هاوسەرەکەی، باوکێکی میهرەبان و بەسۆزبوو بۆ مناڵەکانی برایەکی رەوشت جوان بوو بۆ براو خوشکەکانی، پەروەرشکار و ئامۆژگار بوو بۆ هەموویان، بەجێهێنەری پەیوەندی خزمایەتی خزمانی خۆی و هاوسەرەکەی بوو.

ئافرەت لەلای جێگەی رێز و حورمەت بوو، دایك، خوشك، هاوسەر، كچ، كارگوزار یان هەرشتێكی تر، ئەو بە ڕەوشتی بەرزی ئیسلامیی مامەڵەی لەگەڵ دەكرد.

بەرامبەر بە خێزانەكەی كەسێكی بایەخدەر بوو، لەناخەوە خۆشی دەویستن و وەكو رۆشنایی چاوی دەیبینین و بەرامبەریان خۆی بە بەرپرسیار دەزانیو ئەركی خۆی بەوپەڕی لە خۆبوردەییەوە ئەنجامدەدا، لەهەڵگرتنی خەمەكانیاندا هاوبەشی دەكردن، ئەركی پەروەردەی براو خوشكانی لە بری باوكی گرتبووە ئەستۆ، بۆ چارەسەری كێشەكان و دابینكردنی پێویستییەكانیان خۆی بە بەرپرس دەزانی، نەك بەتاكێك لەوان.

## پەیوەندی لەگەڵ دایك و باوكی:

وەكو كوڕێكی خواناس پەیوەندی لەگەڵیان بەهێز بوو، بەرێزەوە مامەڵەی لەگەڵ دەكردن، ماندووبوونیانی دەنرخاند و بەچاوی میهر و سۆز بۆی دەڕوانین و بەزمانی شیرین و وشەی جوان بانگی دەكردن، لەنامەكانیدا بۆیان بەگەورەم بابە و گەورەم دایە لەگەڵیان دەدوا.

لەیەكێك لەوتارەكانیدا دەربارەی دایكی دەڵێت: (سوێند بەخوا چەندین كاتژمێر دەبەمە سەر بەهۆی ئازاری دایكمەوە ئازارم پێدەگات و بیر دەكەمەوە چۆن رەزامەندیی بەدەست بێنم و چۆن دڵخۆش و شادمانی بكەم، ئایا خوا گیان بۆ ئەوە سەركەوتووم دەكات؟ حەز دەكەم مانگی جارێك بەتایبەتی سەردانی باوك و دایكم بكەم، نەك بۆ شتێك، تەنها بۆ ئەوەی دەستیان ماچ بكەم، بەڵكو نزایەكی چاكیان بەدەست بێنم و لێم رازی بن ).

بێگومان ئەم هەڵوێستانەی هەبوو چونكە بە ئاكاری ئیسلام گۆش كرابوو، لەسایەی بەرنامەكەیدا پێگەیشتبوو، چاك ئەوەی دەزانی، كە چاكە لەگەڵ دایك



و باوكدا چی دەگەیەنێت، لەوەش تێگەیشتبوو كە چاكە كردن لەگەڵیان سێ چواریەكی لەگەڵ دایكدایە و یەك چواریەكی لەگەڵ باوك. لەبەر ئەوە زۆرتر بەتەنگ دەست ماچكردن و رازیكردنی دایكییەوە بوو، هەمیشە بیری لای شادمانكردنی بوو و ئەوەی بەئاوات دەزانی، بۆیە دەیپرسی: ئایا خواگیان لەوەدا سەركەووتوم دەكات؟

## لەگەڵ هاوسەرەكەیدا:

ئیمام حەسەن بەننا هاوسەریی لەگەڵ كچێك كرد كە دایكی بۆی هەڵبژاردبوو، گرنگترین سیفەتی چاكی دینداریی بوو، دایكی گوێی لێ بووە كە بەدەنگێكی پڕ لە خشوع قورئانی خوێندووە. هەر بۆیە پێشوازی لەو هەڵبژاردنە كرد، لەوبارەیەوە دەیوت: خوای گەورە ویستی سەختی و ناڕەحەتییەكانم بۆ ئاسان بكات، كە دەرگای هاوسەرگرتنی لێكردمەوە بەشێوزاێكی زۆر ئاسان و لەسادەییەكی كەم وێنەدا بۆم جێ بەجێ بوو، خوازبێنی لەسەرەتای رەمەزان و مارەبڕین لەمزگەوت لەشەوی بیست و حەوتیدا و گواستنەوەی لە دەیەمی مانگی (**ذوالقعدة**)دا بوو، سوپاس بۆ خوا بێگرفت بەڕێوە چوو.

هاوسەرگرتنەكەی بەوشێوەیە بوو كەلای ئیسلام پەسەندە، ئەوەش بۆ ئەوەی ببێتە نموونەو خەڵك چاوی لێ بكەن. ... هاوسەرگرتن بەمەبەستی راگرتنی پاكێتی و بەسادەیی و ئاسانی و دوور لە ئاڵۆزكردن و مەرجی ناقۆڵا، مارەبڕین لەمزگەوت و گواستنەوەی دوای ماوەیەكی كەم. ئا بەو شێوەیە بناغەی خێزانەكەی دامەزراند، چونكە خێزان لە پرۆسەی ئەودا زۆر جێگای بایەخە و پایەی سەرەكی ژیانە و ئەگەر سازبوو كۆمەڵگە ساز دەبێت... دایكی چاك و خواناس وەكو درەختی چاك وایە، لەسایەیدا نەوەكان گەشەدەكەن و

سۆز و خۆشەویستی فێر دەبن و بەرهەمی چاك دەگرن. سووربوونی لەسەر هەڵبژاردنی هاوسەرێکی دیندار یەکەم جێبەجێکردنی کردەیی، هاوسەر بەلای ئەوەوە ئەو کەسەیە کاریگەریی لەسەر ژیان دروست دەکات.

ئیمام بەننا لەژیانی هاوسەرییدا کەسێکی سەرکەوتوو بووە، هۆکاری سەرکەوتنەکەشی بۆ ئیمان و باوەڕی دامەزراو دەگەڕێتەوە، بۆیە دەڵێت: هەر کەپیاوی باوەڕدار هەبوو هۆکاری سەرکەوتنیش سەرهەڵدەدەن، باوەڕدار لەبەر هێزی باوەڕەکەی بەخوا، پابەندی بەرنامەکەی و دڵسۆزی بانگەوازەکەی دەبێت، بەڕەفتاری جوانی لەسەر پرۆسەی راپەڕینی ئوممەتەکەی کاردەکات و لەناو ماڵ و خزمەکانیدا کەسێکی سەرکەوتوو خزمدۆست دەبێت..

(أحمد)ی کوڕی ئەوەمان بۆ باس دەکات: کە باوکی زۆر سوور بووە کە خزمەکانی هاوسەرەکەی یەك یەك بناسێت و پەیوەندی خزمایەتییان لەگەڵدا بگەیەنێت... بۆیە هەموویانی دەناسی و سەردانیشی دەکردن.

لێرەشەوە پێویستە تێ بگەین کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان چەندە گرنگن و چەندە پێویستە جێبەجێیان بکەین و برەویان پێ بدەین ومناڵانیان پێ ئاشنا بکەین و فێریان بکەین کە ژیان چۆن مومارەسە دەکرێت و چۆن یەکتر دڵخۆش دەکەین.

ئەوەی ئیمام بەننای کردبووە هاوسەرێکی سەرکەوتوو و خۆشەویست لای هاوسەرەکەی، ئەوەبوو کە لەگەڵیدا نەرم و نیان و سنگ فراوان و لەسەرخۆ بوو، لەماڵدا بە هەر هۆیەك دەنگی بەسەر کەسدا بەرز نەدەکردەوە و لە کاروباری ماڵدا هاوکاری هاوسەرەکەی بوو، هەرچەندە زۆر سەرقاڵی کاروباری بانگەواز بوو، زۆر بەوردی دەجوڵایەوە و کارەکانی رێکدەخست و سوور بوو لەسەر سوودی ماڵ و لەکاغەزێکدا پێویستیەکانی دەنووسی و ئامادەی



دەکردن، یان ئەیسپارد بەکەسێك کە ئامادەیان بکات و کەمتەرخەمیی لە دابینکردنی پێویستییەکانی ماڵدا نەدەکرد، لەکاتی خۆیدا دەیکڕین.

بەم ڕەوشتە جوانانەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بوو بە هاوسەرێکی سەرکەوتوو، بەمەش ئیسلامی بەرجەستە دەکرد، بەها و بنەماکانی دەکردە کردار و ڕەفتار، بەمەش لەوپوارەدا شوێن پێی پێغەمبەری بەڕێزی ﷺ هەڵدەگرت کە ڕووخۆش و دەم بەخەندە و دەست بە کۆمەك بووە.

## لەگەڵ منداڵەکانی:

مەبەستی گرنگی ئیمام بەننا لە پەیوەندی لەگەڵ منداڵەکانیدا پابەند بوون بوو بەپەروەردەی کردەییەوە، بۆ بونیادنانی کەسایەتییەکی ڕێك کە لەسەر باوەڕ بەخوا و خۆشویستنی ئەو زاتە و ڕێزگرتنی خۆ و راستگۆیی و سپاردە پارێزیی و نێوان خۆشی و نەرم و نیانی پەروەردە ببن. ئەم بەهایانە لایەنێکی ڕەسەنی بەرنامە پەروەردەییەکەی ئەو بوون، کە لەناو ماڵ و لە دەرەوەیشدا پێیەوە پابەند بوو.

(**سناء**)ی کچی دەربارەی دەڵێت: (نەك هەر هەستمان بەڕەقی نەدەکرد لێی، بەڵکو لەسۆز و بەزەیی و میهرەبانیدا نغرۆی دەکردین، بەجوانترین ناو و جوانترین شێوە بانگی دەکردین، دەگەڕا بەسەرماندا تا دڵنیابێت کەسمان لەخەودا دەرنەکەوتووین.. دەگەڕایەوە ماڵ ئەو شیوەی کە پێشتر بۆی ئامادەکرابوو دەیخوارد، بێ ئەوەی دایکم یان کەسێکی ترمان بێدار بکاتەوە).

ئا لێرەوە تێدەگەین چەندە بەتوانا بووە، کە بەم ڕەوشتە جوانانە مامۆستایی کردوون و کاریگەریی لەسەر هەڵسوکەوتیان دروستکردووە و

توانیویەتی وەکو باوکێکی بەسۆز بەخۆشەویستی و جوان رەفتارکردن ئاراستەیان بکات. کە ئەوە سیفەتی پەروەرشکاری سەرکەوتووە.

(أحمد)ی کوڕی دەڵێت: باوکم تا ئەوپەڕی ئاست میهرەبان بوو، رەچاوی هەستی منالێی دەکردین، زۆر بەتوانا بوو لەوەدا وامان لێبکات گوێڕایەڵی بین بێ ئەوەی پێمان بڵێت.

جگە لەوە لەخەمی پەروەردەی دروستی منالەکانیدا بووە، زۆر بەتەنگ پەروەردەی براو خوشکەکانیشیەوە بوو، لە نامەیەکدا کە بۆ باوکی نوسیبوو ئەوە دەردەکەوێت کە چەندە لە خەمی فێرکردنی (**فاطمە**)ی خوشکیدا بووە دەڵێت: (دەربارەی (**فاطمە**)چەندەم بۆ کرا ئامۆژگاری جوانی دەکەم و بەیارمەتی خوا لەگەڵیدا دەبم خوێندنەوە و نوسینی فێر دەکەم).

ئەوەش شاراوە نیە کە چەندە بایەخی بە لایەنی زانستی کچەکانی داوە ،کە سیانیان بڕوانامەی دکتۆرایان بەدەستهێناوە لە پزیشکی و بازرگانی و ئابووری ماڵدا، ئەوەش لەبەر ئەوەی لەماڵی زانستدۆستی و ئایین پەروەرییدا پێگەیشتن و باوکیان رۆڵی ئافرەتی خواناسی زانای لەکۆمەڵگەدا چاك دەنرخاند و باوەڕی بە دەستبالآیی زانستی و رۆڵی لە ژیانی ئافرەت و لەناو کۆمەڵگەدا هەبوو.

## فێرکردنی کارگوزار:

ئیمام بەننا –رەحمەتی خوای لێ بێت– گرنگی بە فێرکردنی ئەو کچە دەدا کە لایان کارگوزار بوو، بۆ ئەوەش کچە گەورەکەی راسپاردبوو کە فێری خوێندنەوە و نووسین و نوێژی بکات، لە هێنانەدی ئەو یەکسانییەی ئیسلام داوای دەکات جوانترین نموونەی پێشکەش کرد، کە کارگوزار لەماڵدا لەگەڵ منالآن جیاوازی نەکرێت، بۆیە وەکو ئەوان رێزی لێ دەگرت و فەرمانی دەدا کە

هەموویان بەجوانی مامەڵەی بکەن. جارێکیان سزای کچێکی دەدات لەسەر ئەوەی بەشێوەیەکی ناشیاو مامەڵەی لەگەڵ کردووە.

کارگوزار لەماڵی ئەودا جێگەی نوستنی تایبەت بەخۆی هەبوو، هەروەها وەکو منداڵەکانی تاکێکی کانتۆر بۆ جلەکانی تەرخان کرابوو و عەلاگەی هەڵواسینی جل و بەرگی سەربەخۆی هەبوو، خواردن و خواردنەوەو بەرگ و پۆشاکی وەکو ئەوان بوو.

ئەمەش لایەنێکی پرشنگداری ئەدەبی بەننا بوو دەربارەی ئافرەت و بەکرداریش کاریگەریی زۆری هەبووبۆ گۆڕینی باری ئافرەت، کە ئێمە ئەمڕۆ بەروبوومی ئەو هەوڵانە دەچنین و ئاسەواری لەبازاڕ و دام و دەزگاکانی کۆمەڵگە و بەرنامە پەروەردەییەکان و لەهزری بیرمەنداندا دەبینین، کە بووەتە پرۆسەیەکی ژییاری.

رەحمەتی خوای لەسەر بێت کە دەیویست ئافرەتان قەلایەکی گەورەی ژیان بن، بەگوێرەی قورئان و سوننەت بە پەروەردەی تاك و دامەزراندنی دام و دەزگا بۆیان هەوڵی دەدا، تا لەسایەی رۆشنایی بەرنامەی ئیسلامدا کاریان ئەنجام بدەن.

فەرموودەی خوای گەورە چەندە بەجێیە کە دەفەرموێت: ﴿من المؤمنين  رجالٌ صدقُوا ما عاهدوا الله عليه فمنهم من قضى نحبه ومنهم من ينتظر وما بدلُوا تبديلاً﴾ **الأحزاب/٢٣.**

واتە:مەردانێکی زۆر هەن لە ئیمانداران راستن لەسەر ئەو پەیمانەی بەخوایان داوە، پێیەوە پابەند بوون و لایان نەداوە لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کردووە و مردووەو هەشیانە چاوەڕوانە، بەهیچ شێوەیەك گۆڕان و لاری رووی تێ نەکردوون. (تەفسیری ئاسان)


ماموستا عمر التلمساني

## لەماڵی پێشەوادا:

(**عمرالتلمساني**) دەربارەی یەکەم گەیشتنی بە ئیمام بەننا لەماڵی خۆیدا دەڵێت: کە چوومە حەوشەکە ماڵێك بوو کەمتر لە ماڵی ئاسایی، وتم: ئایا بەڕێز رابەری گشتی لێرەیە؟

خۆی وەڵامی دایەوەو دەرگای ژوورەکەی کردەوە، ژوورەکە رووناك نەبوو، پەنجەرەیەکی کردەوە کە دەیڕوانی بەسەر کۆڵاندا، سەرنجی کەلوپەلی ژوورەکەمدا، زەویەکە نە فەرش و نەحەسیری لێ رانەخرابوو، چەند کورسییەکی دارین و شتێك کە بەزیادە ناوی کتێبخانەی لێ بنرێت، کە نرخی بە گوێرەی ئەو رۆژە نەدەگەیشتە زیاتر لە دوو ریاڵ. لەو ماڵە سادە و زۆر ساکارەدا رابەری گشتی برایانی موسوڵمان دەژیا (٤٢).

## شەهیدبوونی ئیمام بەننا:

ئیمام بەننا لەرۆژی (١٤) رەبیعی دووەمی ساڵی (١٣٦٨ ك) رێکەوتی (١٢) شوباتی (١٩٤٩ ز) ئەو شەهیدییەی کە هەمیشە نزای دەکرد کە خوای گەورە شایستەی ئەو پلە بەرزەی بکات بوویە بەشی، مامۆستا (جمال البنا) ی برای دەربارەی ئەو کۆستە و کاریگەری لەسەر خێزانەکەیان نوسیوویەتی، دەڵێت: شەهید کردنی ئیمام بەننا گورزێکی سەخت بوو لەخێزانەکەمان کاریگەریی لەسەرمان لاناچێت. راستە کە ئەو –رەحمەتی خوای لێ بێت– شتێکی ماددی بەکەسیان نەدەدا، بەڵام ئەو گەنجینەی شانازی و هیوای ئەوان بوو، ، لەگەڵ

(٤٢) الملهم الموهوب حسن البنّا استاذ الجيل، عمر التلمساني.



هەر یەکە لەتاکەکانی ئەو خێزانەدا هەر لە منالأنەوە تاپیاوان و ژنانیان پەیوەندیەکی ناخی لەقولأیی دەروونیاندا هەبوو، جگە لەو وێنە دراماتیکییە پڕلە تۆقاندنەی بۆ ئەنجامدانی ئەو کۆستە گەورە هێنرایە کایە. .. بۆیە باوکی بەساڵاچوومان هەرگیز وەکو پێش ئەوەی لێنەهاتەوەو دایکیشمان –خوا لێی خۆش بێت– ئەوەی بەسەر هات پێمان وەسف ناکرێت(٤٣).

## ئەمە حەسەن بەننا بوو ئەی بۆچی کوشتیان؟

(**حسن الهضيبي**) دووەم رابەری گشتی بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان دەربارەی ئیمام حەسەن بەننا قسە دەکات و دەڵێت: یەکەمجار لەڕێگای نەمامەکانی دەستییەوە ناسیم، کاتێك دەچوومە شارۆچکەو دێهاتەکان، پۆستەری ئاگادارکردنەوەو رێنماییم دەبینی لەلایەن برایانی موسوڵمان (**الإخوان المسلمون**)ەوە هەڵواسرابوون، کە بانگەشەیان بۆ راستی و هێز و ئازادی دەکرد، وای بۆ دەچووم کە کۆمەڵێك بن گرنگی بە لەبەرکردنی قورئان و چاکەکاریی لەگەڵ هەژاران و مردوو ناشتن بدەن و هاندەر بن بۆ ئەنجامدانی نوێژو و رۆژوو. .. کە ئەمانە ئەو پەڕی پێناسەیەکن بۆ ماناکانی راستی و هێز و ئازادی، بۆیە زۆر بایەخم پێ نەدەدا.

چونکە زۆرن ئەوانەی کە دەخوێننەوە بێ ئەوەی تێبگەن و بێ ئەوەش کردەی پێ بکەن، زۆرینەی ئەوانەش نوێژ دەکەن و رۆژووش دەگرن و حەجیش دەکەن, کەچی ئەو پەرستشانە کاریگەریی لەسەر دەروونیان نییە، چاکە کردن لەگەڵ هەژارانیش زۆر جار لە جێگەی خۆیدا نییە، بۆیە منیش هەولّم نەدا شتێك دەربارەی برایانی موسوڵمان بزانم.

(٤٣) جريدة الشرق الأوسط، ٢٠٠١/٧/١٥.

پاشان ڕۆژێك لەلادێ گەیشتم بە کۆمەڵێك لاو پێشوازییان لێکردم بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی کە هەرزەکاران پێشوازیی گەورەتر لەخۆیانی پێدەکەن، قسەیان بۆ دەکردم، منیش لام سەیر بوو. .. هەرزەکارانێك لەلادێ تەمەنیان هەر بواری شارەزابوونی خوێندنەوەو نووسینی دابێت، کەچی زۆر بەجوانی لەگەڵ گەورەتر لە خۆیاندا دابنیشن، بەئەدەبێکی جوانەوە، بێ زۆر لەخۆکردن، واهەست بکەن کە کەس لەکەس زیاتر نییە و دەربارەی پرسە گرنگەکانی میسر بەجوانترین شێوە ، لە ئاستی لاوێکی خوێندکار و ڕۆشنبیردا بدوێن، دەربارەی پرسە ئایینییەکان وەکو تیگەیشتوویەکی ئازاد کە لە کۆیلەیەتی لاساییکردنەوە دەرباز بووبێت بەرەو گفتوگۆ بکەن، دەربارەی پرسە هەنوکەییەکان کە خەڵکیی بەدووریی لە ئایینیان دەزانن، بەئاگاو دەربارەی مێژووی پێغەمبەر ﷺ وردەکاریەکانی بزانن، کە خوێندکارانی زانکۆش نایزانن.

ئەو دیمەنە سەرسامی کردم! پرسیارم لێکردن: ئێوە ئەمانە لەکوێوە فێر بوون؟ وتیان: ئەوان سەر بە برایانی موسوڵمانن و بانگەوازەکەیان هەمە لایەنە و گرنگی بە پەروەردەو ڕەوشت و سیاسەت و ئابووری و چاکسازیی خێزان و هەموو کاروبارێکی گرنگ و پەیوەندیدار دەدات.

لەوکاتەوە کەوتمە بەدواداچوونی بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان، دەستم دایە خوێندنەوەی نوسراوەکانیان و پەیوەندیم پێوە دەکردن، بێ ئەوەی مامۆستای ئەو بانگەوازە بناسم ،تەنیا لە ڕێگای دەست نەمامەکانییەوە نەبێت.

ڕۆژێك لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێیانم لەکەناری نیل، لەپیاسەیەکی عەسرانەدا کۆمەڵێك دیدەوانمان بینی، پرسیارمان لێکردن کە: کاریان چییە؟ وەڵامیان دایەوە، مامۆستا حەسەن بەننا لەئاهەنگێکی شەوانەدا لێرە وتارێك پێشکەش



دەكات. ئێمەش بڕیارمان دا ئامادەی ئاهەنگەكە ببین تا گوێ بیستی بین. ئەوسا هات و دەستی بەوتارەكەی كرد چاومان پیایدا هەڵواسرابوو، نەمانتوانی خۆمانی لێ بدزینەوە. سوێند بەخوا وام دەبینی كە خەرمانەیەك لەنوور یان موگناتیزێك لەڕوویدا بۆ لای خۆی كێشمان دەكات. یەك كاتژمێر و چل خولەك وتاریدا، كەچی لەناخماندا دەترساین لەوەی واز لە قسەكردن بێنێت و ئەم ساتە پڕ لە تام و چێژانە كۆتایی بێن.

وتەكانی لەدڵ دەردەچوون و لەدڵان جێگیر دەبوون، وەكو قسەكەرێك نییەتی بۆ خوابوونی هێنا بێت. لەیادم نیە گوێم لەوتارخوێنێك گرتبێت ئاواتم نەخواستبێت لەنزیكترین كاتدا كۆتایی پێ بهێنێت. بەلآم ئەو بە پێچەوانەوە وەكو جۆگە ئاوێكی ساز و ئارام و گونجاو بێ زیادە ڕەوی و بێ كەمتەرخەمی، لەگەڵ هەستدا دەدوا و.. گڕی تێ بەردەدا، لەگەڵ دڵدا دەدوا و.. پڕی دەكرد لە ئیمان، لەگەڵ مێشكدا دەدوا و..پڕی دەكرد لەزانیاری جۆراوجۆر.

ماوەیەكی زۆر گوزەرا بێ ئەوەی پێی بگەم، كە پێی گەیشتم دەریایەك بوو لە بێ فیزیی و ئەدەب و رەسەنایەتی و زانست و زیرەكیی كەم وێنە، عەقلێكی فراوانی هەبوو بایەخی بەهەموو كاروبارەكان. بە گەورە و بچووكیان دەدا، هیوا و ئاواتەكانی بەرین و گەورە بوون، هەموو ئەمانەی بەگیانێكی ئایینداری ژیرانەوە، دوور لەدەمارگیری و هەڵەشەیی ئاوێتە كردبوو. بەو شێوەیە بینیم كە خۆی بەتەنیا ئوممەتێكی مامناوەندی هەڵبژێرراوە: **وكذلك جعلناكم أمةً وسطًا** **البقرة/١٤٣**.

بەراستی خوا پێداو بوو... پاش ئەوەی پێی گەیشتم و لەگەڵیدا ژیام ئەنجا ناسیم، سوێند بەخوا وشەیەكم لێ نەبیست و جوڵەیەكم لێ نەدی كە لەنرخ یان ئاینداری كەسێك كەم بكاتەوە، تاكو ئەوانەش كە ئازاریان دەدا و بە بەناڕەوا

هێرشیان دەکردە سەرکەسایەتی و ئایینداریی ئەو، لەو سنوورەدا دەوەستا کە خوا فەرمانی پێدابوو.

ئەمە ئەو حەسەن بەننایە بوو کە کوشتیان، لێهاتووترین بانگخوازیان شەهیدکرد، کە چەندین سەدەیە سەر زەوی پیاوی وای بەخۆیەوە نەدیبوو، ئێستا ئەو نەمامانەی بە هۆیانەوە ئەوم ناسی گەورەبوون و پێگەیشتوون. .. بانگەوازەکەی لە دڵەکاندا جێگیر بوو و شاگردەکانی خەڵکیان فێری ئەو شتانە کرد کە لەوەوە فێر بوو بوون، تا دەهات ژمارەیان زۆر دەبوو، بەسەر سەختی و ناڕەحەتییەکانی ژیاندا زاڵ دەبوون.. ئێستاش لەوکاتە بەهێزترن و لەکاروباری ژیان شارەزاتر و لەسەر ستەمکاری ستەمکاران ئارامگرترن، ئەوەیان زانیوە کە ناحەزانی بانگەوازەکەیان لە یارمەتیدەرانی زۆرترن، بۆیە خۆیانیان بۆ ئارامگرتن بۆ خەباتێکی دوور و درێژ ئامادە کردووە.

ئێستاش لە میسرو وڵاتانی ئیسلامدا وشەی برایانی موسوڵمان تەنیا ناو نیە بۆ ڕێکخراوێك بەڵکو ناونیشانی رابوونی ئیسلامیی و بوژاندنەوەو گەشەسەندنیەتی لە ئۆقیانوسەوە بۆ ئۆقیانوس. ناوی برایان لە ئەندەنوسیا و پاکستان و سەرجەم وڵاتانی عەرەبیدا هەیە و بانگەوازەکەیان بووەتە ترس و بیم بۆ داگیر کەران و هاوکارانیان و هەروەها بۆ دووڕووان و ستەمکاران، چونکە ستەم و ناحەقیی لەهەرکوێ هەبێت لەهەق دەترسێت.

## دوایین گەیشتن بە پێشەوای شەهید:

کاتژمێر یازدەی ئێوارە بوو زەنگ لێیدا و دەرگام کردەوە, مامۆستا حەسەن بەننا هاتە ژوورەوە، تاکو دوایین هەواڵی دانوستانی لەگەڵ حکومەتدا بهێنێت بۆم، نەمدەزانی من بۆچی لەسەرخۆم نەبووم و بۆچی سنگم توند بوو؟ بۆچی وشەی کوشتن بەسەر زمانمدا هات؟!



هەستم کرد ئەم پیاوە دەکوژرێت، دەستێکی چەپەڵی خیانەتکار لێی دێتە دەست. چونکە حکومەت چی رێگەی لێ دەگریت پیاوێك بکوژێت کە جگە لەچەکی باوەڕ هیچی تری پێ نیە؟

ویستی بڕوات و منیش تەوقەم لەگەڵ کرد، نازانم چۆن بوو دەستم لە ملی ئالآندو ماچم کرد؟ توانای شاردنەوەی فرمێسکەکانم نەبوو. بەڵام ئەو زەدەخەنەیەکی کرد –خوا لێی خۆش بێت– ئایەتی ﴿قُلْ لن يصيبنا إلا ما كتب الله لنا﴾ (التوبة/٥١)ی خوێند.

رۆیشت و تاریکی شەو شاردییەوە بۆ رۆژی دوایی تاریکی ستەم ونی کرد. .

بەڵێ، حکومەتی میسری لە (١٢) شوباتی (١٩٤٩ز)دا هاووڵاتییەکی میسری کوشت، کەناوی (حەسەن بەننا) بوو. پەیمانیشی دابوو ئەوتاوانە پەردە پۆش بکات، نەك هەر ئەوە بەڵکو خەڵاتی بکوژەکەیشی کرد[٤٤] !!

ئەی بۆچی کوشتیان؟ ! دەڵێن کوشتوویانە چونکە شاندێکی تۆقێنەری پێکهێناوە تا کودەتا بکات بەسەر حکومەتدا و خراپە و ئاژاوە لەوڵاتدا بڵاو بکاتەوە !! ﴿إني أخاف أنْ يبدلَ دينكُم أو أنْ يظهر في الأرض الفَساد﴾ غافر/٢٦.

بەڕاستی کوشتیان چونکە لە جیهانی ئیسلامییدا بوو بووە کەسایەتییەکی ناودار و کاریگەری دڵسۆز، ئەگەر خۆیانی لێ رزگار نەکەن ناتوانن جڵەوی کاروباری ناوچەکە بگرنە دەست و بەمەیلی خۆیان دابەشی بکەن و بەرژەوەندی خۆیانی تێدا جێبەجێ بکەن[٤٥].

---

(٤٤) حسن الهضيبي، حياته و آثاره، عبدالحكيم الكناني.

(٤٥) حسن الهضيبي، مجلة الدعوة –(شباط ٢٠٠٠م).

## مامۆستای نەوەكان:

**هەروەها** رابەری گشتی برایان مامۆستا (**عمر التلمساني**) باسی شەهیدكردنی مامۆستا حەسەن بەننا لە ژێر ناونیشانی مامۆستای نەوەكاندا دەكات و دەڵێت: حەزمان لە بانگەواز بۆ ئایینی خوا بەشێوەیەك بوو وەكو لە زەمانی خەلیفەكانی راشدیندا بین، موسوڵمانان بانگەوازی لەوچەشنەیان نەدیبوو. براكان تەنیا بۆ بەجێهێنانی ئەركەكان كێبەركێ و پێشبڕكێیان دەكرد، نەك لەبەر ئەوەی لەكاتەكان زۆرترن و بەس، بەڵكو كێبەڕكێی ئەوەیان دەكرد كە زیاتر لەوە جێبەجێ بكەن كە داوایان لێكرابوو... ئەمەش لەبەر خۆشەویستی كاركردن بوو بۆ خوا–ئەوانیش داوای شتێكیان لێ نەدەكرا، ئەگەر پاك و بێگەرد بۆ خوا نەبوایە– **هەروەها** لەبەر بەدەستهێنانی رەزامەندی رابەرەكەیان كە دڵخۆشكردنی مامۆستا و رابەر كارێكی چاكە و **هۆی** نزیكبوونەوەیە لە خوا و خوایش ئەو فەرمانە دەكات ﴿**يأيها الذين آمنوا أطيعوا الله وأطيعوا الرسولَ وأولي الأمر منكُم**﴾ **النساء**/٥٩، واتە: ئەی باوەڕداران گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر و كاربەدەستانتان بن. . رابەریش بەوە رازی دەبوو كە تەنیا و تەنها بۆ خوا بكرایە و هەر ئەوەشی لێ داوا دەكردن.

بۆیە ئەگەر برایەك لەلایەن رابەرەوە بنێررایە بۆ سەردانی برایەك لەشارێك یان گوندێك، ئەو برایە تەنیا بەو سەردانە كۆڵی نەدەدا، بەڵكو زیاتر لە سەردانێك وچەند كۆڕو كاری تریشی پێ بكرایە ئەنجامی دەداو لەوكارانەیدا بانگەوازی خوایی دەگەیاند، تا بەسەرنجامێك بگەڕایەتەوە كە هۆی رەزامەندی خوا و دڵخۆشی و بەختەوەركردنی مامۆستای رابەر بوایە، هەریەكە لە ئێمەش چەندی پێ بكرایە سوور بوو لەسەر ئەوەی بەرازیكردنی خوا دڵی رابەر خۆش بكات.



کاتێ برایەکی دەنارد ئابوونەی ناوچەیەك کۆبکاتەوە، ئەو برایە بازنەی کارەکەی فراوان دەکرد تاکو زیاتر لەو کارە ئەنجام بدات کە پێی سپێررابوو، هەر چەندە هەوڵ و کۆششی زۆری بویستایە.

هەندێك لە برایان لەگیرفانی خۆیان خەرجی سەفەرەکانیان دەکرد و تەنیا قرشێك پارەیان لە کۆمەڵ داوا نەدەکرد و نەدەویست.

مامۆستای رابەر ئەگەر دیارییەکی پێشکەش بەیەکێکمان بکردایە، ئەو کەسە ئەو دیارییەی پێشکەش بە کەسێکی تر دەکرد، بەو شێوەیە دەستاو دەستی دەکرد جاری واهەبوو دەگەیشتەوە دەستی بەخشیاری یەکەم. شتی لەم جۆرە چەندین جار بەتایبەتی لە بەندیخانەدا بەهەمان هەست و خۆشەویستییەوە رووی دەدا.

ئەمانە نهێنییەکانی هێز و پێشکەوتنمان بوون و ئێستا کەم بوونەتەوە، تا نەگەڕێینەوە بۆ ئەو هەست و نەست و بەخشین و خۆشەویستییە، ئەو دامەزراویی و هێز و پێشکەوتنەمان دەست ناکەوێتەوە.

ئەو سۆز و لێبوردەییەش خوای گەورە بەدڵانێکی دەبەخشێت خاوێن و لێبڕاو و بێگەرد بن و تەنها لەخوای گەورە خوازیاری ئەو هەڵبژاردەییە بن.

ئەم سۆز و خۆشەویستییەی نێوان برایانی موسوڵمان لای خەڵك جێگای سەرسوڕمان و لەسەر وەستان بوو، کە ئەگەر برایەك نەخۆش بکەوتایە براکانی تر سەریان لێ دەدا، چونکە ئەوە سوننەتێکی پێغەمبەربووﷺ، بۆیە برایان بەوردی و جوانی جێبەجێیان دەکرد، ئەگەر برایەك وەفاتی بکردایە رێو رەسمی جەنازەکەی دیمەنێکی وەفادارییی بوو، خۆ ئەگەر برایەك هاوسەرگیریی بکردایە زۆرێك لەبرایان بۆ پیرۆزبایی و هاوکاری و یارمەتی ئامادە دەبوون.

حەسەن بەننا فێری کردین چۆن بە جوانترین شێوە ئەرکی سەرشانمان ئەنجام بدەین، بۆیە هەر برایەك لەناوچەکەی خۆیدا دەبوویە نموونەی جوانکاری و جوان رەفتاری، لەکارەکەیدا دەبوویە جێگەی متمانە و دڵسۆزی و، دەوری دەدرا و سوودی لێ وەردەگیرا، بەراستگۆ و سپاردە پارێز و خاوەن حیکمەتیان دەناسی و متمانەیان پێ دەکرد، با ئەوانەی دەوریان دەدا لە برایانیش نەبوونایە: هەستیان بە لایەنگیری و دەمارگیری نەدەکرد، چونکە دەیانزانی ئەو هەڵەکانیان دادەپۆشێت و نهێنییەکانیان دەپارێزێت و لەهەڵەشەییەکانیان چاوپۆشی دەکات.

ئەمە نەك هەر خەڵکان بەگشتی، بەڵکو بەرپرسی دەزگاکانی ئەو ناوچەیەش بەچاوی گەورەیی و رێزەوە سەیریان دەکردن، چونکە ئەوە دەرکەوتبوو کە شاگردانی حەسەن بەننا شیاوی لەوە زیاتریشن.

خاوەن کارێکی گەورە لە ئاهەنگێکی قوتابیاندا لە ئەسکەندەرییە راشکاوانە وتی: هۆکاری جێگیربوون و سەرکەوتنی دام و دەزگاکانمان دوای کۆمەکی خوا دەگەڕێتەوە بۆ دڵسۆزیی برایانی موسوڵمان، چونکە زۆرینەی کارمەندەکانمان لەوانن– ئەمە لە رۆژنامەی ئەو کاتەدا بڵاوکرایەوە–.

لەساڵی (١٩٧١ ز) لەگەڵ خزمێکم چووین بۆ سەردانی سەرۆکی (ئیدارەی نوێنەرایەتی) چونکە دەزگاکانی (عبدالناصر) لەریزی ئەو کەسانەدا دایاننابووم کە گومانیان لێدەکرێت و نامەیەکی ئاگاداركردنەوەیان پێدام، تاکو نیوەشەو بیبەم لەسەربازگە واژوو بکرێت، ئەوەش بەو مەبەستەی لەوکاتەدا خەو لەوان تێکبدەم و بەگژمدا بێن، پیاوانی ئاسایشی وڵات بەو چەشنە مامەڵەیان دەکرد، خزمەکەم زۆری لێکردم کە بەیانی بچم و لەگەڵم بێت تاکو هەواڵ بداتە سەرۆکی (ئیدارەی نوێنەرایەتی) –کە دۆستی بوو– کە ئەو شێوازە لە کارکردن



بەگوێرەی ڕێنمایی ئەنجومەنی دەوڵەت، یاسایی نیە، ئەویش ئەو ئاگادارکردنەوەیەی پووچەڵ کردەوە.

ئەم ئاگادارکردنەوەیە ئەگەر چی لە رووکەشدا کارێکی ناخۆش بوو، بەڵام لەناوەڕۆکدا رووداوێکی بەسوود و بەخششێکی خوایی بوو دوای دەرچوونم لە بەندیخانە، لەدەیان ئاگادارکردنەوە و بانگکردنی لەو جۆرە پاراستمی.

لەگێڕانەوەی ئەم روداوەدا ئەمەم مەبست نەبوو، بەڵکو مەبەستم ئەوەبوو، لەکاتی ئەم رووداوە و کاتی بونمان لە نووسینگەی سەرۆکی نوێنەرایەتی، بینیمان کە یەکێك لەفەرمانبەرانی نووسینگەکە تورەبوو بوو، داوای گۆڕینی کارگوزارەکەی بەردەستی دەکرد، کە سەرۆکی نووسینگەکە لە هۆکاری ئەو داوایەی پرسی، فەرمانبەرەکە وتی: چونکە کارگوزارەکە ئامادە نیە جگەرە و رۆژنامە و پێویستییە تایبەتیەکانی بۆ ئامادە بکات، بە بیانووی ئەوەی ئەو مووچەی ئەوە وەردەگرێت کە کاری خزمەتگوزاریی نووسینگەکە بکات، نەك خزمەتکاریی فەرمانبەر.

سەرۆکی نوێنەرایەتی، پیاوێکی ماقوڵ بوو بەفەرمانبەرەکەی وت: بەسەر چاو هەر ئێستا کەسێکی ترت بۆ دیاری دەکەین، من دەمێکە بەشوێن کەسێکی وەکو ئەو کارگوزارەی لای تۆدا دەگەڕێم، کە ئەرکی خۆی بزانێت و رێزی خۆیشی بپارێزێت و بچووکی پیشەکەی لەکەسایەتی کەم نەکاتەوە.

منیش دەمویست هۆکاری ئەم دەروون بەرزییە بزانم، بۆیە لە کارگوزارەکە نزیك بوومەوە، تا سڵاوی لێ بکەم و بیناسم، بۆم دەرکەوت لە کۆمەڵی برایانی موسوڵمانە. پرسیارم لە هۆکاری ئەو مامەڵە دروستەی کرد، پێی وتم: حەسەن بەننا فێری کردووم رێز لەبەرپرسەکانم بگرم و ئەرکەکانم بەجوانی و لێهاتووانە ئەنجام بدەم و رێز لە خۆیشم بگرم، کاری ناشایستە ئەنجام نەدەم.

ئا بەم شێوەیە حەسەن بەننا برایانی موسوڵمانی پەروەردە دەکرد و رایدەهێنان، رێز لەهەموو کەس بگرن و لەگەڵ گەورە و بچووکدا بەئاکاری شیاو مامەڵە بکەن و لەبەردەم بەرپرس و کاربەدەستاندا نەچەمێنەوە و بەسەر خواری خۆشیاندا خۆیان گەورە نیشان نەدەن.

ئەمە شێوازێکە لەرەوشت و ئاکار، ئەگەر موسوڵمانان رەفتاری پێ بکەن زۆر شتی ناساز و ناشیاوی ئەم سەردەمە چاك دەبێت.

ئەم شێوازە حەسەن بەننا داینەهێناوە، بەڵکو لەئایینی خواوە وەری گرتووە و ئەوانی پێ گۆش کردووە و لەسەری رایهێناون و خۆشەویستی کردووە لایان، تاکو بووەتە ئاکاریان. .. ئەم کارانەش ئەوەی پێ بەخشین کە لە رێبازی بانگەوازدا بۆ لای خوا، خوا ویست و ئارامگربن.

بەراستی ئەو کەسایەتییە مامۆستای بێ هاوتای نەوەکانە, مامۆستایانە لەهەموو شتێکدا..

کاتێك پیلانی خاچپەرستان و (**مصطفى كمال**) سەری گرت و خەلافەتی ئیسلامیی وەلاخرا موسوڵمانان پەرت و بڵاو بوون و هەر وڵاتێکی ئیسلامیی بوویە چەند نەتەوەیەکی دیاریکراو, پاشا یان سەرۆکێکی بەکرێگیراو فەرمانڕەوایی دەکردن، ئەویش ئایینی بەدنیا گۆڕیەوە بێدینی بەجەستەی ژیاندا شۆڕبووەوە، ژنانی میسر بەرگی شەرمیان بەهۆی سەرکردەی لێهاتوو (**سعد زغلول**)ەوە فڕێدا !! چونکە خۆی و وەزیرەکانی ئەو سەردەمە لە سالۆنی شازادە نازلیدا پەروەردە کرابوون.

کاتێك پێچەوانەکردنی ئاراستە ئیسلامییەکان بەشێوەیەکی ترسناك پەرەی سەند موسوڵمانی هۆشیار هەستی بەدەردی سنوور بەزاندن بەناوی عەلمانیەت و نەتەوە پەرستی و نیشتیمان پەروەرییەوە کرد، کە خۆی دەکرد بەهەموو



کون و قوژبنێکدا، مامۆستا و قوتابیانی ئەزهەریش بە بێ دەنگی سەیریان دەکرد وەکو پەیوەندی بەوانەوە نەبێت، وایان دەزانی ئەوەندە بەسە کە شەوی قەدر بەجبەی رازاوەوە، وەکو تاوس بچن بۆ لای نوێنەری بالای بەریتانی و سلاوی لێ بکەن.

لەکاتێکدا ئەو هەموو ناهەموارییە بەسەر میسردا هاتبوو، هەموو ئەو دەردانە جەستەی کۆمەلگەیان دەخوارد، ئەم لاوە هەلکەوتووەی (دار العلوم) کە پەروەردەی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئەو چاك تێگەیشتووە لە ئایین و شێوزای کارکردن هەلساو هاواری لەموسولمانان کرد: کە لافاوی بێ باوەڕیی دایپۆشین بێدار ببنەوە، کاروبارتان کۆبکەنەوە، دەست بە ئایینەکەتانەوە بگرن، شوێن پێغەمبەرەکەتان بکەون، چونکە بەوە نەبێت رزگار نابین.

ئەم پیاوە راست و لێبڕاو بوو، کارەکەی بێگەرد بۆ خوا بوو، بۆیە لاوان وەلامیان دایەوە و لەدەوری کۆبوونەوە... خوای گەورەش هەمیشە بەرەکەتی خستۆتە کاری لاوان و بەرەکەتیشی تێدەخات. (الله اكبر و لله الحمد) لەهەموولا دەنگی دەدایەوە. برایان لەگەلّ ئەنجامدانی کارەکانیاندا دەیانوت خەلّکیش بەدوایاندا دەیانوتەوە، ئەمە داگیرکاری شپرزە کرد، تەختی بەکرێگیراوی لەرزاند، لەلایەکی تریشەوە بیرو هۆشەکانی هەژاند و هیواکانی زیندووکردەوە و هیمەتەکانی جوولاند و رێگای کارکردنی بەروونی خستە بەرچاو. دنیای بەرەو گۆڕان برد، دوای ئەوەی مزگەوتەکان جگە لە پیرو پەککەوتەکان کەسی بۆ نەدەچوو، پڕ بوو لەلاوانی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو، حەرەمی مزگەوت پڕ بوو، لەحەوشەشدا جێگە نەما، بەدەوری مزگەوتدا لەسەر رۆژنامە و مقەبا نوێژیان دەکرد.

کێ ئەم روناکییەی هێنا؟ مەگەر هەر ئەوە مامۆستایەتییەکی سەرکەوتوانە نییە؟! ئایا لەسەدەی چواردەهەمی کۆچییدا کاری وا بەکەس کراوە؟ هیممەتی ئاوا لە کەس بەدیکراوە؟ بەڵێ، بەراستی مامۆستا بوو. ئەمە لەبەر حیزبایەتی یان دەمارگیری ناڵێین.. بەڵکو واقیعێکە میسر و وڵاتانی تری ئیسلام و ئەوەی تاکەکانی ئەو کۆمەڵە بناسێت هەستی پێ دەکات. ئەوەش لەو رۆژگارەوە کە ئەو شێرە پیاوە بانگی هۆشیارکردنەوە و بێدارکردنەوەی راگەیاند.

## بانگخوازێکی دوور لە سازش:

لەراستیدا ئەو بانگخوازە مامۆستای نەوەکان بوو، چونکە بەبۆنەی ئاراستە پەسەند و بەجێکانییەوە کرێکاران ماناکانی بوونی خۆیانیان زانی و هەستیان بەمافەکانی خۆیان کرد، جوتیاران لەدێهات و کێڵگەکاندا کە ئەو سەردانی دەکردن، لێیەوە فێربوون کە مافیان هەیە، قوتابیان ئەرکی راستەقینەی خۆیانیان زانی و رێگای راستیان گرتە بەر. . لە وتەکانی ئەوەوە تێدەگەیشتن کە بەرامبەر ئەم خاك و نیشتیمانە ئەرکیان لەسەرە و لەبەرامبەریشەوە مافیان هەیە پێویستە بەدەستی بێنن.

ئەوانەش نەك بە چەپڵە و هوتاف کێشان و رێپێوان، بەڵکو بەگۆڕینی ئەو بەرنامەی خوێندنەی کە داگیرکار بۆ پیادەکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆی دایناوە، نەك بۆ سوودو قازانجی خەڵکی وڵات، چونکە ئەو سیستەمەی خوێندن لاوانێك پێشکەش بەوڵات ناکات کە سوودی پێ بگەیەنن و بەرگری لێ بکەن و بیپارێزن بەڵکو کەسانێکی دنیاپەرست و خۆپەرست دێنێتە کایەوە.

داگیرکار هەستی بە ترسناکی لێوەشاوەیی ئەم بانگخوازە کرد، یەکەمجار ویستی بیگرێتە خۆی بۆیە لە باڵیۆزخانەی بەریتانییەوە داوایان لێکرد



موحازەرە لەسەر بابەتی دیموكراسی پێشكەش بكات، لەبەرامبەر پێنج هەزار جونەیهەوە.

تۆ نازانیت ئەو كاتە پێنج هەزار جونەیە چ پارەیەك بوو! ئەم پیاوە لەوەڵامدا وتی: رازیم بەبێ بەرامبەریش و هەر لەسەر دیموكراسیەتیش، كەئێوە داوای دەكەن، بەڵام بەگوێرەی راوبۆچوون و تێگەیشتنی خۆم. وتیان: نەخێر، بەڵكو بەگوێرەی تێگەیشتنی بەریتانیا و هاوپەیمانانی، هەرچەندە لەگەڵ هەموو نەریتێكی باو و كردارێكی چاكدا پێچەوانەش بێت.

پێی ووتن: لێم دووركەونەوە ئێوە رێگاتان ون كردوە و بەهەڵە لەمن تێگەیشتوون!!

كە داگیركار نەیتوانی بیكاتە پاشكۆی خۆی، تاكو بەوهۆیەوە ئەو گەشە ئیسلامییە بوەستێنێت، ئەمجارە شا و داروودەستەكەیان لێ هاندا، ئەوانیش بەدیارچاوی خەڵكەوە بەئاشكرا لە قەرباڵغترین شەقامی قاهیرەدا، دایانە بەر فیشەك... دەوڵەت بەوردی نەخشەی ئەو كارەی كێشابوو. دەوڵەتێك بەشایەكی بچووك و سەرۆك حكومەتێكی كەم نرخ و چەندەها دام و دەزگایەوە، كەوتنە پیلان بۆ كوشتنی پیاوێكی بێ چەك، لەهاووڵاتیانی خۆیان، ئەوەش بۆ رازیكردنی داگیركەرانی وڵات. ..

جەستەی ئیمام بەننا پێشوازی لە حەوت فیشەكی چەپەڵ كرد و لە ئۆتۆمبێلەكەی دابەزی، لاشەی خوێنی لێ دەچۆڕا، خوێنێكی زۆر و بەرێز. لەكۆمەڵی لاوانی موسوڵمانەوە بەتەلەفۆن داوای ئیسعافی كرد، تا بیباتە نەخۆشخانەی (**قصر العيني**). كەچی لەوێش شا فاروق فەرمانی بۆ پزیشكەكان دەركردبوو كە چارەسەی نەكەن...ئەو پزیشكە مرۆڤدۆستانەی هەڵگری پەیامی مرۆڤایەتین!! ئەو پێكراوەیان پشتگوێ خست. تا خوێنەكەی

دڵۆپ دڵۆپ بە بەرچاویانەوەی برژێت. کە هەر دڵۆپێکی نەفرینێکی بۆ شای وڵات فرۆش و پزیشکە ترسنۆکەکانی دەنارد، کە لەبەر خاتری چەند دەرهەمێك، ناپاکییان بەرامبەر پزیشکیی و مرۆڤایەتی کرد. ئەگەر ئەوان ناپاکییان نەکردایە، دەکرا مامۆستای شەهید رزگار بکرایە. بەڵام ویستی خوا وابوو، بەرزترین ئاواتی حەسەن بەننا کە شەهیدی بوو بۆی بێتە دی و مردنی سەربەرزانەی لەڕێگای خوادا، بەقیسمەت بێت. ئەوەی کە خۆی دەیخواست و لاوانی لەسەر داخواستنی پەروەردە دەکرد، ئەوانیش هەموویان دەیانووت: (مردن لە ڕێگای خوادا بەرزترین ئاواتمانە).

جا تو خوا شایانی ئەوە نییە ناوی مامۆستای نەوەکان بێت، ئایا پێشێلکردنی مافی مرۆڤ نییە کە وەکو خۆی نەیناسین یاخود قەردی نەزانین؟ !

بەڵێ ئەو مامۆستای نەوەکان بوو، لەکاتێکدا خەڵکی هەموو سەرقاڵبوون بە مووچە و پێگە و پلە بەرزبوونەوەوە، هەروەها بەحەوانەوە و مۆڵەتی ساڵانەوە. .. هەموو ئەوانە لای حەسەن بەننا جێگای بایەخ نەبوون، بۆ ساتێکیش ئەویان سەرقاڵ نەکرد و لەئامانجی خۆی دووریان نەخستەوە. . جگە لە بانگەواز بۆ ئایینی خواو کارکردنی بەردەوام لەو پێناوەدا هیچی تری لا گرنگ نەبوو.

خۆ ئەگەر پشووی هاوین بهاتایە بارگەی دەپێچایەوە بۆ شارەکانی خوارووی وڵات. لە ئەسوانەوە تێدەکەوت، بەهەموو هۆکارێك بۆ گەیاندنی ئایینی خوا دەگەڕا، گەرما و دووری و سەختی و چیا و دەشت و مار و دووپشك و... هتد ڕێگایان لێ نەبڕییەوە و نەیاندەتوانی ببنە کۆسپ لە نێوان ئەو و بانگەوازدا.

کەمێك خواردنی بەس بوو، ئەگەر بانگەشەی سەر سفرەیەك بکرایە لای ئەوانەوە دادەنیشت کە برسی و ماندوو بوون، چییان بۆ دادەنا، پارچە پارچە

دابەشی دەکرد بەسەر ئەوانەی ئەملاولایدا... خۆی چەند پاروویەکی کەمی بەس بوو.

لەسەر ئەو گەشتە سەختە بەردەوام دەبوو تاکو مانگەکانی پشووی هاوین بەسەر دەچوون، دەگەڕایەوە بۆ **قاهیرە** و گەشتی زستانەی لەرۆژەکانی پشووی هەفتەدا بۆ ناوچەکانی کەناری دەریا دەست پێدەکرد.

ئەوەم لە بیرە کە من و چەند برایەك لەگەڵیدا نوێژی بەیانیمان لەسەر شۆستەی وێستگەی شەمەندەفەری (**طنطا**) ئەنجام دا، لەو کاتەدا باران ورد ورد دەباری و بەوە زۆر دڵخۆش بووین. .

یەکێك لەشتە خۆشەکانی ئەم گەشتە ئەوەبوو، کە براکان هەموویان و مامۆستای خۆشەویستیش ئەو شەوە لەسەر حەسیر بووین ،لە مزگەوتێکدا کە خوالێخۆشبوو (**عبدالحمید پاشای دمیاطی**) دروستی کردبوو. مامۆستا دەیزانی کە من ناتوانم لەسەر حەسیر بخەوم بۆیە داوای لە (**دمیاطی**)یەك کرد کە جێگایەکی تایبەت بۆ من و بۆ دووانی تر لەمامۆستایانی بەتەمەن سازبکات.

پیاوە هەر سێکمانی برد بۆ ژوورێکی خەوتنی زۆر قەشەنگ، کە فەرش و پێخەفەکانی تاکو ئێستا نەمن و نە دوو هاوڕێکەم نەماندیبوو، چونکە هەرسێکمان باری ئابووریمان لەخواری مامناوەندییەوە بوو.

خاوەن ماڵ بەجێی هێشتین بۆ ئەوەی بخەوین، یەکێك لەو دوو بەڕێزە ئاهێکی هەڵکێشاو (**لاحولَ و لاقوّة الاّ بالله**) ێکی وت: پێم وت: چیتە؟ وتی: ئەو هەموو ماڵ و پارەی لەناو ماڵ و کەل و پەل و رازاندنەوەی ئەم ژوورەدا خەرجکراوە چاکتر نەبوو لە ڕێگای بانگەوازی خوادا خەرج بکرێت؟ پێم وت: لەسەر خۆیە. ئێستا تۆ و ئەوانەی لەگەڵتدان لە **قاهیرە** هاتوون بۆ ئێرە بۆ ئەوەی لە ڕێگای خوادا وشەیەك بڵێن. خوای گەورە ویستی لەم ژوورە

قەشەنگەدا رێزمان لێ بنێ و لەم شەوە ساردەدا، لەسەر جێگە و لەناو پێخەفێکدا بخەوین کە نەمن و نەتۆ و نە هاوڕێکەشمان بەخەویش نەماندیوە، ئایا لەسەر ئەمە خاوەنەکەی پاداشت نادرێتەوە؟ مامۆستاکە بێدەنگ بوو، بەڵام وانازانم بێدەگی ڕەزامەندی بوو بێت.

ساڵان گوزەران و دنیا گۆڕا و ئەم مامۆستا بەڕێزە لەناو حکومەتدا پێگەی بەرزی وەرگرت. ڕۆژێك نەخۆش کەوت و منیش چووم بۆ سەردانی، لەژووری خەوتنەکەیدا راکشابوو. .. کەل وپەلی ژوورەکە زۆر گرانبەها بوون، منیش خۆمم پێ نەگیرا، (**لاحولَ و لاقوّة الاّ بالله**) ێکم وت، مامۆستا زۆر زیرەك و وریا بوو لەهەڵوێستەکەم تێگەیشت و بەخێرایی و بەخەیاڵ گەڕایەوە بۆ دەیان ساڵ پێش و وتی: مامۆستا (عمر) بێدەنگ بە، منیش وتم: بەسەرچاو. مامۆستاکەی تریش گەشتە راگرایەتی یەکێك لە کۆلیژەکانی ئەزهەری بەڕێز. خوا هەردوو لایان تەمەن درێژ و سەلامەت بکات و لەگوناهی من و ئەوانیش خۆش بێت...

بەڵێ خەڵك بەو چەشنەن. ... بەناوی ئایینەوە رێگا لەخەڵك دەگرن، تاکو حاڵیان دەگۆڕێت، ئەوکاتە ئەوە ئەنجام دەدەن کە دوێنێ رەخنەیان لێدەگرت، بێگومان خوای گەورە بەو بارودۆخ گۆڕینە حەقیقەتەکان دەخاتە ڕوو...

جا با بگەڕێمەوە سەر باسی مامۆستا حەسەن بەننا کە بەڕاستی مامۆستای نەوەکان بوو. . لاوانی سەردەمی خۆی بە پەروەردەیەکی ئیسلامیی بلّند، لەسە شێوازی پێغەمبەر ﷺ لەڕووی بانگەواز و پەروەردەوە پێگەیاند.

پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەمجار ئایینەکەی بەهەموو خەڵك راگەیاند، ئەمە یەکەمین ئەرکی پێغەمبەر بووﷺ: ﴿**ياأيها الرسولُ بلغْ ما أُنزلَ إليك من ربك وإنْ لم تفْعلْ فَما بلغت رسالته والله يعصمك من الناس**﴾ **المائدة/٦٧**. پاش گەیاندنی پەیامەکە

شوێنکەتووانی لەسەر رادەهێنا و ماناکانی بۆ روون دەکردنەوە، تاکو بیچێژن و بانگەواز لە قۆناغی وتنەوە بەرنە قۆناغی کار.... ئیمام بەننایش بەو شێوەیەی کرد لاوانی بۆ تێگەیشتنێکی روون و شارەزاییەکی ئاشکرا بانگ دەکرد، لەزانیاری و رێسا و سەرچاوەکان حاڵی دەکردن، پاش فێرکردن و شارەزاکردن دەیگواستنەوە بۆ قۆناغی جێبەجێ کردن و گەشەکردن.

ئەمە رێبازی ئیسلامە، راگەیاندن، پابەندبوون، پاشان جێبەجێکردن. ئەوانەی ئەمڕۆ دەڵێن: یەکەمجار با کۆمەڵگە چاکسازیی بکرێت پاش ئەوەش شەرعی خوا جێبەجێبکرێت، من دڵنیام لەوەی ئەوانە باوەڕیان بەراستی قسەکانی خۆیان نییە، پێیان وتراوە: وابڵێین، ئەوانیش بەزمان دەیڵێن و بە پێنووسەکانیان دەینووسن، ئەگینا دەبێ ئەوە روون بکەنەوە کۆمەڵگە چۆن چاك دەکرێت، لەسەر چ بناغەیەك ئەو چاکسازییە ئەنجام دەدرێت بەپێی چ بەرنامەیەك و بە چ شێوازێك دەبێت دابڕێژرێت؟ ئەگەر چاکسازیی یەکەم بە گوێرەی ئاراستەکانی ئیسلام نەبێت، مانای وایە داوا دەکرێت خەڵك واز لە شتێك بێنن کە حاڵیان پێی باش بووە، کە ئەوە هەرگیز روونادات. خۆ ئەگەر ئەو چاکسازییە بەپێی رێساکانی ئیسلام بێت ئەوا ئەمە رێبازەکەیەتی و ئەگەر وانەکرێت حاڵی کۆمەڵگە چاکسازیی ناکرێت. چاکسازیی لەسەر بنەمای شەرعی خوا بەم جۆرەیە. بانگەواز بۆ ئیسلام و شارەزابوون لێی، پاشان پەروەردەکردنی تاکەکان بە گوێرەی، ئینجا جێبەجێکردنی خواست و داواکاری و فەرمانەکانی لە ژیاندا. ئەمە ئەو رێگا دروستە بوو، کە ئەو کەسایەتییە لەگەڵ لاواندا گرتییە پێش و لەکارەیدا چاوی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد [٤٦].

---

(٤٦) أستاذ الجيل، عمر التلمساني.

# پرسەکانی بیروباوەڕ لەپەیامەکانی ئیمامدا

## یەکەم: بیروباوەڕ بناغەی بونیاتنانە:

بیروباوەڕ لەهزری برایان و بانگەوازەکەشیاندا، سەری هەموو کاروبارێك و بناغەی بونیادنانی گیانی ئاییندارییە.

ئیسلام بیروباروەڕێکە شەریعەتی لەسەر دەوەستێت و رەوشت و کردەوەکان لەوەوە هەڵدەگۆزرێن و کۆمەڵگە لەوەو یاسا و رێساکانی وەردەگرێت، حکومەت بەو یاسانە فەرمانڕەوایی دەکات. بیروباوەڕ لە قورئان و سوننەتدا بە(ئیمان) ناوزەد کراوە و شەریعەت و پەرستشیش بەکردەوە تەعبیری لێدراوە. کردەوە بە بێ باوەڕ قبوڵ نییە و باوەڕی بێ کردەوەش سوودی نییە.

ئیمام بەننا هەر لەسەرتای بانگەوازەکەیەوە گرنگی بە بونیادنانی باوەڕدا، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ سیازدە ساڵی رەبەق لەماوەی بانگەوازی مەککەدا رەگەکانی باوەڕێ دەچەقاند و پایەکانی ئەوی لەدڵ و مێشکدا بەهێز دەکرد و راستییەکانی یەکخواناسی و پەرستشی ئەو بەتەنیا و دوورکەوتنەوە لە (**طاغوت**)ی روون دەکردەوە.. بەدوای ئەوانەدا پایەکانی رەوشت جوانیی و ئاکارباشی لەناخ و مێشکدا دادەمەزراند.

ئەو دروشمانەی برایان بەرزیان کردەوە، بریتی بوون لە: (خوا مەبەستمانە، قورئان یاسامانە، پێغەمبەر پێشەوامانە، خەباتکردن رێبازمانە). هوتافیشیان (**الله أكبر و لله الحمد**) بوو.

پرۆگرامی پەروەردەیی کۆمەڵی برایان لەسەر ئەوە دامەزرا، کە باوەڕ پایەی دامەزراو و قەڵای پارێزراوە و، لایەنی بۆ خوابوون لەپێش هەموو لایەنەکانەوەیە، باوەڕ رەگی سەرەکی رەزامەندی خوا و بناغەی بەدیهێنانی مەبەستە گەورەکانە.



ئیمام بەننا دەربارەی بیرو باوەڕ پەیامێکی بەناوی (**العقائد**) نووسیوە و، کەم لەنووسەرانی برایان هەیە لەبارەی بیروباوەڕەوە نەینوسێیبێت [٤٧].

## دووەم: برایان چۆن بیروباوەڕ پێشکەش دەکەن:

برایان نایانەوێت باسکردنی بیروباوەڕ و پێشکەش کردنی چەند وشەیەك بێت لەبەر بکرێت و بوترێتەوە، هەروەکو نایانەوێت مشت و مڕبێت لەگەڵ خەڵکی تردا، بەڵکو دەیانەوێت راستییەك بێت لای عەقڵیان سەلما و و لە دڵیاندا دامەزراو بێت و کار لەهەستیان بکات و ویستیان بجولێنێت و کاریگەری لەسەر ژیانیان دروست بکات و ئاسەواری دیار بێت.

قورئانی پیرۆز کە باس لە باوەڕ دەکات بە کۆمەڵێك رەوشت و کردەوەی ئاشکرا و پەنهانی بەرجەستەی دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**إنما المؤمنونَ الذين إذَا ذُكر الله وجِلت قُلوبهم وإذَا تليت عليهم آياته زادتهم إ اَنًا وعلى ربهم يتوكلُونَ(٢)الذين يقيمونَ الصلاةَ ومما رزقْناهم ينفقُونَ(٣)أولئك هم المؤمنونَ حقا لهم درجات عند ربهم ومغفرةٌ ورزق كر (٤)**﴾ **الأنفال**/٢-٤.

واتە: باوەڕدارانی راستەقینە ئەوانەن کە:

١-بەناوبردنی خوا دڵەکانیان دەهەژێت و دادەچڵەکێت.

٢-کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئەویان بەسەردا خوێنرایەوە باوەڕیان بتەوتر و دامەزراوتر دەبێت.

٣- لەهەموو کاروبارێکدا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

٤-ئەوانەن کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و ئاسەواری لەهەموو ژیانیاندا هەیە.

---

(٤٧) الإخوان المسلمون ٧٠ عاماً، يوسف القرظاوي، ص٣١٦.

٥– لەو شتانەی پێمان بەخشیون دەبەخشن.

ئا ئەوانەن باوەڕدارانی راستەقینە، لەلای پەروەردگاریان لێبوردن و رۆزی بەچێژ و رازاوەیان پێشکەش دەکرێت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**قد أفْلح المؤمنونَ(١)الذين هم في صلاتهم خاشعونَ(٢)والذين هم عن اللغو معرضونَ (٣) والذين هم للزكاة فَاعلُونَ (٤) والذين هم لفُروجِهم حافظُونَ (٥)**﴾ **المؤمنون**/١–٥.

واتە: بەراستی ئەو باوەڕدارانە سەرفراز و سەرکەوتوون:

١–ئەوانەی کە لەنوێژەکانیاندا بەئاگا و ئارام و دڵدامەزراون. ..

٢–ئەوانەی کە لەگوفتاری بێ سوود رەفتاری نابەجێ دوورە پەرێزن.

٣–ئەوانەی کە جێبەجێکاری زەکاتن، کە بێگومان زەکات تەنیا بۆ ماڵ نییە، بەڵکو بۆ خاوێن کردنی ماڵ و هەموو لایەنەکانی تریشە.

٤–وە ئەوانەش کە پارێزەری داوێنیانن.

سەیر دەکەین باوەڕ ئاوێتەی بوون و چالاکییەکانی مرۆڤە لەبوارە جۆراو جۆرەکانی ژیاندا.

## سێیەم: بیروباوەڕ لەبیست بناغەکەدا (الأصول العشرين):

لە پەیامی (**التعاليم**) دا کە پەیامێکی کورتی ئیمام بەننایە و ئاراستەی برایانی کردووە، بەو ئومێدەی کە تەنها بۆ زانیاری، یان تەنها بۆ لەبەرکردن نەبێت، بەڵکو جێبەجێ بکرێت.

لەو پەیامەدا دیدی برایان بەرامبەر چەمکە سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلام و دەربارەی بیروباوەڕیش روون کراوەتەوە، هەندێ شتی پێویستی تێدایە پەیوەندییان بەباسەکەمانەوە هەیە، هەندێکیان ئاماژە پێدەکەین.

هەموو تاکێك لەوتەکانی وەردەگیرێت و لێیشی وەلادەنرێت، جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەگوناه و هەڵە بەدووره. ئەوەش لەپێشینە چاك و دیندارەکان وەرگیراوە کە لەگەڵ قورئان و سوننەتدا گونجاو و رێکە وەری دەگرین، ئەگەر نا قورئان و سوننەت بۆ گوێڕایەڵی و شوێنکەوتن لەپێشترن. . . بەڵام بەتانە لێدان یان بریندار کردن لەسەر رای جیاواز رووبەڕووی کەسەکان نابینەوە و دەیانسپێرین بە نییەتی خۆیان، ئێستا ئەوان ئێرەیان بەجێ هێشتووە و چوون بۆ لای خوای گەورە و ئەوەی کردوویانە دێتەوە رێتان.

هەر موسوڵمانێك نەگەیشتبێتە ئاستی تێگەیشتن و تێڕوانین لەناسینی بەڵگەکانی فەرمانە فەرعییەکاندا، بۆی هەیە شوێن یەکێك لە پێشەواکانی ئایین بکەوێت و باشتریش وایە لەگەڵ ئەو شوێن کەوتنەدا چەند بتوانێت هەوڵ بدات، شارەزای ئەو بەڵگانە بێت کە پێشەواکەی کردوونی بە بەڵگە بۆ هەر فەرمانێك، هەروەها پێویستە رێنوێنی بەڵگەدار قبوڵ بکات لەهەر کەسێك کە بەزانا و خواناسی بزانێت، هەر وەکو ئەگەر خوێندەوار بوو پێویستە هەوڵ بدات ناتەواوییە زانستیەکانی خۆی تەواو بکات تاکو بگاتە پلەی تێگەیشتن و تێڕوانین.

جیاوازی تێگەیشتن لە فەرمانە فەرعییەکاندا نابێتە هۆکاری ناکۆکی لەئاییندارىدا و نابێت ببێتە دوویەرەکی و کینە، چونکە هەموو (مجتهد)ێك پاداشتی خۆی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا رێگا نەگیراوە لەوەی پرسە جیاوازەکان لێکۆڵینەوەی زانستییان لەسەر بکرێت، تا لەسایەی خۆشەویستی و لەخوابووندا بتوانین بگەینە راستی، بێ ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە ببێتە مشتومڕی خراپ و دەمارگیری.

هەر بابەتێك كارێكی لەسەر بونیاد نەنرێت، باسكردن و لێكۆڵینەوە لێی، ئەو خۆڕەتاندنەیە كە لەشەرعدا لێمان قەدەغە كراوە. لەوانە: زۆر لق و پەل كردنەوە لە ئەحكامی ئەو شتانەی هێشتا روویان نەداوە، یان مانای ئایەتێك هێشتا زانست پەی بەماناكەی نەبردووە، یان قسەكردن لەسەر پلەبەندی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و چوونەناو ئەو جیاوازییانەی لە نێوانیاندا گوزەراوە، چونكە هەریەكەیان پلەی هاوەڵێی هەیە و پاداشتی بەپێی نییەتی خۆیەتی، چاك لێكدانەوەی كارەكانیان, یان بێدەنگ بوون بۆ ئێمە چاكترین پەناگەیە.

خوا بە یەكناسین و دووردانانی لە هەموو ناتەواوییەك، بەرزترینی بیروباوەڕەكانی ئیسلامن و ئایەتەكانی قورئان و فەرمووده راستەكان كە باس لەسیفەتەكانی خوا دەكەن و ئەوانەیان كە ئێمە لێیان تێناگەین، چۆن هاتووین بەوشێوە وەریان دەگرین و باوەڕمان پێیان هەیە و لەخۆمانەوە لێكیان نادەینەوە و لەكاریشیان ناخەین و ناچینە سەر ئەو باس و بابەتانەی زانایان لەسەری ناكۆكن، ئەوەندەمان بەسە كە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەسیان بووە.

ئەو بابەتانەی زانایانی شارەزا دەڵێن: باوەڕمان پێیان هەیە و هەموویان لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتوون: ﴿**الراسخونَ في العلم يقُولُونَ آمنا به كُل من عند ربنا**﴾**آل عمران**/٧.

هەموو داهێنراوێك (**بدعة**) لە ئاییندا، كە بناغە و سەرچاوەیەكی نەبێت، خەڵكی بەحەزی خۆیان بەباشیان دانابێت زیاد یان كەمیان كردبێتەوە، رێ ونكردنەو پێویستە نەهێڵرێت و لەناو ببرێت، ئەوەش بە هۆكار و شێوزای گونجاو تا سەرنەكێشێت بۆ چشتێكی خراپتر.

پەرستشە بێ سنوورەکان زیادکردینان یان کەم کردنیان یان پابەندبوون پێیانەوە، ئەمانە جیاوازی فیقهی نێوان زانایانن و هەرەیەکەیان رای خۆی هەیە. هەوڵدان بۆ ساغکردنەوەیان و گەیشتن بەراستی بە بەڵگەی روون و ئاشکرا شتێکی چاکە.

خۆشویستنی پیاوچاکان و رێزگرتن ویەچاك باسکردنیان بەوکردەوە چاکانەی ئەنجامیان داوە هۆی نزیك کەوتنەوەیە لە خوا، ئەولیاش ئەوانەن کە خوا لە قورئاندا باسی فەرموون: ﴿الذين آمنوا وكانوا يتقُونَ﴾ یونس/٦٣. بوونی کەرامەت بۆیان رەوایە، بەڵام بەمەرجە شەرعییەکانی و لەگەڵ باوەڕبوون بەوەی کە ئەوان بۆ خۆیشیان خاوەنی زیان و قازانج نین، چ لە ژیانیانداو، چ لە دوای مردنیان، چ جای ئەوەی شتێك بەکەسێکیتر ببەخشن.

سەردانی گۆڕەکان هی هەر کەس بن، بەو شێوەی شەرع باسی دەکات سوننەتە، بەڵام کۆمەکخواستن لە گۆڕکراوەکان و هانا بردن بۆیان و داواکردنی جێبەجێکردنی پێویستی لێیان، لە دوور یان لە نزیکەوە و نەزرکردن بۆیان و بیناکردنی گۆڕ و داپۆشینی و چرا بۆ دانانی و دەست پیاهێنان و سوێندخواردن بە غەیری خوا و هەر شتێك لەم بابەتانە، پێویستە بەشێوازێکی دانایانە بەرهەڵستی بکرێت و لێکدانەوەی دروستییان بۆ ناکەین، تاکو دەرگا بەروویاندا نەکرێتەوە.

دروستی پاڕانەوە لە خوا بەخاترانەی کەسێك یان شتێك لەدروستکراوەکانی، جیاوازییەکی فەرعییە، چۆنیەتی نزاکردن لەپرسەکانی بیروباوەڕ نییە.

نوشتە و پەت و مووروو رملّ لێدان و چارەنووس زانین و قسەکردن لە زانینی غەیب و هەموو شتێك لەو بابەتانە خراپ و بێ شەرعین، پێویستە نە هێڵرێن. سامەگەر ئایەتێکی قورئان، یان نزایەك بێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ.

باوی هەڵە راستی وتە شەرعییەکان ناگۆڕێت، بەڵکو دەبێت دڵنیا بین لە سنووری ئەو مانایانەی کە مەبەستن لێیان و لەو ئاستەدا بوەستین، هەروەها پێویستە لەهەموو کاروبارێکی ئایینی و دنیاییدا لە خۆخەڵەتاندن و خەڵکی خەڵەتاندن بەدوور بین، چونکە مەبەست لەناونراوەکاندایە نەك لەناوەکاندا.

بیروباوەڕ بناغەی کارکردنە، کاری دڵیش لەکاری ئەندامەکانی جەستە گرنگترە و بەدەستهێنانی تەواویی (الکمال) لە هەردووکیاندا داواکراوی شەرعە.. هەرچەندە ئاستی داواکردنیان جیاواز بێت.

ئیسلام عەقڵ ئازاد دەکات و هانی دەدات لەبوونەوەر بکۆڵێتەوە هەروەها بایەخ بەزانست دەدات و رێزی زانستدۆستان دەگرێت و پێشوازی لەهەموو شتێکی بەسوود دەکات و هەر وەکو پێغەمبەری سەردار ﷺ فەرموویەتی: (حیکمەت و دانایەتی ئەو ونبوویە کە باوەڕدار عەودالّیەتی و لەهەر کوێ دۆزییەوە، ئەو شایستەترین کەسە پێی).

جاری واهەیە تێڕوانینی شەرعی و تێڕوانینی عەقڵی پێکەوە رێك ناکەون، بەڵام لە چشتە یەکلابووەکاندا ناکۆك نین، هەرگیز سەلمێنراوێکی زانستی دژ بە رێسایەکی شەرعی جێگیر نیە، ئەوەی یەکلانەبوەتەوە لەگەڵ یەکلابوەکاندا رێکدەخرێت. ئەگەر هەردوو لایان گومانیی بوون (واتە: یەکلانەبووبوونەوە) ئەوا تێڕوانینە شەرعییەکە پێش دەخرێت، تاکو تێڕوانینە عەقڵییەکە دەسەلمێت، یان هەرەس دێنێت.

موسوڵمانێك کە شایەتومانی دەربڕی و بەگوێرەی کاری کردو فەرزەکانی بەجێ هێنا، ئیتر بەهۆی رایەکەوە یان گوناهێکەوە بەکافری دانانێین، سا مەگەر خۆی دان بەکافری خۆیدا بنێت، یان ئینکاری ئاشکراو ناسراوێکی ئایین بکات یان حوکمێکی ئاشکرای قورئان بەدرۆ دابنێت، یان تەفسیری قورئان

بەشێوەیەك بكات لە شێوازەكانی زمانی عەرەبیدا جێگەیان نەبێتەوە، یان كارێك ئەنجام بدات بەبێ باوەڕیی نەبێت بە هیچی تر لێكنەدرێتەوە[٤٨].

## چوارەم: لەبەردەم جیاوازییە ئایینیەكاندا:

ئوممەتی ئیسلامیی لەم چەند دەساڵانەی دواییەدا بەدەست فرە كۆمەڵەییەوە دانالێنێت، بەتایبەتی لەناوەندی لاواندا، ئەو لاوانەی مەرجەكانی ئیجتیهاد نازانن و نەگەشتوونەتە ئاستی تێڕوانین لەناسینی بەڵگەی فەرمانە فەرعییەكاندا، كە ئیجتیهاد كردن بۆ كەسانێك مەرجەكانیان تیا نەبێت و هۆكارەكانیان لا نەبێت دروست نیە، چونكە ئەوانە ناتونن بگەنە ئەو حوكمەی خوا ویستوویەتی و سەریان لەرێ ونكردن و رێ لەحەرام كەوتنەوە دەردەچێت. هەرشتێكیش مرۆڤ بەرەو حەرام بەرێت حەرامە. ئەوانە پێویستە لەسەریان بە پرسیاركردن لەكەسانی زانا بگەنە حوكمی خوا ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُم لا تَعلَمونَ﴾النحل/٤٣.

هەروەها بانگەشە بۆ قورئان و سوننەت هەندێك لەلاوان بە بارێكی تردا لێی تێ دەگەن، بۆیە دەست دەكەنە هێرش كردنە سەر مەزهەبە ئیسلامییەكان و خاوەنەكانیان و بەلادەر لە رێگای سوننەتیان دادەنێن، جاری واش هەیە هێندە زیادەڕەوی دەكەن هەركەس لەسەر راوبۆچوونی ئەوان نەبێت و رێبازەكەی ئەوان نەگرێت بەكافری دادەنێن. جگە لەوەش هەر كۆمەڵەیەكیان دەمارگیرە بۆ راو وبۆچوونەكانی خۆی، بەوەش هێز و تواناكان لەبوارێكدا تیادەچن كە زیانی زۆرترە لە قازانجی، ئەوەش لەبەر كەم شارەزایی و ناتەواوی تێگەیشتنیان لە ئایین و بەزاندنی سنوور و حوكمەكانی.

---

(٤٨) رسالة (التعاليم)، الإمام حسن البنّا.

نەگبەتی ئوممەتی ئیسلامیی لەم چەرخەدا پەرت بوونی راو بۆچوونەکان و لێکهەڵوەشانی یەکبوونیەتی.... ئایینەکەش وا فەرمان دەکات کە دەرگاکانی ناکۆکی داخەین و دەرگای هاوکاری و خۆشەویستن لەبەر خوا بکەینەوە. ئەمرۆ ئێمە پێویستمان بەیەکخستنی ئوممەت هەیە لەسەر بنەماکانی قورئان و سوننەت، ئەوەش بەوەدەرنانی هۆکارەکانی جیایی و دووبەرەکی، بۆیە پێویستە کاروبارمان پەرت نەکەین بەوەی هەر لایەك تەنها بەشتەکانی خۆی دڵخۆش بێت ﴿**كُل حزبٍ بِما لَديهم فَرحونَ**﴾ الروم/٣٢.

ئەوەشمان لا روون بێت ئیسلام لەگەڵ پەرتی و جیاییدا پیادە نابیت و ئەو فەرمانەمان بۆ جێبەجێ ناکرێت کە دەفەرموێ: ﴿**أنْ أقيموا الدين ولا تتفَرَّقُوا فيه**﴾ الشوری/١٣. واتە: ئایین پیادەبکەن و تیایدا ناکۆك و جیاواز مەبن.

هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا هۆشیاری پێدواین کە نەچینە ریزی ئەوانەی ئایینەکەیانیان پەرت کردوە، دەفەرموێ: ﴿**فَأَقم وجهك للدين حنيفًا فطْرةَ الله التي فَطَر الناس عليها لا تبديلَ لخلْق الله ذَلك الدين القَيم ولَكن أَكْثَر الناس لا يعلَمونَ(٣٠)منيبِين إِلَيه واتقُوه وأَقيموا الصلاةَ ولا تكُونوا من الْمشرِكين (٣١)من الذين فَرقُوا دينهم وكَانوا شيعا كُل حزبٍ بِما لَديهم فَرحونَ(٣٢)**﴾ الروم/ ٣٠ –٣٢.

واتە: بەدڵی پاك و بێگەردەوە روو بکەرە ئایینی خوا و ئەم لاو ئەولا مەکە، ئەوە نەخشەی خوایە کە مرۆڤی لەسەر فەراهەم هێناوە، هیچ جۆرە گۆڕانێك لەنەخشە و دروستکراوی خوادا نییە، ئا ئەوە ئایینی راست و دروستە بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن. بە ملکەچییەوە بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و لێی بترسن و نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و لە هاوبەشکاران مەبن. .. لەوانەی ئایینەکەیان پەرت کردووە و بوونەتە چەندین گرۆ و تاقم، هەر گرۆیەکیش تەنها بەنەخشە و پلانی خۆیان دڵخۆشن. ..



## بانگەوازێك یەكبوونی دەوێت نەك جیایی:

باسێك بەم مانایە لەیەكێك لە پەیامەكانی ئیمام بەننادا دەهێنین، كە دەربارەی راو بۆچوونی جیاواز لە ئاییندا و بەرنامەی بانگەوازی برایان لەبارەیەوە. .. كە ئاراستە كردنێكی جوانی تێدایە بە تایبەتی بۆ لاوان. تیایدا دەڵێت: لەم سەردەمەدا كە جیهانی ئیسلامی رابوونێك بە خۆیەوە دەبینێت، ئەو رابوونە ئەوە دەخوازێت كە بانگخوازان و بایەخداران بە كاری ئیسلامیی و ئایینەی موسوڵمانان وریای بن و جوان ئاراستەی بكەن، تا بەردەوام بوونی مسۆگەر بكەن و لە پیلانی ناحەزان بەدووری بگرن. لەو پەیامەدا دەڵێت:

–خوای گەورە كۆمەكت بێت– بزانە كە بانگەوازی برایان بانگەوازێكی گشتییە، تایبەت نییە بە كۆمەڵێك و لانادا بەلای رایەكی تایبەتدا، كە خەڵكی پێشتر بە شێوازێك ناسیبێتیان و، پابەند و هەواداری هیچ لایەك نییە. هەڵقوڵاوی ناوجەرگە و كرۆكی ئایینە، دەمانەوێت راو و بۆچوون و هەوڵەكان یەكبخەین، تاكو كارەكە بەهێزتر و بەرهەمەكەشی چاكتر و زیاتر بێت.

ئەم بانگەوازە لەگەڵ راستییدایە لەهەركوێ بێت، كۆدەنگی دەخوازێت و لاڕێی بەلایەوە سەختەو گەورەترین نەهامەتی موسوڵمانانیش دووبەرەكی و ناكۆكییانە و بناغەی سەركەوتنیان خۆشەویستی و یەكبوونیانە، كۆتایی ئەم ئوممەتەش بەوە چاك دەبێ كە سەرەتاكەی پێ چاك بووە، ئەمە رێسایەكی بنەڕەتی و ئامانجێكی دیاریكراوە بۆ هەر موسوڵمانێك، ئەوە بیروباوەڕێكی دامەزراوە لەناخماندا. ..لەو بیروباوەڕەوە دەستمان بەكاركردووە و بۆلای ئەویش بانگەواز دەكەین(٤٩).

---

(٤٨) – دعوتنا، حسن البنّا، ص ٢٦.

## جیاوازی پێویست:

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا باوەڕمان وایە جیاوازی لەفەرعەکانی ئاییندارییدا شتێکی پێویستە و ناکرێت لەو فەرعانەدا یەك رێ و یەك بۆچوون بین، چونکە:

١-عەقڵەکان توانایان لە تێگەیشتن و هێزی هەڵچنینی حوکمەکاندا جیاوازە.

٢-فراوانی شارەزایی لەلایەك و تەسکی لەلایەکی تر.

٣-دەورووبەرەکان جیاوازن وپیادەکردنی حوکمێك لەجێگایەکەوە بۆجێگایەکی تر و لەزەمانێکەوە بۆ زەمانێکی تر دەگۆڕێت، بۆیە دەبینین ئیمامی شافیعی -خوای لێ رازی بێت- فەتواکانی لە عێراق لەگەڵ فەتواکانی لە میسر جیاوازن، هەردووکیشیانی لەوە وەرگرتووە کە لای روون و ئاشکرا بوون و لە هەردووکیانیشدا هەوڵێ داوە لە راستی لانەدات.

٤-دڵنیایی دەربارەی ریوایەتە جیاوازەکان لای ئەوانەی وەریان گرتوە چون یەك نین.

٥-دانانی بەڵگەکان بۆ گەیاندنی مەبەستی حوکمەکان لەلایەن زاناکانەوە وەکو یەك دەرناچن...یەکێك کردەوەی هاوەڵان دەخاتە پێش فەرموودەی (**آحاد**)ەوە و یەکێکی تر پێچەوانەی ئەو دەکات و بەو شێوەیە...

ئەم هۆکارانە وامان لێدەکات کە کۆدەنگی لەسەر حوکمی فەرعەکانی ئاییندارییی بەمەحاڵ بزانین، بەڵکو هەر لەگەڵ سروشتی ئاییندا نەگونجاوە. بە تایبەتی بۆ ئایینێك کە خوا ویستبێتی هەر بمێنێ و بۆ هەموو جێگا و سەردەمێك بگونجێت. لەبەر ئەمە پێویستە نەرم و نیان و سوك و ئاسان بێت و چەقبەستویی و سەختگیری تێدا نەبێت[٥٠].

---

(٥٠) دعوتنا، حسن البنّا، ص ٢٨.



## ئەوانەی لەگەڵمان جیاوازن پاساویان بۆ دەهێنینەوە:

باوەڕمان بە راو تێگەیشتنی جیاواز هەیە، ئەوانەش کە لەبارەی حوکمە فەرعییەکانەوە لەگەڵمان جیاوازن پاساویان بۆ دێنینەوە و وانازانین ئەو جیاوازیانە هەرگیز کۆسپی پەیوەندی دڵەکان و رێگری گۆڕینەوەی خۆشەویستی و هاوکاریکردن بن لەسەر چاکە. واشدەزانین کە ئیسلام هێندە بەرین و فراوانە جێگای هەموومانی تێدا دەبێتەوە.

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ جیاواز لەیەکتر فەتوایان دەدا، بەڵام ئەوە دڵیانی لەیەکتر جیا نەدەکردەوە و پەیوەندییانی تێك نەدەدا، باسی نوێژکردنی عەسر لە (**بني قريظة**) روداوێکی دیاری ئەو بابەتەیە.

ئەوان کە هاوەڵان بوون و لەسەردەمی پێغەمبەرایەتیدا ژیاون و چاکتر بەڵگەو ئاماژەکانی حوکمە شەرعیەکانیان زانیوە، لەگەڵ بوونی ئەو جیاوازییانەدا ناکۆك نەدەبوون، ئەی ئێمە بۆچی بەبیانووی ئەو جیاوازییە ساکارانەوە ناکۆك و جیاوازین؟

ئەمە بەرنامەی مامەڵەی برایانی موسوڵمانە لەبابەتە فەرعیەکانی ئایینداریدا، کە موسوڵمانان هەرگیز لەسەر یەك ڕاو بۆچوون نابن. دەکرێت کورتی بکەینەوەو بڵێین: برایان رێگای جیاوازی راو تێگەیشتن دەدەن، بەڵام دەمارگیری بۆ هیچ رایەك پەسەند ناکەن و هەوڵیش دەدەن بگەنە راستی و بۆ ئەو مەبەستەش نەرمترین رێگا بەخۆشەویستییەوە دەگرنە پێش[٥١].

## جیاوازی عەیبە نییە:

لەگەڵ ئەوەی برایانی موسوڵمان باوەڕیان وایە کە سەرچاوەی تێگەیشتن لە بابەتەکانی ئیسلام قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەو دوو

(٥١) سەرچاوەی پێشوو لا ٢٨-٢٩.

سەچاوەیە ئەگەر ئوممەت بۆیان بگەڕێتەوە هەرگیز ڕێ ون ناكات و باوەڕمان وایە كە پێویستە وەكو هاوەڵان و شوێنكەوتووە چاكەكانیان، لە ئیسلام تێبگەین و لەسنوورەكانی ئایینی خوادا بوەستین و خۆمان نەبەستینەوە بە قەید و بەندێكەوە كە خوا نەیوەیستوە لێمان و سەردەمەكەمان بەرەنگی سەردەمێكی تر رەنگ نەكەین لەگەڵی نەگونجێت.

باوەڕمان وایە كە ئیسلام ئایینی خوایە بۆ هەموو مرۆڤ، بۆیە بۆ كاروبارەكانی ژیان ڕێسای گشتی داناوە و ڕێنوێنی خەڵكی كردووە، كە لە سنووری ئەو ڕێسایانەدا ژیانی كرداریی خۆیان ڕێكبخەن.

چەند جوان و ڕێكە كە ئیمام مالیك –خوای لێ رازی بێت– بە (**أبوجعفر المنصور**)ی وت لە كاتێكدا دەیویست هەموو خەڵك لەسەر پەڕاوی (**الموطأ**) كۆبكاتەوە: (هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە وڵاتاندا بڵاو بوونەتەوە، لەلای هەر گەلێك شارەزایەكیان هەیە و هەر یەكەیان بەگوێرەی تێگەیشتنی خۆی كاری كردووە، ئێستا ئەگەر لەسەر یەك را كۆیان بكەیتەوە، ئەوە دەبێتە ئاشوبی).

بێگومان ناشیرینی لە جیاوازیدا نیە، بەڵكو عەیب لە دەمارگیری و ڕێگری لەعەقڵ و قبولڵ نەكردنی تێگەیشتن و راو بۆچوونی خەڵكدایە.

ئەمە تێڕوانینی كۆمەڵی برایانی موسوڵمانە و رایان وایە كە جیاوازی راو بۆچوون پێوستی هەر بە بانگەوازێكە، گەر بیەوێت بڵاوبێتەوە، بەتایبەتی لەوڵاتێكدا كە راوبۆچوونی جیاواز رەگی مەحكەم كردبێت تێیدا، لە وڵاتی وادا راوبۆچوونی جیاواز قەبولڵ نەكردن مانای نییە [٥٢].

(٥٢) المؤتمر الخامس، حسن البنّا، ص١٢٠–١٢٤.

## پێنجەم: پرسی هۆکار (التوسل) بەکارهێنان لەنزاکاندا و ناکۆکی لەسەری:

پرسی بەهۆکارکردنی پێغەمبەر ﷺ یان پێغەمبەران و فریشتەکان و چاکان لەبەندەکانی خوا، ئیمام بەننا دەربارەیان دەڵێت: پێشەوایانی دێرین رایان لەسەری جیاوازە، جیاوازن لەسەر چۆنیەتی نزاکردن نەك لەسەر بابەتەکانی بیروباوەڕ.

سەلەفییەکان ئەم رایەی ئیمام بەننایان پەسەند نییە و بەسەختی بەرپەرچی دەدەنەوە. نازانم ئەوە هۆی چی یە؟(٥٣)

لەراستیدا بابەتەکە جیاوازییە و ئەوەی پەڕاوی مەزهەبە بەگوێکراوەکانی حەنەفی و مالیکی و شافیعی و حەنبەلیەکانی خوێندبێتەوە، ئەو جیاوازییانە بەروونی دەبینێت. زۆربەیان مۆڵەتی پاڕانەوەیان بەهۆی پێغەمبەرو خواناسانەوە داوە و هەیانە ئەوەی بەناپەسەند واتە (مکروه)داناوە و هەشیانە رێگەی نەداوە.

هەر گرۆیەکیشیان بەڵگە، یان لە بەڵگەچووی خۆیانیان هەیە لەسەر راستی بۆچوونەکانیان و لەبەرامبەریشەوە ئەوانەی بەقەدەغەی دەزانن رەتدانەوەیان هەیە لەسەر بەڵگەکانی ئەوانەی مۆڵەتی پێ دەدەن. ئەمەش وەکو هەموو ئەو بابەتانەی زانایان لەسەری جیاوازن.

ئەوەش کە دەڵێت پاڕانەوە بەهۆکارەوە لە بابەتەکانی چۆنیەتی ئەنجامدانی کارە نەك لەبابەتەکانی بیروباوەڕە، ئەمە ئاراستەدانێکی دروستە چونکە بابەتەکە جیاوازییە لە چۆنێتی نزاکردندا، مادەم داوالێکراو بە تەنیاو داوالێکراو بەهۆکار هەر خوا بێت.

---

(٥٣) الإخوان المسلمون ٧٠ عاماً، د.يوسف القرضاوي، ص ٣١٨.

ئەمەش وەنەبێت هەر قسەی ئیمام بەننا بێت بەڵکو شێخ (**محمد عبدالوهاب**)یش هەروای وتووە، وەکو لە فەتواکانیدا هاتووە[٥٤].

## شەشەم: پرسی دۆستایەتیکردن و خۆدارنین (الولاء و البراء) و جیاوازی دەربارەی:

ئەم بابەتە کۆمەڵی برایان لە پێشترینی کۆمەڵەکانن لە روونکردنەوەییدا: ئەوان دۆستایەتیکردن (**الولاء**) **یان** هەیە بۆ خواو پێغەمبەر و کۆمەڵی موسوڵمانان، بەو شێوەیەی خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿**إنما وليكم الله ورسوله والذين آمنوا الذين يقيمونَ الصلاةَ ويؤتونَ الزكَاةَ وهم راكعونَ (55) ومن يتول الله ورسوله والذين آمنوا فَإن حزب الله هم الْغالبونَ(٥٦)**﴾**المائدة**/٥٥-٥٦.

واتە: دۆست و پشتیوانی ئێوە تەنها خواو پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە. . ئەوانەی نوێژەکانیان بەجوانی ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن و بۆ خوای گەورە گوێڕایەڵ و کڕنوش بەرن، ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی بکاتە دۆست و پشتیوان، بادڵنیا بێت کە کۆمەڵی دۆستانی خوا سەرکەوتوون.

**هەروەها** کۆمەڵی برایان دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانەدا ناکەن کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران دەکەن، ئەمەش بۆ گوێڕایەڵی ئایەتی: ﴿**ياأيها الذين آمنوا لا تتخذُوا عدوي وعدوكُم أولياءَ**﴾ **الممتحنة**/١.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، دوژمنانی من و خۆتان مەکەنە دۆست.

---

(٥٤) سەرچاوەی پێشوو، لا ٣١٨-٣٢١.



هەروەها ئیمام بەننا ئەم بابەتە دووپات دەكاتەوە و دەڵێت: بەهێزترینی لقەكانی باوەڕ خۆشویستنە لەبەر خوا و رق لێبوونە لەبەر خوا، ئایا باوەڕ جگە لە خۆشویستن و رق لێبوون شتێكی ترە؟ .

هەروەها لە پەیامی (**التعالیم**)دا لەباسی خۆ یەكلاكردنەوە (**التجرّد**) دا دەڵێت: مەبەستم لە خۆ یەكلاكردنەوە ئەوەیە، لە پێناوی باوەڕەكەتدا واز لەهەموو بنەما و كەسەكان بێنیت، چونكە بەرزترین باوەڕ و كۆترین و بڵندترینیان ئەمەیە كە خوا دەفەرموێت: ﴿**صبغةَ الله ومن أحسن من الله صبغةً**﴾ **البقرة**/١٣٨. واتە: ئەم ئایین و بەرنامەیە رەنگرێژی و نەخشەی خوایە، جا كێ چاكتر لە خوا نەخشە و بەرنامە رێژیی دەكات؟ !

هەروەها دەفەرموێت: ﴿**قد كانت لكُم أسوةٌ حسنةٌ في إبراهيم والذين معه إذْ قالُوا لقَومهم إنا برآءُ منكُم ومما تعبدونَ من دون الله كفَرنا بِكُم وبدا بيننا وبينكُم العداوةُ والبغضاءُ أبدا حتى تؤمنوا بالله وحده**﴾ **الممتحنة**/٤.

واتە: ئەی باوەڕداران بەراستی نموونەیەكی جوان لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون خراوتە پێش چاوتان كاتێك كە بە گەلەكەی خۆیانیان وت: ئێمە لە ئێوە و ئەو شتانەی دەیانپەرستن بەرین، دوژمنایەتی لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بەرپا بووە، تاكو باوەڕ تەنیا بەخوا دەهێنین.

خەڵك بەلای برای راستەقینەوە شەش جۆرن:

١–موسوڵمانی تێكۆشەر. ٢– موسوڵمانی دانیشتوو.

٣– موسوڵمانی تاوانكار. ٤–بێ باوەڕی هاوپەیمان.

٥– بێ باوەڕی بێ لایەن. ٦– بێ باوەڕی جەنگی.

هەرەیەکە لەم شەش جۆرە لەتەرازووی ئیسلامدا حوکمی خۆی هەیە و لەسنووری ئەم بەشانەدا کەس و دەزگاکان دەناسین و دۆستایەتی یان دوژمنایەتییان دەکەین[٥٥].

بەپێی ئەم بەرنامەیە برایان لەبەرامبەر داگیرکاران و زایۆنیزم سەختترین کەس بوون، چونکە ئەوان داگیرکاری وڵاتی موسوڵمانانن، برایان لەوڵاتی ئیسلامدا بۆ بەرهەڵستی داگیرکەران جوڵێنەر و سەرکردایەتی خەبات بوون و ناگونجێت بەدۆستی ئەوان دابنرێن.

## حەوتەم: برایەتی لەگەڵ هاونیشتیمانییە ناموسوڵمانەکان و جیاوازی لەسەری:

برایان جیاوازی دەکەن لەنێوان ئەو داگیرکارە ناموسوڵمانانە و هاونیشتیمانییە ناموسوڵمانەکاندا، کە لەگەڵ موسوڵماناندا دەژین و خەڵکی رەسەنی وڵاتەکەن... کە ئیسلام هاتووە ئەوانی تیابووەو هێمنییان پێدراوە و لە ئەستۆ گیراون، کە لەسایەی حوکمی ئیسلامدا لەگەڵ موسوڵمانان بژین و موسوڵمانان چ مافێکیان هەبێت ئەوانیش لەسەریان بێت، جگە لەو شتانەی جیایی ئایین پێویستی دەکات.

هاونیشتیمانیانی ناموسوڵمان خوای گەورە قەدەغەی چاکەکاری و عەدالەتی لەگەڵ نەکردوون، وەکو دەفەرموێ: ﴿**لا ينهاكُم الله عن الذين لم يقاتلُوكُم في الدين ولَم يخرجوكُم من دياركُم أنْ تبروهم وتقْسِطُوا إِليهم إن الله يحب المقْسِط**﴾ الممتحنة/٨.

واتە: ئەو بێباوەڕانەی لەسەر ئایین لەگەڵتان نەجەنگاون و لە وڵاتتان وەدەریان نەناون، خوا قەدەغەی چاکەکاری و دادپەروەریتان لێ ناکات

(٥٥) رسالة التعاليم، مجموعة الرسائل، ص ٢٦٣.

لەگەڵیان. .. خوای گەورە دادپەروەرانی خۆشدەوێت، کەواتە ئەوانە مافی چاکەکاری و دادپەروەریان هەیە. دادپەروەری ئەوەیە بێ ستەمکردن لێیان مافی خۆیان بدرێتێ، بەڵام چاکەکاری واتە: لەوەش زیاتریان بدرێتێ.

دادپەروەری ئەوەیە ئەرکێك کە دەکەوێتە سەریان وەکو خۆی جێبەجێی بکەن، ئەوەش چاکەکارییە لە بەشێکی ئەو ئەرکە ببەخشرێن.

ئەوانە مافی خۆیانە پێیان بڵێین: برامانن... برامانن لەنیشتیماندا، هەر چۆن موسوڵمانان لە هەرکوێ بن برای یەکترن لە ئاییندا.

فیقهزانان دەڵێن: لەئەستۆگیراوان (**أهل الذمّة**) خەڵکی وڵاتن. . وڵاتی ئیسلام. جگە لەوە کە برایەتی تەنیا برایەتی ئاینی نییە، بەومانایەی باوەڕداران برای یەکترن کە ئایەتی ﴿**إنما المؤمنونَ إخوةٌ**﴾ **الحجرات**/١٠، مەبەستیەتی. جگە لەوە برایەتی هاونەتەوەیی و برایەتی نیشتیمانی و برایەتی مرۆڤایەتیش هەیە.

ئەمەش نابێت ببێتە لەکە دەربارەی بیروباوەڕی برایان و گوایە دۆستایەتی و خۆدارنین (**الولاء و البراء**) لە بیروباوەڕیاندا نییە، بەڵکو ئەمە نیشانەی جوان تێگەیشتنی ئەوانە و نیشانەی حاڵی بوونیانە لە ئایینی خوا کە خەڵکی تر لێی حاڵی نابن.

## هەشتەم: کافرکردنی فەرمانڕەواکان و جیاوازی لەسەری:

تاوانبارکردنی برایان بەوەی پەلەناکەن و فەرمانڕەواکان لەسەر ئەوەی یاسای خوا پیادە ناکەن و فەرمانڕەوایی بەگوێرەی ئەوەی خوا دایبەزاندووە نایکەن بەکافریان نازانن. گوایە لەو بارەوە کەمتەرخەمی دەکەن و فەرمانڕەواکان رازی دەکەن و لە ئاییندا نەرمی دەنوێنن.

خوای گەورە و موسوڵمانان و هەموو خەڵکیش دەزانێت کە برایان چەندیان بەسەردا هاتووە بەدەست فەرمانڕەواکانەوە... چەندە قوربانییان داوە... چەندە شەهیدیان بەخشیوە... چەندین ساڵانی تەمەنیان لە بەندینخانەکاندا گوزەراندووە. . چەندە قەمچی لەخوێنیان تێر بووە و ئامێر گۆشتی هەڵکۆڵیون و ئێسکی شکاندوون.

ئەمانە بەدەستی حکومەتە شانشینەکان و کۆماریەکانیش لەسەردەمی لیبراڵی راست و سۆشیالیستی چەپیشدا، برایان لەوانە نەبوون نەرمی لە ئاییندا بنوێنن یان دەسەلات لە خۆیان رازی بکەن.

برایان بۆ هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتداران و حوکمدان بەسەریاندا بناغە و سەرچاوەی خۆیانیان هەیە. ئەوان لەسەر ئەو بناغانە و بەگوێرەی یاسا و رێسای سەرچاوەکان فەرمان دەدەن و بۆ ئەو فەرمانانە گوێڕایەڵی دەکەن و لەبەر ستەمی دەسەڵاتداران لێیان حوکمەکانیان لار ناکەنەوە و لەبەر حورمەت شکاندان و خوێن رشتن و ماڵ خواردنی ئەوان بەناڕەوا، حوکمەکان ناگۆڕن.

لەو بناغە و سەرچاوانە: کافرکردن پرسێکی ترسناکە و ئاسەوارەکانی لەدوایەوە دێن و نابێت شلگیری تێدا بکرێت. ساغکردنەوەی حوکمی کوفر بەسەر کەسێکدا بێ بەڵگەی روون و ئاشکرا هەڵەیەکی ترسناکە، چونکە ئەوەی حوکمی کوفری لێ دەدەین، واتە لە میللەتی ئیسلام دەیکەینە دەرەوە و جیای دەکەینەوە و لە دۆستایەتی موسوڵمانان و بێبەشی دەکەین، موسوڵمانان دەکەینە دوژمنی و ئەویش دەکەینە دوژمنی ئەوان، زیاتر لەوەش زۆرینەی زانایانی ئوممەت حوکمی کوشتنی دەدەن... ئەوانی تریشیان فەرمانی وەکو بەندکردنی هەمیشەیی بۆ دەردەکەن.



ئیمام بەننا لەدوایین خاڵی بیست بناغەکەدا (**الأصول العشرون**) دەڵێت: کەسێك کە بەزمان شایەتومانی وتبێ و بەگوێرەی ئەو شایەتومانە رەفتاری کردبێ، ئیتر لەبەر گوناه یان لەبەر بیروبۆچوون کافری ناکەین. . سا مەگەر شتێکی ئاشکرا و دیاری ئایین ئینکار بکات، یان حوکمی ئاشکرای قورئان بەراست نەزانێت یان تەفسیری قورئان بەشێوەیەك بکات شێوازەکانی زمانی عەرەبی بەهیچ جۆرێك نەیگرێتەوە، یان کارێك ئەنجام بدات جگە لە کوفر مانای تر نەبەخشێت.



ئیمام حەسەن بەننا

# پەروەردە لە پەیامەکانی ئیمام بەننادا

## پەروەردە رێبازی راپەرینە:

کێشەی راستەقینەی نێوان ئێمە وبەرامبەرەکانمان لەسەر پێکهاتە و سیفەتە، کەواتە تەوەرەی ململانێی نێوان ئێمە و ئەوان پەروەردەیە. ئەوان دەیانەوێت ئێمە سیفات و پێکهاتەیەکمان هەبێت نەتوانین پەیامەکەمان هەڵگرین و سەری

بخەین. .. ئێمەش دەمانەوێت سیفات و پێکهاتەیەکمان هەبێت بەهۆیەوە بەهەڵگرتنی پەیامی ئیسلام شەرەفمەندبین و توانای سەرخستنیمان هەبێت.

کەواتە پەروەردە لەکاری ئێمەدا هەڵبژاردنێکی بنەڕەتییە، هەڵبژاردنێکە ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین. ئێمە ئاواتمان ئەوەیە سەربازی خوا و هەڵگری بانگەوازەکەی بین، بۆیە دەبێت خۆمان بۆ هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە گەورەیە و خەڵك بۆ شوێنکەوتنی ئیسلام ئامادە بکەین.

چوونە ناوی ئەم ململانێ و رووبەڕوو بونەوەیە لەسەر روونی تێڕوانین و دیدو مەبەستمان بەندە. چونکە ئەم ململانێ و کێشمەکێشە فراوان و فرەلایەنە، لەلایەکی ترەوە ئەوانەی دژایەتی ئێمە دەکەن خۆیان بەزانست و زانیاری و لێزانین پڕچەك کردووە، جگە لە چەشنەکانی هێز، هەروەها لەجۆرەها فێڵ و خەڵەتاندن و سەر لێ تێکدان لەبەرامبەرەکانیان درێغی ناکەن.

کەواتە چار نییە، دەبێت ئێمە بەوردی شارەزای لایەنەکانی ئەو کێشمەکێشە بین کە لەنێوان ئێمە و ئەواندا روو دەدات و مەیدانە سەرەکی و لاوەکییەکانی بزانین و پێگە بنەڕەتی و رووکەشییەکانی شارەزابین، رێگا نەدەین بۆ خەساردانی وزە و رژاندنی خوێن و لەناوبردنی تواناکانمان کێشمان بکەن و بەجەنگی لاوەکی و پەراوێزییەوە خەریکمان بکەن و سەرەنجام بە سوودو قازانجی ئەوان کۆتایی پێ بێت.

لەم بارەیەوە ئیمام بەننا –رەحمەتی خوای لێ بێت– دەڵێت: ئوممەتێك کە لەبارودۆخی ئێمەدا بێت و کارێکی وەکو کاری ئێمە چاوەڕێی بێت و رووبەرووی ئەرکێك بێتەوە وەکو ئەرکەکانی ئێمە، ناکرێت بەدەرمانە ئازار لابەرەکان دڵخۆشکات یان بە ئاواتخواستنی کۆڵبدات، بەڵکو پێویستە خۆی بۆ خەباتێکی سەخت و بەهێز و درێژ لەنێوان خاوەن ماف و مافزەوتکەردا ئامادە بکات،



ئامادەکردنی دڵسۆزان نەك هی ئەوانەی لاف و گەزاف لێدەدەن. دەبێت بزانێت خەباتکردن واتە: کۆششکردن و هەوڵدان و خۆڕەنجاندان و وازنەهێنان، تاکو خۆری راستیی گزنگ دەدات، ئەو کاتە و لەو بەرەبەیانەدا قەدری رێبوارانی شەو دەزانرێت[٥٦].

ئیمام بەننا زۆر بایەخی بە پەروەردە دەدا، چونکە پەروەردە هۆکاری پێگەیاندنی پیاوانە، لەو بارەیەوە دەیوت: بە پەروەردەی دروست خۆتان ئامادە بکەن و پێبگەیەنن، بەکارکردن و تاقیکردنەوە لەسەر کاری قورس و گران دەروونتان رایبهێنن و لە ئارەزوو و یستی خووگرتن بیگرنەوە[٥٧].

هەروەها ئیمام بەننا ئەوە روون دەکاتەوە کە تازەکردنەوەی هۆکار و شێوازەکان پێویستن تا لەگەڵ تازەکردنەوەی هزری خەڵك و هەڵسوکەوتیاندا بگونجێت و پێویستە گرنگی بەشتە گرنگەکانی دەوروبەر بدەین، بەشێوەیەك بە کردار بەرەو ئامانج دەستمان بگرن، لەسەر ئەمە دەڵێت: هەموو سەردەمێك لە هەموو شتێکدا رێگای تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نموونە لە نووسیندا دەبێت گونجاو بێت لەگەڵ شێوازی تێگەیشتنی خەڵك و رێبازی لێکۆڵینەوەیاندا، پێویستە تازە بێت تاکو عەقڵەکان تازەبکاتەوە و رێگای بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوە و ئەنجام دەرهێنانیان پێ بگۆڕێت.

دەبێت ئەوە بزانین کە جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان روونکردنەوەی چەمکەکان و زانیاری کۆکردنەوە لەسەریان، لەگەڵ گۆڕینی ئەو چەمك و زانیاریانە بۆ مامەڵە و جوڵە لەجەرگەی ژیاندا، بۆیە دەبێت ئاگاداربین کە پەروەردە و پێگەیشتن ماوەی زۆر و خۆڕاهێنان لەسەری و ئەنجامدانی کاری قورسی دەوێت.

---

(٥٦) هل نحن قوم عمليون، حسن البنّا ص ٦٨–٦٩ مجموعة الرسائل.

(٥٧) رسالة المؤتمر الخامس الى حسن البنّا.

پەروەردە لە پێشدا شارەزابوون و لە دواییدا جێبەجێکردنی دەوێت، لەبەر ئەمە ئیمام بەنا قۆناغەکانی بانگەواز دەکاتە سیان:

**یەکەم: شارەزاکردن:**

ئەوەیش بە بڵاوکردنەوەی بیرۆکە گشتییەکە بەناو خەڵکدا و بانگکردنیان. یاسای بانگەوزای ئەم قۆناغە یاسای کۆمەڵە کارگێڕییەکانە و رۆڵیان کارکردنە بۆ چاکەی گشتی بە ئامۆژگاری و رێنوێنی و فێرکردن وپێکهێنانی پرۆسەی بەسوود و هۆکارانی تری لەو بابەتە.

**دووەم: پێکهێنان (التكوين):**

بریتییە لە هەڵبژاردنی کەسایەتییە دیندار و شارەزاکان، پاشان ئەو کەسانە پێکەوە رێکبخرێن تاکو ببنە سەربازانی کارا و ریزێکی کارا، تاکو بتوانن دۆست و پشتیوان پەیدا بکەن.

یاسای بانگەواز لەم قۆناغەدا لەلایەنی رۆحییەوە سۆفیەتی و لەلایەنی کردارییەوە سەربازییە، دروشمی ئەم دوو لایەنەش گوێڕایەڵی فەرمانە بە بێ ڕاڕایی و گەڕانەوەو گومان و سڵکردنەوە.

ئەوانەی لەم قۆناغەدا دەخرێنە کار کەسانێکن کە ئامادەیی راستەقینەیان هەیە بۆ هەڵگرتنی کۆڵی خەباتگێڕی درێژ و گران و فرەلایەن.

لەم بارەیەوە ئیمام بەننا دەڵێت: برایان! ئێوە لە قۆناغی پێکهاتن و دروستبووندان، جوان و تەواو خۆتان ئامادە بکەن، بە خۆڕاهێنانی کەم رازی مەبن، بەڵکو لە سەدا نەوەدی کاتەکانتان بدەن بەم پێکهاتن و ئامادەکارییە، لەسەد دەکەی تریش بۆ ئیش و کارەکانی تر تەرخان بکەن، تاکو بەهێز و توانا و لێهاتوو بن و ئامادەیی تەواوتان هەبێت بۆ هەر ئەرکێك کە دەکەوێتە

سەرشانتان، ئەو کاتە خوای گەورە دەرگای سەرکەوتنتان لەناو گەلەکەتاندا لێدەکاتەوە.

هەروەها دەڵێت: دەروونی خۆ پشکنین و پەروەردەکردن و هەوڵدان لەگەڵی تاکو بەهێز بێت و راهێنانی ئەوانەش کە لەگەڵماندان هەر بەو شێوەیە، ئەرکی هەرە پێویستی کارەکەمانە تاکو خۆمانی بۆ پێبگەیەنین. چونکە کاری ئێمە پەروەردەییە.

ئەو بێداربوونەوە لە قۆناغی ناساندندا بەدەست دێت، نابێت وازی لێ بهێنرێت تاوەکو دەکوژێتەوە، بەڵکو پێویستە گەشەی پێ بدرێت و ئاراستەی ناو دەروون بکرێت، تاکو کاری خۆی لە چاکسازی و گۆڕانکاریدا ئەنجام بدات، پاشان کەسیەتی ئەوانەی وەڵامیان داوەتەوە لەسەر بناغەی بانگخوازی و خۆدارِشتن بەگوێرەی خواستەکانی دابڕێژێتەوە، تاکو ئامادەی هەڵگرتنی ئەرکەکانی قۆناغی دواتر بێت...قۆناغی جێبەجێ کردن.

کورتەکەی واتە: پەروەردەکردنی کەسێکی خواویست کە فەرمانەکانی خوا بخاتە پێش هەموو فەرمانێك، قیامەتی لاگرنگتر بێت لە دنیا و، گوێڕایەڵی ئایینی زاڵ بکات بەسەر ئارەزووەکانیدا.

### سێیەم: قۆناغی جێبەجێ کردن:

مەبەست بە جێبەجێ کردن بەکاربردنی هەموو تواناکانە بۆ دەرەوەی خۆ لە پێناوی بەرژوەندی بانگەوازدا، ئەمەش هەموو هەوڵ و خەباتێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجە قۆناغییەکان دەگرێتەوە، تابە رێکخستنی ئەو ئامانجانە ئامانجە گەورەکەی کار کە بریتیە لە گەڕانەوەی موسوڵمانان بۆ سایەی ئیسلام و پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامیی بێتە دی. ئەمەیە مانای جێبەجێ کردنە لە قۆناغی سێیەمی بانگەوازی برایاندا.

ئیمام بەننا سروشتی بانگەواز لەم قۆناغەدا روون دەکاتەوە و دەڵێت: بانگەواز لەم قۆناغەدا خەباتکردنی ماندونەناسانەیەو کارکردنی بەردەوامە بۆ گەیشتن بەمەبەست.

ئەم قۆناغە ئەزموون و تاقکردنەوەیە بە راستگۆیان نەبێت ناکرێت و بەگوێڕایەڵی تەواو نەبێت ئەنجام نادرێت.

ئەم قۆناغە لەناو هەموو جومگەکانی ژیاندایە و وەڵامدانەوەیە بۆ چەندین فەرمانی لەم جۆرەی کە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت ﴿**يأيها الذين آمنوا اركعوا واسجدوا واعبدوا ربكم وافعلوا الخير لعلكم تفلحونَ(٧٧)وجاهدوا في الله حق جهاده هو اجتباكم وما جعلَ عليكم في الدين من حرجٍ ملةَ أبيكم إبراهيم هو سماكم المسلمين من قبلُ وفي هذا ليكونَ الرسولُ شهيدا عليكم وتكونوا شهداءَ على الناس فأقيموا الصلاةَ وآتوا الزكاةَ واعتصموا بالله هو مولاكم فنعم المولى ونعم النصير (٧٨)**﴾الحج/ ٧٧–٧٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کڕنووش و سەجدە ببەن و پەروەردگارتان بپەرستن و چاکە ئەنجام بدەن تاکو سەرکەوتوو و سەرفرازبن. هەروەها لەپێناوی خوادا بەو شێوەیی شایستەیە خەبات بکەن، ئەو ئێوەی –بۆ ئەو کارە گرنگە. . بۆ رزگارکردنی بەندەکان و خاوێنکردنی ژیان– هەڵبژاردووە، ئەم کارە رێبازی ئیبراهیمی باوکتانە، پێشتر و لەم قورئانەشدا خوای گەورە ئێوەی بەموسوڵمان ناوزەد کردووە. ئەمەش تاکو پێغەمبەرﷺ ببێتە شاهید بەسەرتانەوە وئێوەش شاهیدی سەرخەڵك بن. جا بۆ ئەو مەبەستە نوێژەکانتان بەجوانی ئەنجام بدەن و زەکات ببەخشن و –بۆ مسۆگەرکردنی سەرکەوتنتان– پشت بەخوا ببەستن، چونکە ئەو دۆست و یاوەرتانە.. ئای چ دۆست و یاوەرێکی چاك و چ کۆمەك بەخشێکی بە توانایە.



## لە پێناوی رابووندا:

بانگەوازیی برایان لەسەرەتای دامەزراندنیەوە بایەخێکی زۆری بە پەروەردە داوە، بۆ ئەو مەبەستە ئیمام بەننا زنجیرەیەك ووتاری لەژێر ناونیشانی ( لەپێناوی رابووندا) نووسیوە، تیایاندا هاتووە: (پێویستە پەروەردە پایەی رابوون و هەڵسانەوە بێت، یەکەمجار خەڵکی بەچاکی پەروەردەبن و بەتەواوی مافەکانیان شارەزابن و ئەو هۆکارانەی مافەکانی پێ وەدەست دێت بیناسن.. باوەڕی بەهێزیان هەبێت و لەسەر ئەو باوەڕە بەجوانی خۆیان پەروەردە بکەن و ئەو باوەڕە بکەنە کاڵای گیان و پەیامی ژیان... بەمانایەکی تر پێویستە رێبازی رابوون و هەڵسانەوە شارەزابن، بەتیۆری لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و بەکرداری جێبەجێی بکەن ولە ڕووی رۆحیشەوە بیکەنە ئاواتی بەرز و هۆکاری رەزامەندیی خوای گەورە.

بێگومان ئەمانە کاتی زۆریان دەوێت... ئارامگرتن و لەسەر خۆیی و کۆڵنەدان دەخوازن، ئەمە سروشتی ئەم کارەیە، ئەوەش هەنگاو بەسەر یاساکانی سروشتدا بنێت سەرئەنجامی بێ بەش بوونە. لەبەر ئەوە پێویستە وڵات بکرێتە قوتابخانە و خەڵکی ببنە قوتابی و زانا و سەرکردەکان ببنە مامۆستا و وانەکانی زانست و ئەرك و مەبەست و هۆکارەکان فێری خەڵکی بکەن. بۆ ئەمەش دەبێ دوو هۆکاری گرنگ رێك بخرێن، کە بریتین: لە بەرنامە و بەرپرسیارێتی.

بەرنامە پێویستە بابەتەکانی کەم و کورت و قابیلی جێبەجێکردن بن، ئامانج دیار و ئەنجام مسۆگەر بن، بەرپرسیارێتیش پێویستە لەگەردنی کەسانێکدا بێت هەڵبژێرراو بن و گەیشتبنە ئاستی متمانە و پێشگەیشتووبن و لەناو رووداوەکاندا ژیابن و بەبەرنامە پەروەردە بوو بن).

لەسەر ئەم رێسایانە (**مصطفى كامل**) و (**محمد فريد**) و پێش ئەوان (**جمال الدين الأفغاني**) و (**شێخ محمد عبده**) رابوونی میسریان بونیادنا. .. خۆ ئەگەر لەسەر ئەو رێگایە بەردەوام بووایە و لە رێڕەویخۆی نەترازایە بەمەبەستی خۆی دەگەشت یان لانی کەم وڵات پێش دەکەوت و پڕ لەخێرو چاکە دەبوو.

بەڵام بەرپرسەکان بارودۆخ هێنانی و پەلەیان لەبەدەستهێنانی ئامانجەکاندا کرد، پێش وەگەڕخستنی هۆکارەکان، سەرکردایەتییان بۆ گەل بوغرای کردن و لەناو فێڵەکانی سیاسەتدا خەڵەتان و تراویلکەیان بەئاوزانی و بەشوێنیدا رۆیشتن و هیچیان نەدی. بۆیە دوای شەکەت بوون و هیلاکی و تیاچوونی سامان و لەدەستدانی کات ناچاربوون بگەڕێنەوە بۆ خاڵی دەستپێکردن. بۆیە بۆ دواگەڕانەوە و بۆ پێش نەچوون، بۆ هەردوو جیهان زەرەیان کرد نەك قازانج.

ئەگەر ئوممەت لەم راستییانە گەیشت و پەندی لە ئەزمونەکانی رابووردوو وەرگرت و گەڕایەوە بۆ رابوونی دروست و بایەخی بەبابەتە هەستیارەکان دا، لەوەهەم وازی هێنا و بۆ خەباتێکی درێژ لێبڕا، بەیارمەتی خوای گەورە سەردەکەوێت).

**هەروەها** لەبابەتێکی ترداو لەژێر هەمان ناونیشاندا، تێیدا **هاتووە:** (هەڵسانەوە و لەسەر پێ وەستان، بۆ هەر گەلێك، بەبێ گەڕانەوە بۆ رەوشت بەرزیی مەحاڵە، جا ئەگەر گەلێك توانی جڵەوی ئارەزوەکانی بگرێت و شەیدای هەوڵ و قوربانیدان بوو بێت، دەتوانێت سەرکەوتن بەدەست بێنێت، بەمانایەکی تر گەلێك ئەگەر توانی خۆی لە قەید و بەندی خواستەکانی ئارەزووی رزگار



بکات، لەهەموو کۆتێك رزگار دەبێت، دەی با بەردی بناغەی کارمان چاکسازی رەوشتەکانی بێت) [٥٨].

کۆمەڵی برایان بایەخدانیان بەپەروەردە پێشی هەموو شتێك خست و کردیانەبناغەی هێزو پایەی بانگەواز، ئەوان هێزی بانگەوازەکەیان لەزۆری شوێنکەوتووان و بڵاو بوونەوەی ناوبانگیان و لەگەیشتنی بانگەوازەکەیان نابیننەوە، بەڵکو هێزی خۆیان لە جۆری تاکەکان و ئەندازەی پابەندبوونیان بە بنەماکانەوە دەبینن.

جۆری تاکەکان لەناو کۆمەڵگادا لەرووی راست تێگەیشتن لە ئایین و سەلامەتی بیرو باوەڕ و هێزی بانگەواز و پەیوەندییان بەکۆمەڵەکەیان و دەستگرتنیان بەبنەماکانی ئیسلام و لەبەرچاوگرتنی مەبەستەکانی و نواندنی ئاکار و رەوشتەکانی لەهەموو کاروبارەکاندا، ئایینی بن یان دنیایی ،لەناو خۆیاندا بێت یان لەناو خەڵکدا، لەپەنهانیدا بێت یان لەئاشکرادا، لەکاتی خۆشیدا بێت یان لەکاتی بەڵاو ناخۆشیەکاندا دەناسرێن. هەروەکو وتراوە پیاوان بەهۆی حەقەوە دەناسرێن واتە بەهۆی حەقدۆستی و حەقویستی و پابەندبوون بەحەقەوە. نەك حەق بەهۆی پیاوانەوە بناسرێت.

تاکی کۆمەڵی برایان پێویستە سوور بێت لەسەر خۆپێگەیاندن و خۆ پەروەردە کردن بە پەروەردەی ئیسلامیی.. تاکو تاکێکی باوەڕ بەهێز و بانگخواز بێت، وەکو پێشینە خواناسەکان شوێنکەوتووی پێغەمبەری مامۆستای بێت ﷺ.

پابەندی کۆمەڵیش لەناو خۆیدا بەبنەما و رێسا ئیسلامیەکانەوە لەهەموو کاروبارێکدا پێویستە...چ لەناو خۆیدا بێت، چ لەدەرەوەی خۆیدا.

---

(٥٨) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص١٥٦–١٥٩.

## چەمکە پەروەردەییەکان لەبیروڕای برایانی موسوڵماندا:

دەتوانین بەکورتی کۆیان بکەینەوە لە:

١- پێکهێنانی بیروباوەڕێکی دروست بۆ هەموو تاکەکان لەسەر بناغەی قورئان و سوننەت.. بەردی بناغەی پەروەردەی تاك و کۆمەڵگەیە هەر وەکو بناغەی کارە، کاری دڵ بێت یان کاری ئەندامەکانی جەستە.

٢- ئەنجامدانی پەرستشەکان و پارێزگارییان، بەرهەمی بیروباوەڕی راستە و هۆکاری سەرەکی بونیادنانی ئوممەتی ئیسلامییە. چونکە پەرستشەکان وەکو نوێژ و رۆژوو و زەکات و حەج باشترین شتێکن کە دڵ دەبستن بەخواوە و ویژدان زیندوو رادەگرن و دەروون هۆشیار دەکەنەوە.

٣- ئەنجامدانی دروستی مامەڵەکان و چاکەکاری تیایاندا بناغەی ئاینداریییە، وەکو پێغەمبەرمان محمدﷺ دەفەرموێت: (**الدين المعاملة**) واتە ئاینداری مامەڵەی دروستە... بەدوای ئەوەشدا خۆڕاهێنان لەسەر ئاکارە ئیسلامییەکان کە لەقورئان و سوننەت و ژیانی پێشینە چاکەکاندا هاتووە و بەهێزکردنی مانای برایەتی لە ئیسلامدا.

٤-پەروەردەکردنی هەمەلایەن بۆ پێگەیاندنی گیانی باوەڕدار و عەقڵی تێگەیشتوو و جەستەی ساغ و بەهێز.

## پرۆگرامی کرداریی پەروەردەکردن لای برایان:

دەکرێت بەکورتی بڵێین ئەمانەن:

### ١-یاسای کەتیبە:

ئەم شێوازە ئیمام بەننا هەر لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی برایانەوە بەکاری دەهێنا، ئەمەشی لە شێوازی کۆبوونەوەی موسوڵمانانەوە لەسەرەتای



هاتنی سروشدا وەرگرتبوو. کاتێك لەماڵی ئەرقەم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کۆدەبوونەوە و لە ئیسلام تێدەگەیشتن، برایان ئەو کاتە ژمارەیەکی کەم بوون، ئیمام کۆی دەکردنەوە دەربارەی کاری بانگەواز قسەی بۆ دەکردن و لەکەش و هەوایەکی پاکدا بایەخی بە پەروەردەکردنی رووحییان دەدا. لەدوای ئەوەوە نوێژی مەغریبیان دەکرد، خواردنێکی سووکیان دەخوارد, پێکەوە باس و خواستیان دەکرد و کەمێکیش دەمەتەقێ. ئەنجا هەموو دوای ئەنجامدانی نوێژی عیشا بەکۆمەڵ، لەژوورێکی فراواندا دەخەوتن. مامۆستایان لەگەڵ بوو. دووسەعات پێش بەرەبەیان لەخەو هەڵدەسان و دەستنوێژیان دەگرت و لەسەرخۆ و هەرکەس بۆ خۆی چەند رکاتێك شەو نوێژی دەکرد پاشان دادەنیشتن، یەکێکیان قورئانی دەخوێند و ئەوانی تریشیان گوێیان لێدەگرت، دوای ئەوە گوێ بیستی وانەیەك لەوانەکانی رابەریان دەبوون کە بۆ گەشەی دەروونی و رۆحی و زانیارییان پێشکەشی دەکردن، لەگەڵ ئەوەدا مێژووی بانگەواز و بانگخوازان و خاڵەکانی لاوازیی و هێزیانی باس دەکرد، پاشان لەگەڵ بانگەوازەکەی خۆیاندا بۆی بەراورد دەکردن، ئەوەشی بۆ روون دەکردنەوە کە چۆن لە کۆسپەکانی رێگا خۆیان لادەدەن و لاوازییەکان چۆن چارەسەر دەکەن، تاکو لەو هەڵانە بەدوور بن کە پێشتر روویان داوە.

پاش ئەوە ماوەی پاڕانەوەی پێش بانگی بەیانی دەهات و هەرکەس بۆخۆی، بەکوڵ نزا و پاڕانەوەو داوای لێخۆشبوونی دەکرد.

ئەنجا بانگی بەیانی دەدرا و لەدوای رابەرەوە بەکۆمەڵ نوێژیان دەکردو دوای ئەوە برێك لەقورئان کە رابەر دیاری کردبوو، مەبەستی دیاریکراویان هەبوو، بۆی تەفسیر دەکردن، تاکو لەبەرکردنی بۆیان ئاسان بێت. ئەمانە تا کاتی خۆر هەڵاتنیان دەخایاند. دوای خۆرهەڵاتن ویردی رۆژانە بەناوی (**الوظیفة**) کە

چەندین پاڕانەوەی قورئانی و فەرموودەیی بوو, کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخوێندن, بەکۆمەڵ دەیانخوێند.

ئەم ویردانە برایان لەبەریان کردبوو و ڕۆژانە دەیانخوێند.

دوای ئەوە نانێکی سادەیان دەخوارد و هەریەکەیان رووی لە کارەکەی دەکرد. هەموو تاکێکی کەتیبەکە نامیلکەیەکی وەرگرتبوو پێیان دەوت: بەرنامەی زانستی(**المنهج العلمي**) ناونیشانی کۆمەڵێك کتێبی تیابوو لەبوارە جیاوازەکاندا و لەهەموو زانستە ئیسلامییەکان. هەروەها کتێبی پەروەردەیی و مێژوویی و. ..هتد. داوا دەکرا لێیان: هەر یەکەیان چەند پێی دەکرێت لێیان بخوێنێتەوە، تاکو گەنجینەیەکی زانیاری بۆ خۆی کۆبکاتەوە، تاکو ڕێگای بانگەوازی لا روون بێت و خۆیشی شایستەی گەیاندنی بێت.

شەوی کەتیبە لەمەڵبەندی گشتی یان لەدەرەوە ئەنجام دەدرا، ئەگەر جێگاکە سازبوایە هەندێك مەشقی وەرزشییان دەکرد، رابەریشیان لەگەڵ بوو, لەوانە ئەسپ سواری.

کاریگەری ئەم شێوازە لەدەروونەکاندا زۆر قووڵ بوو، ئامادەی دەکردن تاکو کۆڵی قورسی بانگەواز هەڵبگرن، بەوەی خۆیان فەرمانەکان جێبەجێ بکەن و خەڵکی تریش لەسەریان رابهێنن تا لە ڕێگای خوادا کار بکەن.

ئەم کارە ڕەنگە قورس بێت بەلای کەسانێکەوە کە ئەنجامیان نەدابێت و جوانی و کاریگەرییان لە پێگەیاندنی نموونە خەباتگێڕەکاندا نەدیبێت، کە لە میسر و وڵاتانی تری ئیسلامدا پەروەردە بوون و ڕۆڵی خۆیان بینی لە پێگەیاندنی زانایان و بانگخوازان و پاڵەوانانی زۆر، کە لەرۆژهەڵات و رۆژئاوای زەویدا مەشخەڵی ڕێنوێنی و هیدایەتدانی خەڵکیان هەڵگرتووە، ئەوانەش لە

نەبەردەکانی فەلەستین دژی جولەکە و رووبەڕووبوونەوەکانی کەناڵ دژی ئینگلیزدا، ئەوەندە لێهاتوو بوون دوژمنان دەیانپرسی ئەوانە کێن؟!

## ٢-یاسای دیدەوانی:

رابەر بەم شێوازە دەیویست ئەو راستییەی کە لە دووتوێی بانگەوازی ئیسلامییدا هەیە دەری بخات، کە بانگخوازانی دەیانەوێت ماناکانی هێز و یاسا و رەوشتی وەرزشکاریی بنوێنن و ئامادەی سەربازییەکی راست بن، کە ئیسلام لەسەر هەموو موسوڵمانێك فەرزی دەکات.



ئیمام لە کاتی مەشقی سەربازی

برایان تیمەکانی دیدەوانییان پێکدەهێنا، ئەمە جگە لەوەی مەشق و راهێنان و سروودی هێنانە جۆشی تایبەتی خۆیانیان هەبوو، لەیەك تیمدا قوتابی و کرێکار و جوتیار و بازرگان و مامۆستا و پیشەوەر و ئەندازیاری تێدا بوو، لاو و پیر و، گەورە و بچوك هەموویان پێکەوە برایەتی ئیسلامیی کۆی کردبوونەوە،

ئاپۆڕای ئەوانە بە پایتەخت و شارەکاندا دەڕۆیشت و دڵی باوەڕدارانی دەهێنایە جۆش.

ئەم تیمە دیدەوانییانە دۆست و ناحەز شاهیدی ئەوەیان بۆ دەدەن کە خزمەتی جوان و کاری چاکیان لەدێهات و شارەکاندا ئەنجام داوە. .. هەر لە نەهێشتنی نەخوێندەواری و هاوبەشیی بەرهەڵستی کولێرا و خزمەتگوزاریی ژینگە.

ئەم کارە لەدوای کۆنگرەی سێیەم لەساڵی (١٩٣٥ ز) زیاتر بایەخی پێدرا و ژمارەیان گەیشتە چل هەزار.

یاسای دیدەوانی وەکو یاسای سەربازی وابوو، کە لەنزیك قاهیرە و شارەکانی تردا برایان سەربازگەیان پێکدەهێنا و خۆیان لەسەر ئارامگرتن و بەرگەی سەختی گرتن و دەروونسازکردن رادەهێنا. هەر سەربازگەیەك بەرنامەی خۆی هەبوو، بریتی بوو لە وەرزش و مەشقی سەربازی و پەروەردەی رۆحی و بابەتی رۆشنبیریی و لە کۆتایشدا تاقیکردنەوەی هەبوو.

## ٣-یاسای شانە (الأسرة):

## پایەکانی ئەم شێوازە سیانن:

یەکترناسین و لەیەکتر تێگەیشتن و زامنی یەکتر کردن (**التعارف و التفاهم و التکافل**).

ئەوەی لەکۆبوونەوەی شانەدا دەگوزەرێت بریتییە لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەندامان و شارەزابوون لەباس و بابەتەکانی ئیسلام و لێکۆڵینەوەی بەسوود دەربارەی پرسەکانی موسوڵمانان و بەدیهێنانی ماناکانی برایەتی.

پەیوەندی نێوان ئەندامانی شانە لەسەر بناغەی برایەتی و هاوکاریی و چاکە ویستن بۆ یەکتری دادەمەزرا.

هەر شانەیەك لە ژمارەیەك ئەندام پێکدێت کە لەحەوت زیاتر نەبێت و بەرپرسێکی هەیە بەگوێرەی یاسایەکی تایبەت پێکەوە بەستراون و پەیوەستن بەلقەکانەوە، کە ژمارەی لقەکان لە کۆتایی چلەکانی سەدەی بیستەمدا لە میسر نزیکی دوو هەزار لق بوون.

شانە یان ئوسرە بە پرۆگرامێکی پێگەیشتنی تایبەت، قۆناغ قۆناغ بەرەو پێشەوە دەبرا، چالاکییەکانی ئەو پرۆگرامە هەمە لایەنە بوون، بایەخی بە سەلامەتی و پێگەیشتنی جەستە و عەقڵ و رۆحیش دەدا.

ئوسرە دانیشتنی هەفتانە و مانگانەی هەبوو کە لەو دانیشتنانەدا قسە لەسەر بارودۆخ دەکرا و رووداوەکان شیدەکرانەوە.

هەندێ جار لەنوێژی هەینیدا، یان لە گەشتێکی تایبەتدا کۆدەبوونەوە و ئەندامانی لەسەر بناغەی یاسای زامنداریی ئیسلامیی دەژیان. .. سندوقێکی هاوکارییان هەبوو ئابوونە و بەخششەکانی تێدا کۆدەکرایەوە و بەشێکی لێ دەدرا بە لقەکەیان بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی و پیادەکردنی پرۆسە کۆمەلایەتی و ئابووری و تەندروستییەکانی.

ئوسرە لانەی پەروەردەیی نەوەکان و چاك ئامادەکردنیان بوو بەشێوازێکی ئیسلامیی دروست، هەروەکو پەناگایەکیش بوو کە لاوانی تێدا لە هاوڕێی خراپ و داب و نەریتە خراپەکانی نێوکۆمەڵگە دووردەخرانەوە.

لە ئوسرەدا زۆر بایەخ بە لێکۆڵینەوە لەسیرەی پێغەمبەر ﷺ و هەروەها جوان خوێندنەوەی قورئان و لەبەرکردنی و تیگەیشتن لەمانا و مبەستەکانی دەدرا.

## ٤-یانە وەرزشیەکان:

برایان لەشارو لادێکاندا بەشێوەیەکی گشتی گرنگیان بە یانە وەرزشیەکان دەدا، تاکو لاوان روویان تێبکەن و مومارەسەی هەموو جۆرەکانی وەرزش و یارییەکانی خۆ بەهێزکردن بکەن و هاتوچۆی ئەو کتێبخانانە بکەن کە لەناو یانەکاندا هەبوون. . تاکو لەسەر خوێندنەوە رابێن و سوود لە باس و بابەتەکانیان وەربگرن، لەکاتی نوێژیشدا لە نوێژگەی یانەکاندا نوێژیان بەکۆمەڵ ئەنجام دەدا، بۆ ئەو مەبەستە دەچوونە ئەو مزگەوتانەی کە لە نزیکیانەوە بوون.

بەمانەش لاوان ئارەزووە وەرزشیەکانیان تێردەکردو لەپاڵ ئەوەشدا خۆیان شارەزاو رۆشنبیر دەکرد و ماناکانی باوەڕ و خواناسیش لە دڵیاندا بەهێز دەبوو و خۆیان لەسەر ئەوە رادەهێنا کە لەگەڵ بیستنی دەنگی بانگدا، بەرەو ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ بچن.

هەر یانەیەك لەم یانانە کەسێکی بەتوانا بەڕێوەی دەبرد و لەهەموو لایەنێکەوە چاودێری چالاکییەکان و پارێزگاری رەووتی بەڕێوە چوونی کارەکان و هاتنەدی ئامانجەکانی دەکرد.

## ئاسەوارەکانی پەروەردەی برایان:

یەکێك لەو برایانەی کە لە ئوسرەی برایاندا پێگەیشتووە دەڵێت: ئوسرە لە نێوانماندا خۆشەویستی و سۆزێکی پێکهێنا تاکو ئێستاش کە (٣٥)ساڵ بەسەریدا گوزەراوە، هەست بە خۆشییەکانی دەکەم. بەشێوازێك بوو ئەگەر یەکێك لەسەر ئەو برایەتییە سوێند بدرایە بەمەرامی دەگەیاندیت [٥٩].

(٥٩) النقط فوق الحروف، أحمد عادل کمال، ص ٧٣.



+ بە دوای ئەودا کەسێکی تر دەربارەی کەتیبەکانی برایان دەڵێت: لەدوای ئەنجامدنی هەر کەتیبەیەکەوە وام دەزانی تازە لەدایك بووم، لەم هەستەدا هەموو هاوڕێکانم لەگەڵمدا هاوبەش بوون، ئەوانەی لەو کەتیبانەدا هاویەشییان کردبێت وادەزانم بە خۆشترین کاتەکانی تەمەنیان دەزانن. کەتیبەکەی ئێمە (٣٠) لاو بوو لە چاکترینی لاوانی برایان.. ئەگەر شوێنی مێژووی ئەوانە بکەویت، ئێستا چین و لەکوێن وکاریگەرییان لەسەر کۆمەڵگە چی بووە، زۆر سەرت سوڕدەمێنێت و دڵت بەکاریان زۆر خۆشدەبێت[٦٠].

– لەکۆنگرەی کۆتایی برایانی موسوڵماندا لەمەڵبەندی گشتی، مامۆستا (**سیدقطب**)، دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵە زۆرانەی قوتابیانی بینی، وتی: دەزانن کاریگەریی پەروەردەی ئیسلامیی لەسەر لاوان چییە؟ ئەو کاریگەرییە ئێوەن، ئەوەیە کە کەرەسەی خاو مرۆڤ بکاتە لاوانێکی وەکو ئێوە... لاوانێك یەکگرتوو و بەهێز و زەبر وباوەڕدار و کۆڵنەدەر، خۆیان بەخوا فرۆشتبێت.

ئێوە نموونەی زیندووی پەروەردەی ئیسلامیین.. ئێوە جێبەجێکاری فەرمانەکانی خوای گەورەن لەزەویدا، با بیست ساڵ بگەڕێینەوە دوا، با سەیری لاوانی ئەو سەردەمە بکەین (یان هەر سەردەمێکی غافڵی و دنیاپەرستی) دەبینین لاوان رۆچوو و سەرکەش و بێ ئامانج و بێ بەرنامەن، چونکە لە پەروەردەی ئیسلامیی دروست بەدوور و نامۆن.

لەهەموو سەردەمێکدا ئیسلام لەو چەشنە لاوانە پاڵەوانان بەرهەم دەهێنێت و پاڵەوانانێك جێی شانازی بن، لەئیسلام و موسوڵمان بوونی خۆیان شەرم نەکەن و لەئەنجامدانی ئەرکەکاندا کەمتەرخەمی نەکەن و هەرگیز دەستەمۆی داگیرکەران نەبن، بەڵکو نەخشەکانیان پووچەڵ بکەنەوە..

---

(٦٠) (٢٥)عاماً في جماعة حسن دوح، ص٣١.

لاوانێك بە (دەنلۆب) وەزیری بەریتانیان وت: (لە ئەمڕۆوە ناتوانن بمانکەنە کۆیلە).

– هەر لەو وتەیەدا دەڵێت: لەساڵی (١٩٢٠) دا ویستمان پەیوەندی قوتابیانی موسوڵمان پێك بهێنین. .. سەرۆکی حکومەت و گەورە پارتەکانی ئەو سەردەمە گاڵتەیان پێدەکردین... دەیانوت: ئەگەر ناوی (قوتابیانی عەرەب)تان لێنایە پەسەند دەبوو. بەڵام ئەمڕۆ بانگەواز بۆ ئیسلام جێگای پێکەنین و گاڵتەجاڕی نییە (بەڵکو جێگای شانازی و ڕێزە).

– چارەکە سەدەیەك دوای ئەوە خاوەنی مەوسوعەی مێژووی ئیسلامیی دکتۆر (أ**حمد شلبي**) دێت. وەکو مێژوو نووسێکی پسپۆڕ و چاودێرێکی ژیاو لەگەڵ ڕووداوەکان و ئاگادار لە کۆمەڵگە شاهیدی خۆی دەدات و دەڵێت: ئەم کۆمەڵە ڕۆڵێکی ئیسلامیی بێ وێنەی لەژیانی منداڵ و لاو و پیاواندا بینی. . ڕەوشتی ئیسلامیی لەدڵی چەندەها ملیۆندا ڕواند... موسوڵمانبوونی کردەوە بەشانازی و بەکۆمەڵ لاوی لەخواترس و کار دروستی بەنوسینگەو کارگە و دامودەزگاکان بەخشی، کە بێ چاودێر کاریان دەکردو بە دەستپاکی و چالاکیی ناویان دەرکردبوو. پاکی و چالاکی ئەوان وشەی برایانی موسوڵمانی کردبوویە مۆری خۆپاراستن لەهەموو هەڵەیەك، هەرچەند بچووکیش بێت و دوور بوون لەبەرتیل و کەمتەرخەمیی.

لەهەر کوێ کەسێك بەجوانی کاری ئەنجام بدایە و دڵسۆز و چالاك بووایە و بەرتیلی نەخواردایە، یەکسەر دەوترا ئەوە سەر بە برایانی موسوڵمانە) (٦١).

لە لێکۆڵینەوەیەکدا لە ژێر ناونیشانی (**حرکة الشعبیة الاسلامیة و الصناعة الأدبیة الحالیة في مصر**) (**دکتورة کاری ڕەدزنیسکی**)، توێژەر لە

(٦١) موسوعة التأريخ الإسلامي – احمد الشلبي.

(زانکۆی هارفارد)ی ئەمریکی ئاماژە دەکات کە ئیمام بەننا هەزاران لاوی لە چایخانەکانی میسر و لەپەناگەی مادە سەرخۆشکەر وبێهۆشکەرەکان دەرهێنا و کردنییە بانگخواز بۆ ئیسلام، لەفەوتان و تیاچوونەوە دەستی گرتن و هێزی لاوێتیانی خستەکار و لە گۆڕەپانی سیاسیدا بەربەرەکانێی کۆنترین پارتی سیاسی میسری پێ کردن.

- هەروەها لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەژێر ناونیشانی (**الإخوان المسلمون في التراث الشعبي المصري**) (دکتور دیڤید کۆمونز) پرۆفیسۆر لە انکۆی ویکنسۆن)ی ئەمەریکی دەڵێت: (ئیمام بەننا مانایەکی نوێی بۆ لاوانی میسر کە لەناو مادە سەرخۆشکەرو هۆشبەرەکاندا نغرۆ بووبوون-بەخشی، ئەوەش بەهۆی ئەو زانیاریانەوە کە لەکۆبوونەوەکانیاندا فێری دەبوون و لە خوێندنەوەی پەیامەکانی ئیمام بەنناوە وەریان دەگرت، هەروەها توانی ئەو کۆمەڵە لاوە خاو و تەمەڵانە بکاتە هەڵگری مەشخەڵی چالاکیی و کارکردنی ئیسلامیی لە کۆمەڵگای میسریدا).

- ئەم پەروەردەیە لاوانی برایانی بەرزکردەوە و توانییان ببنە نموونەیەکی زیندوو بۆ ئەم ئایینەی خەڵکەکەی وازیان لێ هێنابوو، توانییان ئەوە بسەلمێنن کە ئەم ئایینە دەتوانێت بی سەرویەری بگۆڕێت بەیاسا و تۆوی رەوشت لەناو دارو پردووی خراپەکارییدا بڕوێنێت و یاخی و رێگا لێ ونبووان بکاتە خواناس.

مامۆستای رابەر چەندین لەو نموونانەی باسکردووە، یەکێك لەوانە چیرۆکی لاوێك بوو کە لە پاکیزەیی و عیفەتیدا تاقی دەکرێتەوە ئەویش خۆی چەپەڵ ناکات. ... ئەو لاوە (**عبدالعزیز علاّم**)بوو، لەیەکێك لە سەربازگەکانی ئینگلیزدا بەرگدرووی دەکرد. .. ژنی یەکێك لە گەورە ئەفسەران بۆ ئەنجامدانی کارێکی بەرگدرووی بانگی دەکاتە ماڵەکەی خۆی. .. تاکو بە تەنیا لەگەڵیدا

بێت... بەچەندین هۆكاری فریودان بەدەوریدا دێت، ئەویش ئامۆژگاری دەكات و لەسەرنجامی ئاوا كارێك دەیترسێنێت. پاشان ژنەكە بەوە هەڕەشەی لێدەكات كە هەواڵ بەمێردەكەی دەدات، كە دەستدرێژی كردوەتە سەری. ..بەڵام هەر بۆی نەرم نابێت. . دوای ئەوە دەمانچە لەسەر سنگی دادەنێت. . لاوەكە بەدامەزراوییەوە دەڵێت: من لە خوای پەروەردگار دەترسم. ژنە وای نیشان دەدات كە دەیەوێت بیكوژێت و پاشان دەڵێت: بۆیە كوشتوویەتی چونكە لەماڵەكەی خۆیدا هێرشی كردووەتە سەری و ویستوویەتی دەستدرێژی بكاتە سەری.

بۆ ئەو مەبەستە قەرەوڵی لێدەگرێت و لاوەش چاوەكانی دەنوقێنێت و هاوار دەكات (**لاإله إلاّ الله محمد رسول الله**) ژنەكە بەو هاوارە دەحەپەسێت و دەمانچەكە لە دەستی دەكەوێـتە خوارەوە و چاری نامێنێت جگە لەوەی دەرگای ماڵەكەی بۆ بكاتەوەو داوای چوونە دەرەوەی لێ بكات. .. لاوەكە دەچێتە دەرەوە بە راكردن تاكو بارەگای برایانی موسوڵمان ناوەستێت.. لەوێ بە مامۆستای رابەر دەگات، ئەویش دەڵێت: بەهۆی ئاوا كارانێكەوە خوای گەورە فەڕو پیرۆزی دەخاتە ئەم بانگەوازەوە و بەم چەشنە دڵانی پێ رۆشن دەكاتەوە[٦٢].

## بۆچوونی ئیمام بەننا دەربارەی سۆفییەتی :

رەنگە گونجاوبێت راوبۆچوونی دەربارەی سۆفییەتی، هەروەكو خۆی لەیاداشتەكانیدا نووسیویەتی بزانین ئەو دەڵێت:[٦٣]

(٦٢) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص٦٧–٧٠.

(٦٣) مذكرات الدعوة و الداعية، حسن البنّا ص ٢٦–٣٢.

کاتێك سنووری دەوڵەتی ئیسلامیی لەسەدەی یەکەمیدا فراوان بوو، وڵاتانی زۆر هاتنە سایەی فتوحاتی ئیسلامیی و خەڵکێکی زۆر روویان لە موسوڵمانان کرد... خێرو بێریان لە هەموو لایەکەوە بۆ هێنرا و خەلیفەکەیان بەهەوری دەوت: بۆ رۆژئاوا بچیت یان رۆژهەڵات لە هەر کوێ ببارێنی خەراجەکەت دێتەوە بۆ من.

لەبارودۆخێکی وادا ئاساییە خەڵکی رووبکەنە دنیا و چێژ وەرگرتن لەخۆشی و جوانییەکان، هەندێك بەرادەیەکی کەم و هەندێکیش بەرادەیەکی زۆر. .. لەو حاڵەتەشدا ئاساییە کەسانێك سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بێننەوە یاد و دەستکورتی و کەم تفاقی ئەو کاتە بەراورد بکەن لەگەڵ حاڵەتە نوێیەکەدا. ئەوکاتە کۆمەڵێك پارێزکار و زانا و خواویست و بەڕێز حەزیان وابێت وەکو پێغەمبەر و هاوەڵانی بژین و ئەم خۆشی و جوانییەی دنیا بخەنە کەنار و رووبکەنە زوهدو کەمکردنەوەی چێژە دنیاییەکان و خەڵکیش بۆ ئەوە هان بدەن و، لەبری خۆشییەکانی دنیا چاو ببڕنە خۆشی و چێژەکانی قیامەت، کە خۆشی راستەقینە و بێخەوش و بێسنوور و بێکۆتا لەوێیە.

خۆزگە ئەمە لەلایان روون بووایە **وإن الدار الآخرةَ لَهي الْحيوانُ لو كانوا يعلمونَ** العنكبوت/٦٤.

یەکێك لەوانەی زۆر زوو ئەم بانگەوازەی لێ بیسترا زانای خواناس و ئامۆژگارکاری گەورە مامۆستا (**حسن البصري**) بوو، دوایی زۆرێك لەهاوشێوەی ئەو لە بانگخوازان و صاڵحان هەمان هاواریان لێ بەرزبوویەوە.. ئەوانە لەناو خەڵکدا بوونە کۆمەڵێکی ناسراو، کە بانگەوازیان بۆ یادی خوا و رۆژی دوایی و کەمکردنەوەی دنیا و خۆڕاهێنان لەسەر گوێڕایەڵی خوا و پەروەردەکردنی دەروون دەکرد.

ئەم رەوتە رێگای گرتە پێش، وردە وردە راستییەکان گۆڕانیان بەسەردا هات و شێوازی زانستێکی وەرگرت کە گرنگی بەهەڵس و نشتی مرۆڤ دەدات و رێگای دروستی لە ژیاندا بۆ دیاری دەکات، کە سەرەتاکەی یادی خوا و ناسینی و پەرستنیەتی و کۆتاییەکەشی گەیشتنە بە بەهەشت و رەزامەندی خوا.

ئەم بەشە لە زانستی سۆفییەتی پێی دەوترێت: زانستی پەروەردە و رێکردن (**التربية و السلوك**)... گومانی تێدا نییە کە لە کرۆکی ئیسلامەوەن، سۆفییەکانیش ئەم زانست و رێبازەیان گرتە پێش بەرەو پێگەی چارەسەری دەروونی و دەرمانکردن و نوشتە بۆ کردن بردیان و گەیاندیانە قۆناغێك کە پەروەرشکارانی تر پێی نەگەیشتن. ئەمانە خەڵکیان لەسەر شێوازی کرداری لە جێبەجێکردنی فەرمانەکان و وازهێنان لەقەدەغە کراوەکان و بەراستی رووکردنە خوا رادەهێنا، زۆر جار زیادەڕەوی تێدا دەکرا و ئەو بارودۆخەی ئەو سەردەمەش کاریگەری لەسەریان دەبوو.

نموونەی ئەمانەش وەکو زیادەڕەوی لە بێدەنگی و برسێتی و نەخەوتن و کەنارگیریدا.

هەرچەند هەریەك لەمانە بناغە و سەرچاویەکی هەیە. کە بێدەنگی سەرچاوەکەی وازهێنانە لەقسەی خراپ و بێسوود (اللغو) وسەرچاوەی برسێتی رۆژووگرتنە و سەرچاوەی نەخەوتن شەونوێژ کردنە و سەرچاوەی کەنارگیریش خۆلادانە لەئازاردانی خەڵك. ..

خۆ ئەگەر ئەو کارە لەو سنوورەدا بمایە کەشەرع نەخشەی بۆ کێشاوە ئەوە زۆر چاك بوو.

بەڵام بیرۆکەی بانگەوازی سۆفییەتی لە سنووری پەروەردە و رێکردندا نەوەستا... خۆ ئەگەر لەو سنوورەدا بوەستایە ئەوا بۆ خۆیشی و بۆ خەڵکیش



زۆر چاك دەبوو.. بەڵام دوای چەرخەكانی یەكەم سەری كێشا بۆ شیكاری زەوق و شتەكان و, فەلسەفە و لۆژیك و, پاشماوەی فیكری و ئوممەتانی تریشی تێكەڵ كرا. ..بەوە شتانێكی دەرەوەی ئاییندارییی لێوە ئاڵرا، كەلێنێكی فراوانی لێ كرایەوە كەسانێكی دوور لەخوا و درۆزن و بێباوەڕ و بیرهەڵە و دنیا پەرست قۆستیانەوە بەناوی ئاییندارى و سۆفییەتییەوە بانگەوازیان بۆ زوهدو خۆگرتنەوەو حەزكردن لەگەیشتن بە بەرهەمە رۆحیە پڕ بەهرەكانیان دەكرد...تاوای لێهات هەر شتێك لەوبارەیەوە نووسرابێت پێویستی بە تێڕوانینی ورد هەیە لەلایەن زانایانی ئایین و ئەوانەی كە سوور بوون لەسەر پاراستنی سۆفییەتی بەخاوێنی و بێگەردی.

ئیمام بەننا كە خۆی گۆشكراوی سۆفییەتی بوو و ماوەیەكی زۆر هاوبەشی كردبوو لە ئەڵقەكانی زیكر و وتنەوەی سروودەكانی، قەصیدەی **(إبن الفارض)** ی لەبەر بوو، تێگەیشتبوو كە پێویستە خۆی بۆ بانگەواز بۆ ئایینی خوا یەكلا بكاتەوە و ئەوەش باشترین رێگای چاكسازییە بە بەرنامەی ئیسلام. لەو بارەیەوە خۆی یەكلاكردەوە و بڕیاریدا و دەڵێت: كاتی ئەوە هاتووە كە لەهەموو بانگەشەیەكی گوماناوی بەدووربم و مەبەستم بەئاشكراو بێ پەردە دەربارەی چاكسازیی ئیسلامیی روون بكەمەوە، كە بەكورتی بریتییە لە گەڕانەوە بۆ لای قورئانەكەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەكەی ﷺ و خاوێنكردنەوەی عەقڵەكان لە خورافات و واقیعی ژیان لە نادروستیی و گێڕانەوەیان بۆ لای ئایینی ئیسلامیی پاك و بێگەرد [٦٤].

(٦٤) مذكرات الدعوة و الداعیة، حسن البنّا، ص٦٧.

## هزری سیاسی لە پەیامەکانی ئیمام بەننادا

رۆبێر جاکسۆن لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: بانگەواز و پەیامێك نیە و نەبووە لە جیهاندا، لەرۆژهەڵات یان رۆژئاوا، لەکۆن یان لەنوێدا، کە لێی نەکۆڵیبێتەوە، یان لەبارەیەوە شتی نەخوێندبێتەوە، دەربارەی سەرکەوتن یان تێکشکانی پاڵەوان و سەرکردەکانی بەدواداچوونی نەکردبێت. دەڵێت: ئەو زمانی ئەزهەر و زانکۆییەکان، پزیشك و ئەندازیاران، سۆفییەکان و ئەهلی سوننەت دەزانێت، شارەزای شێوازی قسەکردن و خوو نەریتی ناوچەکانی میسرە لەدەلتاوە تابیابان و لەناوەڕاستەوە بۆ باشوور. ئەو لەبارەی ئیمام بەنناوە دەڵێت:لەپرسە ئیسلامییەکان و رووداوە سیاسییەکان زۆر ئاگادارە(٦٥)

دکتۆر ئیسحاق حسەینی لەبارەی رۆبێر جاکسۆنەوە دەڵێت: رۆبێر جاکسۆن بۆ خۆی دەزگایەکی زانیاری تەواو و فراوانە، لەهەر باسێك بییەوێت بە بێ گەڕانەوە بۆ سەرچاوە، سووك و ئاسان و بەشێوەی گونجاو قسەی لێ دەکات(٦٦).

ئیمام بەننا دەڵێت: برایانی موسوڵمان کۆمەڵێکی سیاسیین، بانگەوازەکەیان بانگەوازێکی سیاسییە، ئەی گەلی ئێمە کاتێك هاوارتان لێدەکەین قورئان بەدەستی راست و سوننەت بەدەستی چەپمانەوەیە و کردەوەی پیاوچاکانی پێشینی ئەم ئوممەتە لەبەر چاوماندایە، ئێمە بۆ لای ئیسلام و رێنمایی حوکمەکانی بانگتان دەکەین. ئەگەر ئەمە لای ئێوە کارێکی سیاسییە، دەی ئەوە سیاسەتی ئێمەیە. .. دەشتانەوێت ناوی بنێن سیاسەت ئەوە مەیلی

(٦٥) حسن البنّا الرجل القرآني، روبير جاكسون.

(٦٦) الإخوان المسلمون و جماعات الإسلامية في الحياة السياسية المصرية، زكريا سليمان، ص٧٧.



خۆتانه. ..ناو هەرچی بێت زیانێك له ئێمه نادات، کاتێك ناولێنراو، دیار و ئامانج ئاشکرا بێت [٦٧].

## هەندێ بنەمای بنەڕەتی ئیسلامیی:

یاسای ناوخۆیی لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، بەگوێرەی ئایەتی: ﴿**وأنْ احكُم بينهم بِما أنزلَ الله ولاَ تتبِع أهواءَهم واحذَرهم أنْ يفْتنوك عن بعض ما أنزلَ الله إليك**﴾**المائدة/٤٩**. لەسەر جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامیی دادەمەزرێت و، حکومەتی ئیسلامیی بەرجەستەکاری بیرۆکەی ئیسلامییه لەڕووی فەرمی و نێودەوڵەتییەوە. .. ئەو حکومەتەش لەئاراستەی ئیسلامەوە هەموو کاروبارەکان بەڕێوە دەبات. .. هەر بەو شێوەیە هەموو یاساکانی دەوڵەت سیاسی بن یان دادوەری و فێرکاری و راگەیاندن و. ... هتد یاسای ئیسلامین.

## حکومەت لە ئیسلامدا:

ئیسلام حکومەت بە پێکهێنەری بنەڕەتی ئەو یاسا کۆمەڵایەتییە دادەنێت کە بۆ خەڵکی هێناوە. ..چونکە ئیسلام رێگا بە ئاژاوە و بێ سەروبەری نادات و، رازی نابێت موسوڵمانان بێ پێشەوا بن.. پێغەمبەر ﷺ بەهەندێ لەهاوەڵانی فەرموو (**إذا نزلت ببلدٍ وليس فيه سلطان فارحل عنه**) واتە: ئەگەر رێگات کەوتە وڵاتێك حکومەت و دەسەڵاتی تێدا نەبوو بەجێی بهێڵە. **هەروەها** فەرموویەتی: ئەگەر سیان بوون یەکێکتان بکەنە کاربەدەستان (**إذا كنتم ثلاثة فأمّروا عليكم رجلاً**).

(٦٧) دعوتنا للإمام حسن البنّا.

ئیمامی غەزالی دەڵێت: بزانە کەشەریعەت بناغەی حوکمە و فەرمانڕەوا پاسەوانیەتی، جا ئەو شتەی بناغەی نەبێت دەڕوخێت و هەرشتێك پاسەوانی نەبێت تیادەچێت.

دەوڵەتی ئیسلامییش کە دەوڵەتی پەیامدارییە، لەسەر بناغەی بانگەواز دەوڵەت دانامەزرێنێت، پێی وایە: بانگەواز لەپەنای دەسەڵاتێکدا نەبێت کە بیپارێزێت و بڵاوی بکاتەوە و پاڵپشتی لێ بکات بەرێوە ناچێت.

## جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت:

یەکەم هەڵەیەك کە لە ڕووی کردارییەوە کردوومانە ئەوەیە: کە ئایینمان لەسیاسەت جیاکردەوەتەوە، هەرچەندە لەڕووی تیۆریەوە نەمانتوانیوە و، لەدەستوردا بەدەق نوسیومانە: کە ئایینی فەرمی دەوڵەت ئیسلامە. بەڵام ئەم دەقە رێگای لە پیاوانی سیاسی نەگرتووە کە خواستی ئیسلامیی لەعەقڵەکاندا تێکبدەن و تێڕوانینی ئیسلامیی لەدەروونەکاندا بشێوێنن و جوانی ئیسلامیی لەکاروبارەکاندا وەدەرنێن [٦٨].

هزری سیاسی لە زۆربەی دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا لە بیستەکان و سییەکانی سەدەی رابووردوودا بەهزری عیلمانی کە ئایین و سیاسەت لێك جیادەکاتەوە کارلێك بوو... داوا دەکرا کە ئایین لە ژیان دوور بخرێتەوە و ئوممەت بانگەشە بکرێت خۆی بخاتە باوەشی ژیاری رۆژئاوای پێشکەوتوەوە و چاك و خراپ و تاڵ و شیرینی ئەوان بکێشێتە ژیانی خۆیەوە... بەو چەشنەی (**طه حسین**) لەپەڕاوی (**مستقبل الثقافة في مصر**) بانگەشەی بۆ دەکات.

---

(٦٨) مشكلاتنا في ضوء النظام الاسلامي، ص ٣١٧، مجموعة الرسائل.



ئەو کودەتا عەلمانییەی ئەتاتۆرك لەتورکیا کردی، کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر هاندانی ئەم هزرە و بڵاو بوونەوەیشی.

لەبەرامبەری ئەم شاڵاوە عەلمانییەوە خەڵکانی باوەڕدار و ئایین پەروەر وەستان (**جمال الدين الأفغاني**) و (**محمد عبده**) لەمیسر پێشەوایی رووبەڕوو بوونەوەی شاڵاوی عەلمانییان دەکردو بۆ ئەو مەبەستە لەوڵاتانی مەغریبی عەرەبی و لە ئاسیا و ئەفەریقا چەندین بزوتنەوەی ئیسلامیی پەیدا بوون و دوای ئەوانیش بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی بیستەمدا سەری هەڵدا، دژی ئەوە وەستان کە ئایین لە سیاسەت جیابکرێتەوە..

مامۆستا حەسەن بەننا کە دامەزرێنەری ئەم بزوتنەوەیە گەورەترین کاریگەری هەبوو بۆ سەرخستنی ئەم بانگەوازە و دامەزراندنی بنەماکانی و بڵاوکردنەوەی بەناو خەڵکدا و بەرزکردنەوەی لەسەر شانۆی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا.

گرنگترن بنەمایەك کە لەمێشکی گەلدا سەلماندی و چەسپاندی، ئەوەیە کە ئیسلام ئایین و دەوڵەتە، پەرستش و یاسای ژیانە و، سیاسەت بەشێکە لە ئایین و فەرمانڕەوایی بەشەریعەتی ئیسلام خواستی هەموو موسوڵمانێکە و ئەو هەموو خراپە و گەندەڵییەی خەڵك تێی کەوتوون چارەسەر ناکرێت بەگەڕانەوە بۆ ئیسلام نەبێت.

## پایەکانی فەرمانڕەوایی ئیسلامیی:

حکومەت لە ئیسلامدا لەسەر چەند رێسایەکی بڕیاردراو پێکدێت، ئەو رێسایانە پەیکەری یاسایی فەرمانڕەوایی ئیسلامیین: حکومەت لەسەر رێسای

بەرپرسیارێتی فەرمانڕەواو دەسەڵاتی خەڵك و ڕێزگرتنی ویست و داواکاریەکانیان دادەمەزرێت. .. دوای ئەوانە ناو, یان شێواز بەگرنگ ناگیرێت.

## یاسای نوێنەرایەتی( النظام النيابي ):

فیقهزانان دەڵێن: یاسای نوێنەرایەتی لەسەر بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوا و دەسەڵاتی گەل و ڕێزگرتنی ویستە شەرعییەکانی رادەوەستێت، **هیچ** بەربەستێکی تێدا نیە ڕێگا لەیەکیەتی و یەکڕیزی گەل بگرێت و چەند بەرەیی و جیاوازی مەرجی ئەو نین. هەرچەندە هەندێك لایان وایە، کە یەکێك لە پایەکانی یاسای نوێنەرایەتی پەرلەمانی بوونی فرەیی حزبییە. .. ئەمە هەرچەند بووەتە نەریت بەڵام مەرجێك لەمەرجەکانی یان پایەیەك لەپایەکانی نییە.

بەم پێیە لەرێساکانی یاسای نوێنەرایەتییدا شتێکی نەگونجاو نیە لەگەڵ ئەوەی ئیسلام بۆ یاسای فەرمانڕەوایەتی بڕیاریداوە. کەواتە ئەم یاسایە لەگەڵ یاسای ئیسلام دوور، یان نامۆ نییە، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەڵێین: ئەو رێسا بنەڕەتیانەی دەستووری میسری لەسەری داڕێژراوە لەگەڵ رێساکانی ئیسلام ناکۆك نین، بەڵکو داڕێژەرانی دەستووری میسری کە ویستوشیانە لەسەر تازەترین بنەما و نوێترین بیروڕای دەستووری دایبڕێژن، لەئەنجامدا بەوە گەیشتوون کە یاسای نوێنەرایەتی لەگەڵ هیچ دەقێکی یاسای ئیسلامدا نەگونجاو نییە. ..جا یان رێك لەگەڵ ئەو دەڕوات، وەکو ئەوەی بەدەق نوسیوویەتی کە ئایینی فەرمی دەوڵەت ئیسلامە، یان دەکرێت بەشێوازێك لێکبدرێتەوە کە لەگەڵیدا ناجۆر نەبێت، وەکو ئەو دەقەی دەڵێت: (سەربەستی بیروباوەڕ زامنکراوە).

چاك وایە لێرەدا ئاماژەیەك بۆ جیاوازی نێوان دەستوور و یاسای دادگاكان بكەین كە زۆریان لەگەڵ ئەوەی ئیسلام هێناویەتی گونجاو نین.

لەگەڵ ئەوەی یاسای نوێنەرایەتی و دەستووری میسری لە رێسا بنەڕەتییەكاندا لەگەڵ ئەوەی ئیسلام دەربارەی یاساكانی فەرمانڕەوایی دایناوە ناتەبا نین، بەڵام راشكاوانە دەڵێین كە دارشتنە دەستوورییەكان ناتەواوی و كەموكورییان تێدایە، جگە لەوەی لە ڕووی جێبەجێكردنیشەوە خراپ جێبەجێ دەكرێن و كەمتەرخەمی تێدایە، چ دەربارەی رێسا بنەڕەتییەكان كە ئیسلام هێناویەتی، چ دەربارەی دەستووریش كە لەسەری دامەزراوە. . ئا ئەوەیە بووەتە هۆی ئەو هەموو بشێوی و گەندەڵییە لە ژیانی نوێنەرایەتییدا(٦٩).

## بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوا – وەزارەت :

لەیاسای ئیسلامییدا سەرۆكی دەوڵەت هەركەس بێت بەرپرسیارە، كە كاروبارەكان ئەنجام بدات و پاساوی كارەكانیشی بۆ گەل روون بكاتەوە، جا ئەگەر چاكی كردبوو ئەوا پێویستە گەل كۆمەكی بكات و ئەگەر خراپیشی كردبوو پێویستە راستی بكاتەوە.

لە ئیسلامدا رێگەی ئەوەش نەگیراوە كە سەرۆكی دەوڵەت كە سێكی تر راسپێرێ بۆ بەجێهێنانی ئەركەكان و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی تاكو خۆی سەرپەرشتیار بێت بەسەر حكومەت و كاربەدەستانەوە. ئەوكاتە وەزارەتی لەو چەشنە پێی دەوترێت وەزارەتی كارپێسپاردن(**وزارة التفويض**) وەكو چۆن لەزۆربەی سەردەمەكەكانی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا پیادەكراوە، فیقهزانانی موسوڵمانیش مۆڵەتیان پێداوە بەمەرجێ بەرژەوەندی لەوەدا بێت. رێسای دروستی ئەم كارەش هاتنە دی بەرژەوەندی گشتییە.

---

(٦٩) مشكلاتنا في ضوء النظام الإسلامي، حسن البنّا، ص٣١٧–٣١٩ مجموعة الرسائل.



ماوردی لەپەڕاوی (**الأحكام السلطانية**) دا دەڵێت: وەزارەت دوو جۆرن وەزارەتی کارپێسپاردن و وەزارەتی جێبەجێکردن. یەکەمیان بەوە دەبێت پێشەوای موسوڵمانان کەسێك دەکاتە کاربەدەست و بەجێهێنانی کارەکانی پێدەسپێرێت، ئەویش بەگوێرەی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆی بەڕێوەی دەبات. بۆ پاڵپشتی ئەم باسە ئەم ئایەتەمان هێناوە کە خوای گەورە باسی حەزرەتی موسا دەکات کە داوای کردووە لە خوای گەورە هارونی برای بەوەزیر بۆ دابنێت تاکو پاڵپشتی بێت و لەبەڕێوەبردنی کارەکاندا یاریدەی بدات: ﴿**واجعلْ لي وزيرا من أهلي(٢٩)هارونَ أخي(٣٠)اشدد به أزري(٣١)وأشركْه في أمري(٣٢)**﴾طه/ ٢٩ –٣٢.

جا ئەگەر وەزیردانان بۆ یارمەتیدان و راپەڕاندنی کارەکان، لە کاروباری پێغەمبەرایەتیدا دروست بوو بێت، ئەوا بۆ پێشەوایەتی موسوڵمانان دروستترە، چونکە ئەو کارانەی دەدرێتە دەستی پێشەوای ئوممەت جێبەجێکردنی نەگونجاو و مەحاڵە لە رێگای راسپاردن و جێگر دانانەوە نەبیت، خۆ دانانی وەزیرێك بۆ هاوبەشیکردنی پێشەوای خەڵك و خستنەگەڕی دوو عەقڵ بۆ جێبەجێکردن راسترە لەوەی کە تەنیا خۆی جێبەجێکار بێت، بێگومان بەوە کارەکە جوانتر بەڕێوە دەچێت و زیاتریش لەهەڵە بەدوور دەبێت).

لەهەمان کاتیشدا لەیاسای نوێنەرایەتیدا رێگا نەگیراوە لەوەی سەرۆکی دەوڵەت خۆی بەرپرسیارێتییەکە هەڵگرێت و وەزارەت لەژێر فەرمانی خۆیدا بێت. ..هەروەکو چۆن دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وای بڕیار داوە. پەڕاوەکانی فیقهی ئیسلامییش ئاماژە بەهەمان شێوەی وەزارەت دەکەن و ناوی دەنێن وەزارەتی جێبەجێکردن (**وزارة التنفيذ**).

ماوردی لەهەمان پەڕاویدا دەڵێت: (بەڵام وەزارەتی جێبەجێکردن فەرمانڕەواییەکەی لاوازترە و مەرجەکانیشی کەمترن، چونکە تێڕوانین تێیدا



تەنیا بۆ پیشەوایە و بەڕێوەچوونی کارەکان بەگوێرەی راپەڕاندنی ئەوە، وەزیر لێرەدا هۆکاری نێوان گەل و دەسەڵاتە. بۆیە وەزیر چی پێ بوترێت ئەوە جێبەجێ دەکات و چ فەرمانێك دەرچوو ئاراستەی دەکات). ئەمەش لەبەرفراوانی فیقهی ئیسلامیی و نەرم و نیانیەتی و شایستەبوونیەتی بەهەموو کات و شوێنێك.

## یەکیەتی گەل ( ئوممەت ):

دیارە فەرمانڕەوایی نوێنەرایەتی ئەم یەکیەتییە رەتناکاتەوە، بە تایبەتی کاتێك شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی لە بناغە و ئاراستەکانیدا یەك جۆر بێت، لەگەڵ ئەمەشدا فەرمانڕەوایی نوێنەرایەتی لە کۆنترین پێگەیدا لەسەر فرە پارتی زۆر دانەمەزراوە.. لەئینگلترا دوو پارت هەیە کە دەسەڵات ئاڵوگۆڕ دەکەن... حزبایەتیکردن تیایاندا ئەوەندە کاڵە ئاسان لێکیان جیاناکەیتەوە و، هەمیشەش لەسەر پرسە نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان کۆدەنگن و لەو بوارەدا دیاردەی پارتایەتی لەخاڵی سفردایە. هەروەها لەئەمەریکا تەنیا دوو پارت هەیە لەهەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا نەبێت هیچیان لەبارەوە نابیستین.

بەپێچەوانەی ئەو وڵاتانەی لە پارتایەتی کردندا زیادەڕەوییان کردووە و پارتی زۆریان تێدا دامەزراوە، تاڵاوی ئەو چەشنەی فرە حزبیان چەشتووە، چ لەکاتی ئاشتی و چ لەکاتی جەنگدا، بۆ ئەوە فەرەنسا چاکترین نموونەیە.

جا ئەگەر کار ئاوابێت یەکیەتی گەل یان ئوممەت لەیاسای کۆمەلایەتی ئیسلامییدا بابەتێکی بناغەیی بێت و یاسای نوێنەرایەتیش رەتی نەکاتەوە، رێکخستنی دەوڵەتێکی ئیسلامیی هاوچەرخ لەدیدی برایانی موسوڵمانەوە ئەوە دەخوازێت یەکیەتی گەل بخەینە پێگەی یەکەمین، بەوەی ئەو شێوازە

لەدەولّەت و چۆنێتی دامەزراندنی هەڵبژێرین کە ئەو یەکیەتییەکان بۆ دەستەبەر دەکات، تاکو بەدوور بین لەهەرچی بەرەو پەرتبوونمان دەبات.

## ڕێزگرتنی ویستی گەل:

بۆ ڕێزگرتنی راوبۆچوونی رۆڵەکانی گەل و پێویستیی هاوبەشیکردنیان لە فەرمانڕەواییدا، ئیسلام ئەوەی بەمەرج نەگرتووە کە بۆ هەموو بابەتێك رای هەموو گەل وەربگیرێت... واتە ریفراندۆمی بۆ بکرێت... لەکارە ئاساییەکاندا تەنیا بەرای کۆمەڵی هەڵوەشاندنەوەو گرێبەست (**أهل الحل و العقد**) لەبری گەل وازیهێناوە کە لەکاروبارەکاندا رایان وەردەگیرێت. بەپێی وەسفی فیقهزانان ئەو کۆمەڵە سێ توێژ دەگرێتەوە:

١- زانا شارەزاکان کە بۆ فەتوادان و دەرهێنانی حوکمەکانی شەرع راوبۆچوونەکانیان سوودی لێوەردەگیرێت.

٢- ئەوانەی پسپۆڕو شارەزان لە کاروباری گشتییدا.

٣- ئەوانەی بەجۆرێك سەرکردەیی و پێشەوایەتی خەڵکیان هەیە.

هەموو ئەمانە دەگونجێت لەو دەزگایەدا کاریگەری خۆیانیان هەبێت.

یاسای نوێنەرایەتی نوێش کە رێگای بۆ هەڵبژاردنی ئەو دەستەڵاتە رێکخستووە. بەو شێوازەی فیقهزانانی دەستووری یاسای هەڵبژاردن و رێگاکانی ئەنجامدانیان رێکخستووە. ئیسلامیش ئەم رێکخستنەی قبوڵە مادام ببێتە هۆی هەڵبژاردنی کەسانی شایستە بۆ ئەو کارە گرنگە، تاکو نوێنەرایەتی گەل بکەن و مافی دەنگدەرانیش دابین بکرێت تا بەئەرکی خۆیان هەڵسن و لەهەڵبژادنی نوێنەرەکانیاندا هاوبەش بن و لەئەنجامدانیدا کەمتەرخەمی نەکەن، تاکو



بڕیارەکانی پەرلەمان، یان ئەنجومەنی نوێنەران، یان ئەنجومەنی شورا، بەراستی رای رۆڵەکانی گەل بێت.

یاسای فەرمانڕەوایی ئیسلامیی کە پایەی بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوا و یەکیەتی گەل و رێزگرتنە لەویستی، پێویستی بە ئاگایی خەڵك هەیە لەئیسلام. .. تا تێبگەن کە دەنگدان شاهیدیدانە، شاهیدیدانی راست و رەواش ئەرکی ئایینداریییە و پێویستە بەوپەڕی دڵسۆزی و سپاردە پارێزییەوە ئەنجام بدرێت. ئەمەش لەناو جەماوەردا پێویستی بەپەروەردەی ئیسلامیی هەیە. .. چونکە ئەوەی هەڵبژاردن بەڕێوە دەبات و سەلامەتی دەپارێزێت و بەرەو ئەنجامی چاك ئاراستەی دەکات هێزی گەلە، گەلێك کە بەرپرسیارێتی خۆی بزانێت و بزانێت فەرمانڕەوا دیاریکردن مافی ئەوە... ئەگەر ئەو شایستە هەڵنەبژێرێت و بەشێوازی سەلامەت هەڵبژاردنەکە بەڕێوە نەبات، ئەوا ناشایستە دەبێتە کاربەدەست. . ئەگەر واشبوو دەبێت بزانێت کە لەکارخستنی و دوورخستنەوەی ئەرکی ئەوە، واتە ئەرکی گەلە پێویستە پێی هەڵسێت. بەم شێوەیە دەبینین پایەکانی راگیرکردنی هەیکەلی دەوڵەتی ئیسلامیی لەناو بنکە جەماوەرییەکەدایە، نەك لە لوتکەی هەرەمەکە [٧٠]

## هەر گەلێك یاسایەکی هەیە:

پێویستە هەر گەلێك یاسایەکی هەبێت، تاکو رۆڵەکانی لەسایەیدا و لەکاتی پێویستدا بۆی بگەڕێنەوە، تا ئەرك و مافەکانیان دیاری بکات و ناکۆکییەکانیان چارەسەر بکات. گەلانی موسوڵمانیش پێویستە یاساکانیان لەشەریعەتی ئیسلامەوە سەرچاوە بگرێت و بەگوێرەی رێساکانی فیقهی ئیسلامیی وەربگیرێت. بێگومان شەریعەتی ئیسلام و ئەوەی یاساناسە موسوڵمانەکان

(٧٠) مشكلاتنا في ضوء النظام الإسلامي، حسن البنّا، ص ٣١٧–٣٢٣ مجموعة الرسائل.

دایانناوە، هەموو کەلێن و پێویستیەکانی ژیانی خەڵکیان تێدا رەچاوکراوە و هەموو کێشەکانیان چارەسەر دەکات و، چاکترین سەرەنجامیش لێیانەوە بەدەست دێت. خۆ ئەگەر سنوورەکانی خوای گەورە پارێزگاری بکرێت، رێگا لەهەموو تاوانباران تەسك دەکرێتەوە، ئیتر خراپەیان پێ ئەنجام نادرێت. ئەو کاتە ئاسایش و هێمنی بەرپا دەبێت و حکومەتەکانیش لەدووبارەکردنەوەی ئەزموونە بێکەڵك و دۆڕاوەکان رزگار دەبن. تاقیکردنەوەش گەورەترین سەلماندنە....سەرچاوە نوێیەکانی یاسادانانیش بۆ ئەو مەبەستە بانگەشە دەکەن و خوای گەورەش ئەوەی لەسەر باوەڕداران فەرز کردوە [(٧١)]. ئەنجام نەدانی ئەو کارەش لە کافربوونەوە سەری دەردەچێت: ﴿**ومن لم يحكم بما أنزلَ الله فأولئك هم الكافرونَ**﴾**المائدة/ ٤٤**.

پاشان ئیمام بەننا دەپرسێت: ئایا ئەوە گونجاو و ژیرانەیە کە یاسای گەلێکی موسوڵمان پێچەوانەی داواکارییەکانی ئایینەکەی بێت؟ لەگەڵ فەرمانەکانی قورئانەکەی و سوننەتەکانی پێغەمبەرەکەیدا دژ بەیەك بن و رووبەڕووی یەکتر ببنەوە... لەکاتێکدا کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگادارکردبێتەوە و فەرمانی پێدابیت کە بەوەی خوا بۆی ناردووە فەرمانڕەوایی نێوان خەڵکیدا بکات و شوێن ئارەزووی یاخیبووان نەکەوێت و زۆر هۆشیار بێت کە لەهەندێك لەوەی بۆی ناردووە دووری نەخەنەوە. واتە پێویستە ئەوان گوێڕایەڵی پێغەمبەربن و بەوەی ئەو هێناویەتی فەرمانڕەوایی بکەن، ئەگەر ئەوەش ناکەن و یاخی دەبن ئەوا خوای گەورە بە هۆی هەندێك لە گوناهەکانیانەوە دوچاری بەڵاو ناڕەحەتییان دەکات. دیارە بەهۆی فەرمانڕەوایی نەکردنیانەوە بە بەرنامەی خوا، دوچاری خراپە و ناهەمواری

(٧١) الى أي شيء ندعو الناس، حسن البنّا، ص٤٨ مجموعة الرسائل.



دێن.چونکە ئەو فەرمانڕەوایی نەکردنە یاخی بوونە، یاخی بوونیش ئەنجامەکەی سزایە. پاشان خوای گەورە بەشێوازی سەرسوڕمانەوە دەپرسێت: ئایا فەرمانڕەوایی نەفامییان دەوێت. وادەچن بۆ لای غەیری خوا. .. دەی کێ بڕیار و فەرمانی لە بڕیار و فەرمانی خوا چاکترە بۆ گەلێك کە بفامن و تێبگەن. ﴿وأنْ احكُم بينهم بِما أنزلَ الله ولا تتبع أهواءَهم واحذَرهم أنْ يفْتنوك عن بعض ما أنزلَ الله إليك فإنْ تولوا فاعلم أنما يريد الله أنْ يصيبهم ببعض ذُنوبهم وإن كثيراً من الناس لفَاسقُونَ (٤٩) أفَحكْم الجاهلية يبغونَ ومن أحسن من الله حكْما لقوم يوقنونَ(٥٠)﴾ المائدة/٤٩–٥٠.

بێگومان ئەم یاسایانە وەك بەگوێرەی ئایینی خوانین هەروەها بە گوێرەی دەستووریش نین، کە دانی بەوەدا ناوە ئایینی دەوڵەت ئیسلامە، دەی با ژیران و دانایان پێمان بڵێن ئەمانە چۆن پێکەوە رێك بخەین؟

کاتێك کە خوا و پێغەمبەرەکەی زینا و سووخواردن و عەرەق و قوماریان قەدەغە کردبێت و یاساش رێگای بۆخۆشکردبن و ئاسانکاری بۆ کردبن و برەوی پێدابن... پێم بڵێ: هەڵوێستی موسوڵمانان لە نێوان ئەم دوانەدا چۆن بێت؟ ئایا گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بکات و لەحکومەت و یاساکەی یاخی بێت؟ کە بێگومان گوێڕایەڵی خوا چاکترە و دەمێنێت، یان گوێڕایەڵی حکومەت و یاسا بێت و لە پەروەردگاری یاخی بێت؟ تاکو بەدبەختیی دنیا و قیامەتی بەسەردا بێت. .. وەڵامی ئەم پرسیارەمان لەبەڕێز سەرۆکی حکومەت و وەزیری داد و زانا بەڕێزەکان دەوێت.

برایانی موسوڵمان ئەم یاسایە پەسەند ناکەن و هەرگیز پێی رازی نابن و بەهەر شێوەیەك کار دەکەن تا یاسای ئیسلامی پڕ لە دادو سوود جێگای بگرێتەوە. لێرەدا لەسەر ئەوەش ناوەستن کە گومانەکانی خەڵك چین و کۆسپەکانی بەردەم چی دەبن. بەڵکو لەسەر کاری خۆیان دەڕۆن و هەوڵ دەدەن هەر کۆسپێك لەو رێگادا بێت لابرێت و هەر گومانێك هەبێت بڕەوێتەوە.

.. تاکو بەهۆی لادان لە ڕێبازی خوا گەل و وڵات دووچاری ئاشوب و گەندەڵی نەبێت و ئاییندارییش تەنیا و تەنها بۆ خوا بکرێت.

برایانی موسوڵمان دەربارەی ئەم بابەتە یاداشتێکیان داوەتە وەزیری داد و حکومەتیان هۆشیارکردوەتەوە کە باخەڵکی بەشکاندنی فەرمانی خوا گیرۆدە نەکەن، چونکە ئەوە باسی بیرو باروەڕەو و بیروباوەڕیش بە بەهاترین شتی ئەم ژیانەیە. بۆیە لەسەر ئەم باسە کۆڵ نادەین و بۆ بە ئەنجام گەیاندنی دەڕۆین، چونکە خوای گەورە ڕازی نابێت هەتا ملکەچی فەرمانەکانی نەبین و تاکو نووری ئایینەکەی ژیان ڕۆشن نەکاتەوە: ﴿ويأبى الله إلا أنْ يتم نوره ولو كره الكافرونَ﴾ التوبة/٣٢.

پاشان ئیمام بەننا دێتە سەر وەڵامدانەوەی قسەی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەمە چەقبەستوەیی و گەڕانەوەیە بۆ دوا.. گەڕانەوەیە بۆ زیاتر لەهەزار ساڵ پێش. چۆن دەگونجێت ئێمە لەژیانماندا یاسایەك جێبەجێ بکەین کە زیاتر لە چواردەسەدە پێشتر هاتووە، بۆ گەلێك کە وڵاتی وەکو وڵاتی ئێمە نەبووە و ژیانی وەکو ژیانی ئێمە نەبووە؟ جا بۆ پێشکەوتن و گەشەکردن چ مانایەك دەمێنێت؟

بەوانە دەڵێین: کە ئیوە لەسروشتی ئیسلام تێنەگەیشتوون. کەچۆن هاتووە و چۆن کاردەکات، ئیسلام بیرۆکەیەکی بەرزی بە خەڵك بەخشیوە، ئامانجە باڵاکانی دیاری کردووەو ڕێسای بنەڕەتی داناوە و پرسە گشتییەکانی روون کردووەتەوە و وردەکارییەکانی بەجێ هێشتووە تاکو مرۆڤەکان خۆیان بەگوێرەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و گەشەی ژیانیان و بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان، لەچوار چێوەی ڕێسای بنەڕەتی و پرسە گشتییەکاندا کاروباری خۆیان ڕێکبخەن. ئەوکاتە نە مرۆڤ لە خێرو چاکەی فەرمانەکانی خوا بێبەش دەبێت و نە

ئایینی خواش لە چوارچێوەی ولاتێکی دیاری و هەلومەرجێکی دیاری و شێوازی ژیانێکی سنووردااردا قەتیس دەکرێت.

مێژووی یاسادانانی ئیسلامی ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە **(ابن عمر)** سالێك لەسەر بابەتێك راوبۆچوونی بە شێوەیەك بوو، لەرسالی داهاتوودا ئەو راو بۆچوونەی گۆڕی هەر دوو راو بۆچوونەکەش پەسەند بوون، هەر یەکەیان بۆ کاتی خۆی.

هەروەها ئیمام شافیعی –خوای لێ رازی بێت– لەعێراق بەپێی بۆ چوونێك فەتوای داوە و دوایی لەمیسر بەپێی بۆچوونێکی تر، کە دیارە جیاوازی شوێن و شێوازی ژیان ئەوەی خواستووە، هەردوو بۆچوونەکەش لەگەڵ رێسای بنەڕەتی و ئامانجی بالا و پرسە گشتییەکانی ئیسلامدا رێك و گونجاو بوون. خوای گەورە ئەوەی روون کردووەتەوە کە نایەوێت ئێمە بخاتە نارەحەتی، بەڵکو دەیەوێت ژیانمان خاوێن بکات و ئاسوودەیی و خۆشبەختیمان پێ ببەخشێت و نیعمەتەکانمان بۆ تەواو بکات و ئێمەش وەفاداری و سوپاسگوزاری بکەین ﴿**ما يريد الله ليجعلَ عليكُم من حرجٍ ولكن يريد ليطهركُم وليتم نِعمته عليكُم لَعلكُم تشكُرونَ**﴾**المائدة/٦**.

ئایا دوای ئەمانە دەکرێت بلێین: گەڕانەوە بۆ ئیسلام واتە: گەڕانەوە بۆ دوا؟ و گەڕانەوە بۆ چەقبەستوویی؟ کە هیچ دەستوور و شەریعەتێك لە دنیادا چەشنی ئیسلام شیاوی گەشە کردن و هەڵکردن و لەگەڵ ژیان نەرم و نیان و فراوان نییە و هیچ یاسایەکیش وەکو یاساکانی ئەو ژیان خۆش ناکات و ئاسودەیی دروست ناکات.



## دەوڵەت ئاینییە یان مەدەنی:

وەڵامی ئەمە دکتور (محمد مرسی) ئەندامی مەکتەبی ئیرشاد و سەرپەرشتیاری چالاکییە سیاسی و پەرلەمانییەکانی کۆمەڵی برایانی موسوڵمان دەیداتەوەو دەڵێت: دەوڵەتی ئایینی بەگوێرەی چەمکی سیۆکراسی، کەلەسەر بناغەی بەخواکردنی فەرمانڕەوا دادەمەزرێت، وەکو ئەوەی لەمیسری فیرعەونی و وڵاتی فارس و رۆم و هیندستانی کۆندا دامەزراوە، بیروبۆچوونێکی پووچەڵە و پەیوەندی بە ئایینە ئاسمانییەکانەوە نەبووە و نابێت. دەوڵەتی ئیسلامیی تا سەر ئێسقان دەوڵەتێکی مەدەنییە، ئەوەش لەبەر ئەوەی دەسەڵاتەکانی (یاسادانان و دادوەریی و جێبەجێکردن) لەیەکتر جیادەکاتەوە، هەروەها بەهۆی ئەوەی خاوەنی پرۆگرامێکی ئیدارییە لەچوارچێوەی نەگۆڕاوەکانی شەریعەتدا کار بۆ هێنانەدی بەرژەوەندی سەرجەم تاکەکانی گەل دەکات، موسوڵمان بن یان ناموسوڵمان.

دەوڵەتی ئیسلامیی دەوڵەتی پیاوە ئاینییەکان نیە، کە بەناوی خواوە فەرمانڕەوایی بۆ خۆیان زەوت بکەن و ئەزموونی مێژوویشمان دەوڵەتی خەلیفەکانی راشیدین و خەلیفە پابەندەکانی دوای ئەوانن، لەدەوڵەتی ئیسلامییدا ئەوانەی خاوەنی شارەزایی و پسپۆڕین هەریەکەو لەبواری خۆیدا، خاوەنی راوبۆچوون و بەرپرسیارێتی و رابەری گەشەدان بە دەوڵەتن، بەتەنیا مەرجی ئەوەی لەچوارچێوەی پڕداد وهاوسەنگی شەریعەتی ئیسلامدا بێت. ئەو شەریعەتەی کە مافێکی زیادەی بەهیچ کەسێك نەداوە، ئەگەر ئەو کەسە پێغەمبەری خواش بێت، ئەوتا فەرمان دەکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو راستیە رابگەیەنێت و بڵێت: منیش تاکە مرۆڤێکی وەکو ئێوەم: ﴿**قُلْ إنما أنا بشر**



**مثْلُكُمْ**﴾فصلت/٦. هەمان فەرمان بەهەمان دەربڕین لەکۆتایی سورەتی (**الکهف**)یشدا دووپات کراوەتەوە.

لەدەوڵەتی ئیسلامییدا ماف و ئەرکەکانی هاوڵاتیان یەکسانن، بێ گوێدانە جیاوازی بیروباوەڕو رەگەز و رەنگیان، ئەمەش بەگوێرەی دەستورێك گەل رەزامەندیی لەسەر دابێت، ئەوەش لەو روانگەیەوە کە گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە و هەر خۆیشی شێواز و هۆکارەکانی فەرمانڕەوایی و هەڵسوڕاندنی کاروباری بە گوێرەی رێسا و بنەما شەرعییەکان دیاری دەکات.

## ئافرەت و کاری سیاسی :

ئیمام بەننا وای بۆ دەچێت کە ئافرەت نیوەی کۆمەڵگەیە و کاریگەری بەهێزیشی لەسەر ژیانی هەموو کۆمەڵگە هەیە. چونکە قوتابخانەیە کە نەوەکان پێدەگەیەنێت و کەسایەتییان بۆ پیادەکردنی ژیان دادەڕێژێت.

ئیسلام وەکو ئەو لێی تێگەیشتووە رێگا بە ئافرەت دەدات کەموومارەسەی کاری سیاسی بکات تا دەگاتە کاروباری جەنگیش. بۆی هەیە هەڵوێستی سیاسی خۆی دەربڕێت و بانگەشەی بۆ بکات و قەناعەت بەخەڵکی تریش بکات بێنە سەر هەڵوێستەکەی، یان پشتگیری بکەن.

ئیمام بەننا ئەم راوبۆچوونەی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتووە چونکە ئافرەت بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ داوە. نموونە بۆ ئەوە پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم و پەیمانی حودەیبییە کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەیویست لەگەڵ خەڵکی مەککە بجەنگێ، بەهۆی ئەوەی وا بڵاوبوویەوە کەنوێنەرەکەی (**عثمانی کوڕی عفان**) لەلایەن قورەیشەوە شەهیدکراوە.

هەروەها ئافرەت بۆی هەیە هەر بیرۆکەیەکی هەبوو دەری بڕێت و بانگەشەی بۆ بکات، ئافرەت بۆی هەیە بانگخواز بێت و فەرمان بەچاکە و بەرگری لەخراپە

ئەنجام بدات و لەڕووی هەر کەسێکدا کە خراپە ئەنجام دەدات بوەستێت، ئەوکەسە سەرۆکی دەوڵەت بێت. یان هەر کەسێکی تر، بۆی هەیە لەڕێگای دادگاوە یان بەشێوازێکی تر داوای مافەکانی بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای ئافرەتێکی بیست و ڕەزامەندیی لەسەر کردەوەکەی، بۆ چارەسەری کێشەکەی دا، کاتێك پرسیاری لێکرد کە مێردەکەی پیاوێکی ڕەزیلە و ئەوەندەی ناداتێ کە بەشی خۆی و منداڵەکانی بکات!! پرسی ئایا گوناهی ناگات ئەگەر بەئەندازەی پێویست بێ مۆڵەت پارە خەرج بکات؟ ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**خذي من ماله مايكفيك و ولديك بالمعروف**) [٧٢]، واتە: ئەوەندەی بەشی خۆت و منداڵەکانت دەکات لەماڵەکەی بەدوور لە زیادەڕەوی خەرج بکە.

کۆمەڵی برایانی موسوڵمان لەساڵی (١٩٩٤ ز) دا بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە، تێیدا هاتووە: برایان بەپێویستی دەزانن کە ئافرەت هاوبەشیی پیاو بکات لە هەڵبژاردنی کۆمەڵی هەڵوەشاندنەوە و گرێبەست (**أهل الحل و العقد**)دا.

واتە: ئەندامانی ئەنجومەنی شورا یان ئەنجومەنی نوێنەران، کۆمەڵی برایان پێیان وایە لەدەقە شەرعییەکاندا شتێك نیە ڕێگا لە ئافرەت بگرێت لەبەشداریکرنی ئەو ئەنجومەنانە، بەڵکو ئەو دەقانە پشتی دەگرن بۆ هاوبەشی دەنگدان مافی ئەوەشی دەدەنێ خۆی هەڵبژێرێت بۆیان [٧٣].

(٧٢) رواه الشيخان.

(٧٣) تحديات سياسية تواجه الحركات الإسلامية، مصطفى محمد الطحان، ١٢١-١٢٢.

# پرسەکانی جیهانی ئیسلامیی*

یەکێك لەخواستەکانی کاری سیاسی لە ئیسلامدا بایەخدانە بە پرسەکانی جیهانی ئیسلامیی. . ئیمام بەنناش هەر لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵی برایانی موسوڵمانەوە، گرنگی داوە بە پرسی موسوڵمانان و چارەسەر کردنی کێشە رەواکانیان. نموونەی ئەوانە:

* هەر لەساڵی (١٩٢٨ ز) دا دوای دامەزراندنی کۆمەڵ، نامەیەکی ئاراستەی حاجی (**أمین حسیني**)ی موفتی فەلەستین کرد، پشتگیری و هاوکاری بۆ پرسی فەلەستینی پێ راگەیاند.

* لەساڵی (١٩٣٤ ز)دا کەناکۆکی کەوتە نێوان شای سعودیە و ئیمامی یەمەن، (**شێخ طنطاوي جوهر**)ی نارد بۆ حیجاز بۆ لای (**شا عبدالعزیز**) و داوای لێکرد ناکۆکییەکان وەلابنێن و بەرێگای ئاشتییانە چارەسەری کێشەکان بکەن. .. (**شا عبدالعزیز**) دەستپێشخەرییەکەی لا پەسەند بوو بەچاکە باسی کرد(٧٤). برایان کە بیتسان خەڵکی مەدینە کەم دەستن و پێویستیان هەیە یەکسەر چەندین لیژنەیان بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی و کۆمەك پێکهێنا و کۆمەکیان لە مزگەوت و فەرمانگە حکومییەکاندا بۆ کۆکردنەوە(٧٥).

---

* نامەیەك بۆ پاشای عێراق

هەر ئەو دڵسۆزی و خەمخۆرییەی حەسەن بەننا بوو بۆ سەرجەم ئوممەتی ئیسلام کاتێك لە چلەکاندا بیستی لە کوردستانی باشوور شۆرشێك بەرپا بووە دژی رژێمی ئەو کاتە. نامەیەکی ئاراستەی پاشاو دەسەڵاتدارانی ئەو کاتە کردو تیایدا نووسیبوو: کوردەکان، نەوەی (صلاح الدین)ن, جێگەی قەدرو رێزن، لە خۆیانەوە دەست نادەنە چەك و شۆرش, دیارە ستەمێکیان لێکراوە، هەوڵ بدەن ئەو ستەمە لابدەن، دەبینن کەس وەکو ئەوان دڵسۆزی نیشتمان و ئوممەتی ئیسلام نییە. سەرچاوە: پێشەوای شەهید (حسن البنا)، بورهان محمد امین چاپی / ٣ ل ٢٠.

(٧٤) جريدة الإخوان الأسبوعية – عدد (٩).

(٧٥) جريدة الإخوان الأسبوعية – عدد (٤٣).

* لەساڵی (١٩٤٤ ز) دەزگایەکیان پێکهێنا بەناوی (بەشی پەیوەندی بەجیهانی ئیسلامییەوە)، لەوە بەدوا بەشێوازی کاری رێکخراو بۆ ئەو مەبەستە کاریان دەکرد و رۆڵی گەورەیان هەبوو لە پشتگیری پرسەکانی جیهانی ئیسلامییدا و ئەم پشتگیریانە شێوازی جۆراو جۆریان هەبوو. لەوانە:

## میوانداری بزوتنەوەکانی خەباتگێڕیی لە جیهانی ئیسلامییدا:

١-لەمەڵبەندی گشتی برایانی موسوڵمان هیچ هەفتەیەك گوزەری نەدەکرد، کەسایەتییەکی دیار و خەمخۆر یان زیاتر لەوڵات و ناوچە جیاجیاکانی جیهانی ئیسلامییەوە، سەردانی نەکردنایە، ئەوانیش پێشوازیان لێدەکردن و پێکەوە قسەیان لەسەر پرسەکانی جیهانی ئیسلامیی و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان دەکرد.

لەوانە: لە تونسەوە (**الحبیب بورقیبة**) و (**شاذلي المكي**) و لە ئەندەنووسیاوە (**أحمد سۆكارنو**) و (**أجوس سالم**) و لە سودانەوە (**أحمد خیر**) و (**اسماعیل أزهري**) و لەمەغریبەوە (**عبدالكریم خطابي**) و (**علال فاسي**) و لە جەزائیرەوە (**فضیل ورتلاني**) و لە فەلەستینەوە (**أمین حسیني**) و (**صبري عابدین**).

٢-چاودێری قوتابیانی جیهانی ئیسلامیی و پشتگیری پرسەکانیان:

بەشی پەیوەندی بە جیهانی ئیسلامییەوە بوویە پەناگەیەك بۆ قوتابیانی دەرەوەی میسر، کە لەزانکۆی ئەزهەر و زانکۆکانی تردا دەیانخوێند. وا رێکەوت کە سەفارەتی ئەندەنووسی لە ژێر فشاری داگیرکەری هۆڵەندیدا رێگای لەو کۆمەکییانە دەگرت کە بۆ قوتابیان دەهات لەلایەن کەسوکاریانەوە و ئەوەیان کردبووە مەرج: هەر قوتابییەك بیەوێت کۆمەکی پێ بگات دەبێت

بچێت بەرامبەر بەو چالاكییە نیشتیمانیانەی ئەندەنوسیەكان لەدژی داگیركار دەیانكرد ناڕەزایی دەربڕێت. .. ئەوانیش ئەوەیان نەكرد، پەنایان بردە بەر بەشی پەیوەندییەكانی قوتابیانی برایان كە لەسەر ئەو كارەیان دەستخۆشییان لێكردن و بڕیاریان دا تا كو ئەو حاڵەتە نائاساییە كۆتایی دێت، ئەوان كۆمەكییان بۆ خەرج بكەن(٧٦).

٣-پێشكەشكردنی یاداشت بۆ پشتگیری پرسەكانی موسوڵمانان و بەیاننامەی ناڕەزایی دەركردن دژ بەوانەی مافەكانیان پێشێل دەكەن:

لەبەڵگەنامە فەرمییەكانی فەرەنسادا دوو نامە لەڕێگای سەفارەتی فەرەنساوە لە قاهیرە پەخشكراوە، تیایاندا هاتووە: برایانی موسوڵمان ماندوویان كردووین ئەوەندە سكاڵایان بۆ ناردووین، كە ناڕەزایی دەردەبڕن دەربارەی مانەوەمان لە جەزائیر و وڵاتانی باكووری ئەفەریقا، داوا دەكەن ئەو وڵاتانە جێ بهێڵین و زۆرێكیش لەو سكاڵانە پەیوەستن بەفەلەستینەوە (٧٧).

٤-خۆپیشاندان و ڕێپێوان بۆ پشتیگیری پرسەكانی جیهانی ئیسلامی:

برایانی موسوڵمان چەندین خۆپیشاندان و ڕێپێوانیان ڕێكخستووە بۆ پشتگیری پرسەكانی وڵاتانی ئیسلامیی وەكو (فەلەستین-سوریا -لوبنان - مەغریبی عەرەبی- و لیبیا و پاكستان و ئەندەنووسیا).

٥-كۆنگرە بەستن بۆ پشتگیری پرسەكانی وڵاتانی ئیسلامیی:

برایانی موسوڵمان چەندین كۆنگرەیان بەستوە بۆ سەرخستنی پرسی فەلەستین و گرنگترینیان كۆنگرەی ئەزهەری شكۆدار بوو لە(١٩٤٧/١٢/١٤).

---

(٧٦) الإخوان المسلمون و المجتمع المصري، محمد شوقي زكي، ص ١٥٥.
(٧٧) الحركة الإسلامية وقضية فلسطين، زياد أبوغنيمة، ص ١٥٠.

هەروەها برایان لەمەڵبەندی گشتی لەساڵی (١٩٥٤ ز) کۆنگرەیەکیان بەست بۆ پشتگیری کێشەی مەراکیش[٧٨].

٦–ڕۆژنامەنوسی برایان و پرسەکانی جیهانی ئیسلامیی:

کاتێك یەکەم ژمارەی هەفتەنامەی (**الإخوان المسلمون**) لەساڵی (١٩٣٣ز) دەرچوو، ستونێکی نەگۆڕاوی تێدا بوو بەناونیشانی (**العالم الإسلامي**). هەروەها هەموو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی برایان بە بەردەوام، گرنگییان بە هەواڵەکانی جیهانی ئیسلامیی و پرسە جۆراو جۆرەکانی دەدا.

٧–برایانی موسوڵمان و پێکهێنانی ئەنجومەنی جامیعەی عەرەبی:

برایانی موسوڵمان لەگەڵ ئەوەی ئاگاداری هەلومەرجی پێکهاتنی جامیعەی عەرەبی بوون، هەوڵیان دەدا سوود لە پێکهێنانی ببینن و هەوڵی ئاراستەکردنیان دەدا بەسوودی عەرەب و موسوڵمانان بگەڕێتەوە.

کاتێکیش سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتە عەرەبییە سەربەخۆکان بانگهێشت کران بۆ ئەسکەندەرییە، بۆ دانانی پەیماننامەی جامیعەکە، برایانی موسوڵمان بەم کارانەی خوارەوە هەڵسان:

أ–لقەکانی برایان پێشوازیی جەماوەریی گەرمی وەفدەکانیان دەکرد.

ب–بروسکەی پشتگیری و دەستخۆشییان بۆ وەفدە هاوبەشەکان دەنارد.

ج–ئیمام بەننا یاداشتێکی چڕوپڕی ئامادەکرد کە پێشنیاری کرداریی تێدا بوو بۆ چۆنیەتی پێکهێنانی جامیعەکە و هێڵە سەرەکییەکانی پەیماننامەکەی و گرنگترین ئەو پرسانەی پێویستە چارەسەری بکات و، پێشکەشی لیژنەی ئامادەکاری کردو یەکەمین پەیماننامە دەرچوو زۆر لەیاداشتەکەی برایانی موسوڵمان دەچوو[٧٩].

(٧٨) مجلة الدعوة عدد ١٣٣، جريدة الإخوان ١٩٥٤/٧/١٥.

(٧٩) أحداث صنعت التأريخ، محمود عبدالحليم، ٣٢٠/١.



٨–چەند نموونەیەکی ڕۆڵی کۆمەڵی برایان لە پشتگیری خەبات و خەباتگێڕاندا:

### أ- ڕزگارکردنی خەباتگێڕی گەورە ( عبدالکریم الخطابي ):

لە گۆڤاری (**الدعوة**)دا (**الخطابي**) نووسیویەتی:کە لەشوێنی دوورخرانەوەکەی ئیمام بەننا پەیوەندی پێوەکردووە و لەگەڵیدا پلانی رفاندنیان داناوە و بۆ ئەو مەبەستە کەشتی و پێویستییەکانی تری ئامادەکردووە.

پاشان نووسیویەتی کە: برایان ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لەدابەزاندنی ئەو لەو کەشتییەی هەڵی گرتبوو بیبات بۆ فەرەنسا، بۆ ئەوەی لەوێ هەتا ماوە بەندکراو و دەست بەسەر بێت. .. کەچی ئەوان فریای کەوتن و هێنایانەوە بۆ میسر و لەوێ مافی پەنابەریی سیاسی وەرگرت.

### ب ـ ڕزگارکردنی موفتی میسر:

ئەو بەڕێزە لەفەرنسا پەنابەری سیاسی بوو، برایان ترسی ئەوەیان هەبوو کە فەرەنسا بیداتەوە دەستی بەریتانیا، پەیوەندییان پێوەکرد دەربارەی هەڵاتنی بۆ میسر قسەیان لەگەڵ کرد ئەویش ڕەزامەند بوو، برایان هەموو کار و پێویستی ئەو بابەتەیان ڕێکخست و موفتی هێنرایەوە بۆ میسر و شا فاروقیش مافی پەنابەرێتی سیاسی دایە و وەك میوانی خۆی وەریگرت[٨٠].

### ج ـ گرنگیدان بە پرسی فەلەستین:

ئیمام بەننا دەرکی هەموو لاکانی پیلانگێڕیی لەسەر فەلەستین و ترسناکیی دروستبوونی قەوارەی زایۆنی کردبوو. بۆیە پێی باش بوو هەوڵەکان لەسەر فەلەستین چڕ بکرێنەوە، تاپیلانی جولەکە سەرنەگرێت، پێی وابوو پێویستە هەموو ناکۆکییەکان وەلا بنرێن و هەموو تواناکان بۆ سنووردانان بۆیان کۆبکرێنەوە.

---

(٨٠) تعليق صالح ابو رفيق كتاب الإخوان المسلمون، ريتشارد ميتشيل، ص١٤٣.

لەڕووی کرداریشەوە ئەم بیرۆکەی پیادەکرد و ئیتر لەگەڵ کەسدا ناکۆکی نەکردو لەگەڵ هێزەکانی رژێمی شا فاروقدا رووبەڕوو نەبوویەوە.

جگە لەوەش چەندین هۆکاری کرداریی بەکار دەهێنا، لەوانە: داوای دەکرد ئەو گۆڤارانەی جولەکە ئەو کاتە لە قاهیرە دەری دەکردن پەیوەندی لەگەڵیان هەڵگیرێت.. و بانگەشەی دەکرد کۆنگرەیەك بۆ یەکخستنی وشەی عەرەب بۆ سەرخستنی فەلەسیتن و رزگارکردنی قودس بگیرێت، هەروەکو داوای دەکرد پیتاك بۆ سەرخستنی پرسی فەلەستین کۆبکرێتەوە بۆ ئەو مەبەستە هۆکارێکی داهێنا، کە پۆلێکی پۆستە بەنرخی یەك (قرش) بۆ بەرژەوەندی پرسی فەلەستین دەربکرێت. یەکێك لەبۆچوونە کاریگەرەکانی ئەوە بوو کە سوپاکانی وڵاتنی عەرەب نەچنە فەلەستین و، ئەو رایەی بۆ (**النقراشي**) سەرۆك وەزیر خستە ڕوو و داوای لێکرد، با برایان رووبەڕووی جولەکە ببنەوە، پێی وت: ئەگەر برایان لەو رووبەڕووبوونەوەدا تیاچوون ئەوا رژێمی میسر لەدەستیان رزگاری دەبێت، وەکو پیی خۆشە، ئەگەر بەسەر جولەکەشدا سەرکەوتن ئەوا هەموو عەرەب لەو زایۆنیانە رزگاریان دەبێت.

جا ئاشکرایە بەم پێشنیارەی دەیویست جەنگ لەگەڵ جولەکەدا جەنگی پارتیزانی بێت، نەك جەنگی سوپای نیزامی، ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

١-دەیزانی سوپاکان دەستی گوماناوی لەپشتیانەوەیە و سوپای رژێمانێکن بەنەخشەی داگیرکاران کاردەکەن و داگیرکارانیش دەیانەوێت فەلەستین بدەنە جولەکە.

٢-جولەکە جەنگی پارتیزانیان پیٚ نەدەکرا و نەشیاندەتوانی لەبەردەمیدا خۆیان بگرن، بەتایبەتی ئەگەر برایان بەو جەنگە هەڵسن.



برایان لەجەنگی فەلەستیندا بەچەندین شێواز هاویەشیان کرد، لەوانە: بە ناردنی ئەو کەتیبانەی لەڕێی جامیعەی عەرەبیەوە نێرران, کە برایان لەسەر ئەوە رێکەوتبوون دە هەزار چەکدار بەسەرکردایەتی (**عبدالرحمن عزام**) بنێرنە فەلەستین بۆ جەنگ لەگەڵ جولەکە، ئیمام بەننا ئەمەی بە بروسکەیەك دایە کۆنگرەی باڵای عەرەبیی کە لە لوبنان بەسترا. لەدەقی بروسکەکەدا هاتبوو: برایان ئامادەن دەهەزار خەباتگێڕی خۆبەخش بنێرنە فەلەستین بۆ رووبەڕوو بوونەوەی جولەکە. *

هەروەها ئیمام بەننا پەیوەندی کرد بە (**مصطفى السباعي**) چاودێری برایانەوە لەسوریا و (**عبداللطيف أبوقرة**) لێپرسراوی برایان لەئەردەن و (**شێخ محمد محمود الصواف**) چاودێری برایان لە عێراق، کە هەریەکەیان کەتیبەیەك لەبرایان بنێرنە فەلەستین.

## د ـ رۆڵیان لەسەربەخۆیی ئەندەنووسیاو پاکستاندا:

برایانی موسوڵمان پشتگیری خواستی سەربەخۆیی پاکستان و ئەندەنووسیا بوون و پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵ سەرکردەکانی هەردوولادا هەبوو، چەندین وەفدیان هاتووەتە میسر، برایان بەگەرمی پێشوازییان لێکردوون. کە

* شایانی باسە کۆمەڵی برایانی موسڵمان تەنها بەشداری جەنگیان لەگەڵ جولەکە و ئینگلیزدا کردووە، جولەکە وەك داگیرکار و ستەمکار, سەرزەمینی فەلەستینیان داگیرکردووە, برایانی موسڵمان لەو جەنگەدا ئازایەتی و نەبەردیەکی بێ وێنەیان نواندبوو, هەر بۆیە جولەکە داوایان لە بەریتانیا کرد کە فشار بخاتە سەر حکومەتی میسر و سنوورێکیان بۆ دابنێ, ئەویش فەرمانی دەستگیرکردنی دەرکردن و جەنگاوەرانیان لە مەیدانی جیهاددا قۆڵبەست کرد، بێ ئەوەی هیچ کاردانەوەیەك بنوێنن دژی سوپای میسر! !

ئینگلیزیش داگیرکاری کەناڵی سوێس و بەشێك لە خاکی میسربوون.. کە بەردەوام برایانی مسوڵمانی داوایان لێ کردوون میسر چۆڵ بکەن. وەرگێر

(**محمد علي جناح**) گەورەی موسوڵمانانی هیند داوای پێکهێنانی دەوڵەتی پاکستانی دەکرد، لەمیسر ئیمام بەننا خۆی زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرد و ناساندی بە (عبدالرحمن عزام) ئەمینداری گشتی جامیعەی عەرەبی.

کەخەباتی ئەندەنووسیا و هیندەکان بەئاکام گەیشت و هەردوولا دەوڵەتیان پێکهینا، دەوڵەتانی رۆژئاوا دانیان پێدا نەدەنان. ئیمام بەننا یاداشتێکی دایە جامیعەی عەرەبی و هانیدان کە دان بەهەردوو دەوڵەتەکەدا بنێن. (عبدالرحمن عزام) رۆڵی گەورەی هەبوو لە دەرکردنی بەیانی دان پیانانی جامیعەی عەرەبی بەهەردوو دەوڵەتەکەدا.

## یاسای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لە ئیسلامدا

ئەم یاسایانە لەسەر ئەم رێسا شەرعییە نەگۆڕانە دادەمەزرێن:

١–پارێزگاری پەیماننامەکان و بەجێهێنانی بەڵێنەکان: خوای گەورە فەرمان دەدات بە پابەند بوون بەپەیمانەوە بەگشتی، چونکە خوای گەورە لەسەریان پرسینەوە دەکات. دەفەرموێ: ﴿**وأوفوا بالعهد إن العهد كانَ مسئولاً**﴾**الإسراء/٣٤**.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿**إلا الذين عاهدتم من المشرك ثم لم ينقصوكم شيئًا ولم يظاهروا عليكم أحدا فأتموا إليهم عهدهم إلى مدتهم إن الله يحب المتق** ﴾**التوبة/٧**.

واتە: بەڵام ئەو بێ باوەڕانەی پەیمانتان لەگەڵیان بەستووە و پابەندن پێیەوە و هیچیان لێ کەم نەکردووە و یارمەتی کەسیشیان نەداوە لە دژتان، ئەوانە پەیمانەکەیان تاکاتی دیاریکراوی خۆی ببنە سەر. پاشان لە کۆتاییدا دەفەرموێت: خوا پارێزکاران و لەخواترسانی خۆش دەوێت... واتە ئەو کارە پارێزکاری و ترسان لەخوایە. هەروەها دەفەرموێ: ﴿**فما استقاموا لكم فاستقيموا**



لهم﴾ التوبة/٧. واتە:هەتا ئەوان لەگەڵتان ڕێك و ڕاست و پابەندن بەپەیمانەکەوە، ئێوەش لەگەڵیان ڕێك و ڕاست پابەندبن.

هەروەها دەربارەی ڕێزگرتنی پەنابەران و جوان پەنادانیان دەفەرمویٚ: ﴿وإنْ أحد من المشرك استجارك فأجره حتى يسمع كلام الله ثُم أبلغه مأمنه﴾التوبة/٦.

واتە: ئەگەر کەسێك لەبێباوەڕان پەنای گرت پێت، پەنای بدە تاکو گوێی لەفەرموودەی خواببێت پاشان بیگەیەنەوە ئەو شوێنەی گیان و ژیان و ماڵی تێیدا پارێزراوە.

٢–دەربارەی کەمایەتییەکان و مافی بیانییەکان لە نیشتیمانی ئیسلامییدا:

Nئیسلام بڕیاری ئازادی بیروباوەڕی داوە ﴿لاإكراه الدين﴾البقرة/٢٥٦.

Nجۆری پەیوەندی لەگەڵ کەمایەتییە ئاینییەکانی دیاری کردووە، کە دەبێت بپارێزرێن: ﴿لا ينهاكُم الله عن الذين لم يقاتلوكُم في الدين ولم يخرجوكُم من دياركُم أنْ تبروهم وتقْسِطُوا إليهم إن الله يحب المقْسِط ﴾الممتحنة/٨.

واتە: خوای گەورە لێتان قەدەغە ناکات کە چاکە بکەن و دادپەروەربن لەگەڵ ئەو بیٚباوەڕانەی لەسەر ئایین، لەگەڵتان نەجەنگاون و لەماڵ و جیٚ و شوێنی خۆتان وەدەریان نەناون، بێگومان خوای گەورە دادپەروەرانی خۆش دەوێت. واتە: کە ئەوان دوژمنایەتییان نەکردوون، ئێوەش لەگەڵیان چاك و دادپەروەربن.

ئەوانەشی دیاری کردووە کە دژیان بین و پەیوەندییان لەگەڵ بپچڕێنین: ﴿إنما ينهاكُم الله عن الذين قاتلوكُم في الدين وأخرجوكُم من دياركُم وظاهروا على إخراجِكُم أنْ تولوهم ومن يتولهم فأولئك هم الظالمونَ﴾ الممتحنة/٩.

واتە: خوای گەورە ڕێگای چاکەکردنتان تەنیا لەوانە لێدەگرێت کەلەسەر ئایین، لەگەڵتان جەنگاون و لەماڵ و سامانتان وەدەریان ناون و هاوکارییان

کردووە لەسەر وەدەرنانتان. ئەوانە قەدەغەکراوە لێتان دۆستایەتی و پاڵپشتییان بکەن. .. ئەوانەتان دۆستایەتی و پاڵپشتییان دەکەن، ئەوانە ستەمکارن.

Nهەڵوێستی بەرامبەر ئەو بیانییانەی کە دەروونیان شێواوە و تاوانیان زۆرە. . ئەوانە نابێت بکرێنە جێگای راوێژ: ﴿**يأيها الذين آمنوا لا تتخذُوا بِطانةً من دونِكُم لا يألونكُم خبالاً ودوا ما عنِتم قَد بدت البغضاءُ من أفْواههم وما تخفي صدورهم أكْبر قَد بينا لكُم الآيات إنْ كُنتم تعقلُونَ(١١٨)هاأَنتم أُولاءِ تحبونهم ولا يحبونكُم**﴾ **آل عمران/** ١١٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کەسانێکی بەدەر لەخۆتان مەکەنە جێگای متمانە و، نهێنی خۆتان لایان مەدرکێنن، چونکە ئەوان لەدروستکردنی تەنگانە و گێروگرفتدا بۆتان کۆڵنادەن و وازناهێنن، ئاواتیانە ئێوە دوچاری ئازارو کێشە بن، رق و کینە بەئاشکرا لەدەمیانەوە دیارە و ئەوەشی لەسنگیاندا شارودیانەتەوە گەورەترە. ئەوە بەڵگەمان بۆ روونکردنەوە، تا دۆستان و دوژمنانتان جیابکەنەوە، بۆ ئەوەش عەقڵ و ژیریتان بخەنەکار. ئاگاداربن ئێوە ئەوانەتان خۆش دەوێت, ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێت... ! !

Nبرایانی موسوڵمان هەڵوێستی برایانەی خۆیانیان لەگەڵ کەمایەتییە ئایینییەکانی ناو نیشتیمان دوپات کردووەتەوە و وتوویانە: هەڵویستمان لەگەڵ برایانی مەسیحی میسر و وڵاتانی ئیسلامییدا هەڵوێستێکی روون و دێرین و ناسراوە... ئەوان وەکو ئێمە مافیان هەیە و وەکو ئێمە ئەرکیان لەسەرە و لەگەڵمان هاوبەشی نیشتیمان و برای خەباتێکی نیشتیمانی دوور و درێژن، مافی ماددی و مەعنەوی و مەدەنی و سیاسییان هەیە، و چاکە کردن لەگەڵیان و هاوکاری کردنیان لەسەر چاکە لەفەرزەکانی ئیسلامە، کە موسوڵمان ناتوانێت



پشتگوێی بخات یان کەمتەرخەمیی بەرامبەر بنوێنێت. ئەوەی وانەکات و وانەڵێت ئێمە لێی بەرین[٨١].

هەروەها قورئان بناغەی یاسای جەنگی نێودەوڵەتی داناوە: کە ئەصڵ ئاشتییە و جەنگ حاڵەتی نائاساییە. جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا دەکرێت کە لەگەڵمان دەجەنگن: ﴿**وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم**﴾ **البقرة**/ ١٩٠.

ئەمانەش هەرکاتێك ئامادەییان بۆ ئاشتی دەربڕی پێویستە وەڵامیان بدرێتەوە ﴿**وإنْ جنحوا للسلم فاجنح لها**﴾ **الأنفال**/٦١.

پاش رێکەوتن و پەیمان بەستن ئەگەر هەست بە خیانەتی لایەنێك کرا بەئاشکرا پەیمانەکەیان لەگەڵدا هەڵدەوەشێنرێتەوە... بەڵام موسوڵمانان لەلایەنی خۆیانەوە بەبێ هۆی کاریگەر پەیمان هەڵناوەشێننەوە و خیانەتیش ناکەن، چونکە خوا خیانەتکارانی خۆش ناوێت: ﴿**وإما تخافن من قوم خيانةً فانبذْ إليهم على سواءٍ إن الله لا يحب الخائنين**﴾**الأنفال**/٥٨.

لەئیسلامدا ئاکاری سەربازی و شێوازی مامەڵە لەمەیدانی جەنگدا دیاری کراوە، ئەوەش کورتەی وەسیەت و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانە بۆ سوپای ئیسلامیی و ئەندامانی، کە لێوان لێوە لە دیاردەی بەزەیی و نەرمی نواندن، کە تیایاندا هاتووە: (خیانەت مەکەن و بەناحەق مەدەن بەسەر کەسدا و جەستەی کوژراو مەشێوێنن و ئافرەت و منداڵ و پیر مەکوژن و هێرش مەبەنە سەر بریندار و داری بەردار مەبڕن و بەلای کەسانێکدا گوزەر دەکەن، کەنارگیرن، وازیان لێ بهێنن با بەکاری خۆیانەوە خەریك بن و، لەدەستکەوتی جەنگ هیچ شتێك مەشارنەوە بۆ خۆتان.

(٨١) بيان للناس (أبريل ١٩٩٤).

## مرۆڤدۆستی لە سیاسەتی ئیسلامییدا:

Nئیسلام بە بەپیرۆزدانانی یەکێتی ئایینی بەشێوەیەکی گشتی دەمارگیریی ئایینی کۆتایی پێهێناوە، لەسەر شوێنکەوتوانی فەرزکردووە کە باوەڕیان بەهەموو پەیامە ئاسمانییەکان هەبێت: ﴿**قُولُوا آمنا بِالله وما أنزِلَ إلينا وما أنزلَ إلى إبراهيم وإسماعيلَ وإسحاق ويعقُوب والاسباط وما أُوتي موسى وعيسى وما أُوتي النبِيونَ من ربهم لا نفَرق بين أحد منهم ونحن له مسلمونَ(١٣٦) فإنْ آمنوا بِمثْل ما آمنتم بِه فقَد اهتدوا وإنْ تولوا فإنما هم في شقَاقٍ فَسيكْفيكَهم الله وهو السميع الْعليم(١٣٧) صبغةَ الله ومن أحسن من الله صبغةً**﴾**البقرة**/ ١٣٦–١٣٨.

واتە: بڵێن باوەڕمان بەخوا هێناوە هەروەها بەوەی نێرراوەتە خوارەوە بۆمان و بەوەش نێرراوەتە خوارەوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکان و بەوەش کە بە موسا و عیسا و پێغەمبەرانی تر دراوە، جیاوازی لەنێوان هیچ کامیاندا ناکەین و ئێمە گەردنکەچی فەرمانی خواین. جا ئەگەر ئەوانیش بەوێنەی باوەڕهێنانی ئێوە باوەڕییان هێنا ئەوا ڕێگای ڕاستیان گرتووە. خۆ ئەگەر واشیان نەکردو پشتیان هەڵکرد، ئەوا لەدووبەرەکی و ناکۆکیدا دەبن و خواش لەخراپەیان دەتانپارێزێت، بێگومان ئەو زاتە تەواو بیسەر و زانایە.

ئەم شێوازە لە باوەڕهێنان و شوێنکەوتنی، نەخشەو داڕشتنی خوایەو ئەوە باوەڕهێنانی ڕاست و دروستە. .. جا کێ نەخشە و داڕشتنەکانی لەوانەی خوا ڕاستتر و چاکترە ! !.

Nبەپیرۆزدانانی پەیوەندیی مرۆڤایەتی بەگشتی: ﴿**يأيها الناس إنا خلقْناكُم من ذكَرٍ وأنثَى وجعلْناكُم شعوبا وقَبائلَ لتعارفُوا إن أكْرمكُم عند الله أتقَاكُم إن الله عليم خبِ**﴾الحجرات /١٣.



واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لەنێرو مێیەك فەراهەم هێناوە و کردومانن بەچەندین گەل و هۆز، تاکو ئێوە چاکەکاریی لەگەڵ یەکدا ئەنجام بدەن، (چونکە ئێوە نەوەی یەك دایك و باوکن و هەمووتان چون یەکن ) ئەوەتان لەلای خوا بەڕێزترە کە زیاتر چاکەکار و لەخواترس بێت. خوای گەورەش تەواو زانا و ئاگایە بەهەموو هەڵسوکەوت و چالاکییەکتان.

* بەپیرۆزدانانی یەکیەتی باوەڕداریی لە ئوممەتی ئیسلامییدا و پارێزگاری کردنی و بنەبڕکردنی کێشەکانی نێوانیان: ﴿**وإنْ طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما فإنْ بغت إحداهما على الأخرى فقاتلوا التي تبغي حتى تفيءَ إلى أمر الله فإنْ فاءت فأصلحوا بينهما بالعدل وأقسطوا إن الله يحب المقسطين (٩)إنما المؤمنونَ إخوةٌ فأصلحوا بين أخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمونَ**﴾ الحجرات /٩-١٠.

واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لەباوەڕداران پێکەوە جەنگان خێرا رێکیان بخەن، ئەگەر یەکێکیان ستەمی لەویتر کردبوو و ملیشی بەرێکەوتن نەدا، لەگەڵیدا بجەنگن تا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خواو بەئاشتی رازی دەبێت... کە وای کرد دادپەروەرانە رێکیان بخەن... زۆر دادپەروەربن چونکە خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت... باوەڕداران برای یەکترن. ..ئێوەش نێوان براکانتان رێك بخەن و لەخوا بترسن و بۆ رێکخستنی ئەوان گوێڕایەڵی بن، بۆ ئەوەی لەلایەن خوای گەورەوە رەحمتان پێ بکرێت.

## ژیانی حزبایەتی:

ئەوەی شایانی ئاماژەپێکردنە ئەوەیە مامۆستا حەسەن بەننا لەسەر ئەو حیزبایەتییەی گەل پەرت وبڵاو دەکات قسەی کردووە، نەك دەربارەی حیزبایەتی خاوێن و بەشیویەکی گشتیش دەربارەی بەرنامە چاکسازییەکان و تێڕوانینە سیاسییەکان و رێبازە کارگێڕییەکان بیروبۆچوونی جیاوازی هەیە.

پێی وایە تاکەکان لەچوارچێوەی حیزبایەتی خاوێندا دەتوانن هەلی هاوبەشیکردنی فەرمانڕەوایی و دروستکردنی بڕیاری سیاسیان هەبێت.

راوێژکردن و ئازادی ودادپەروەریی و یەکسانی ئەو بنەما گشتییانەن کە ئیسلام داوای پەیڕەو کردنیان دەکات. ئەمانەش لەسایەی یاسایەکدا دەپارێزرێن، کە رێزی رێکخستنە سیاسییەکان بگرێت و رێگای مومارەسەی چالاکییەکانیان لەسنووری بەرژەوەندی گشتییدا بۆ خۆش بکات.

دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن دوو ڕووی یەك پارەن و ئامانجیان ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕایە لەنێوان دەسەڵات و خەڵکدا، دەسەڵات پێویستی بەکەسانێکە رێنیشاندەری بن و پشتی بگرن و ئۆپۆزسیۆنیش پێویستی بەکەسانێکە رێکیبخەن و سەرکردەیی بکەن. ئەم دوانەش کاری پارتە سیاسییەکانن[٨٢].

پرسی حیزبایەتی هۆکاری دروستبوونی ئاڵۆزی بووە، لەناو بزوتنەوە ئیسلامییەکاندا ئیمام بەنناش –بەڕەحمەت بێت– لەسەر پرسی حیزبایەتی میسری زۆر قسەی کردووە و دەڵێت: هەموو لایەك كۆدەنگن لەسەر ئەوەی پارتە میسرییەکان هۆکاری خراپەکاریی و گەندەڵی وڵاتن، کە هەموو لایەك بەئاگریان دەسوتێن. ئەمانە بەپێی نەریت و یاسای حیزبایەتی لەهەر وڵاتێکی دنیادا حیزب نین، بەڵکو کۆمەلانێك لەخەڵکن ناکۆکی شەخسییان پێکەوە هەیە، جا هەلومەرجی ئەوەیان بۆ دروست بوە کەبەناوی خەڵکەوە قسە بکەن و داوای مافی نەتەوەییان بکەن.

هەروەها لای هەمووان ئاشکرایە کە ئەو حیزبانە بەرنامە و پرۆگرامیان نیە، و هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە جگە لەکەسەکان، چونکە فەرمانڕەوایەتی نوێنەرایەتی لەکۆنترین نیشتیمانیدا لەسەر زیادەڕەوی لەحیزبایەتیدا راگیر

(٨٢) الإسلام و حقوق الإنسان، د.القطب محمد طيلة، ص٢٤٩.



نەبووە، بۆ نموونە لەئینگلتەرا تەنها دوو حزب هەن و دەسەڵات ئاڵوگۆڕ دەکەن، حیزبایەتیکردنیان لەناو ریزەکانی خۆیاندایە و هەموو دەمیش پرسە نەتەوەییەکان کۆیان دەکاتەوە و دەربارەیان جیاواز نابن، لەئەمەریکاش بەهەمان شێوە.

لەبەر ئەمانە ئیمام بەننا دوای ئەم رونکردنەوانە گەیشتە ئەنجامی ئەوەی داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو حیزبانە بکات [٨٣].

لەگەڵ ئەوەی ئیمام بەننا جیاوازی دەکرد لەنێوان ئەو حیزبانەی بۆ بەرژەوەندیی تاکەکان کاردەکەن، لەگەڵ ئەوانەی بۆ بەرژەوەندیی ئوممەت و بۆ ئاڵوگۆڕی دەسەڵات هەوڵیان دەدا، جیاوازی دەکرد لە نێوان حیزبە گەندەڵەکان و ئەوانەی پرۆگرام و بەرنامەی چاکسازییان هەبوو، کەچی کە دەستەواژەی هەڵوەشاندنەوەی حیزبەکان هاتە ئاراوە، بوویە یەکێك لە خواستە سیاسیەکانی بزوتنەی ئیسلامیی لە میسر... لەوێشەوە گوێزرایەوە بۆ ولأتانی تر، تا وای لێهات داواکاری هەڵوەشاندنەوەی حیزبەکان بوویە دروشمی ئەو قۆناغەیان و لەهەموو بۆنەیەکدا بەرزیان دەکرەوە.

ئەم پرسە کاریگەریی خراپی هەبوو بۆ بزوتنەی ئیسلامیی، تاوای لێ هات دوژمنانی بە دیکتاتۆریەت وەسفیان دەکرد، کە حکومەتی میسری حیزبەکانی هەڵوەشاندەوەو ئیسلامییەکان لێی بێدەنگ بوون، ئەوە بوویە هۆی ئەوەی ئەو حیزبانە هێرشیان بکەنە سەر [٨٤]، بۆچی ئەوان بەر هەڵوەشاندنەوە

(٨٣) مشكلاتنا في ضوء النظام الإسلامي، حسن البنّا، ٤٥–٤٩.

(٨٤) ئەم هێرشانە بەرامبەر ئیسلامییەکان ئەندازەیەك ستەمی بەرامبەر بە برایان تێدابوو، چونکە ئەوان لەسەرەتاوە دژی ئەوە وەستان کە شۆڕشی میسری بەرەو تاکڕەوی بڕوات، بەڵگە نامەکانی ئەو سەردەمە سوور بوونی ئەوان لەسەر ئەو خواستە دەردەخەن، کە داوایان کردووە ئازادییەکان بدرێتەوە بەخەڵك و یاسای نوێنەرایەتی پەیڕەو بکرێت. رابەری گشتی ئیمام (حسن

نەکەوتوون. هەرچەندە دوایی سەرەی ئەوانیش هات و بەدەردی حیزبەکان بران و کەسیش لەسەریان نەهاتە گۆ.

هەروەها دوای ئەو هەمووسەختیانەی رووبەڕووی بزوتنەوە ئیسلامییەکان لەزۆربەی وڵاتاندا بوویەوە، چاکتر وێنەکە روون بوویەوە و دەرکەوت رژێمەکان هەموو حیزبەکان قەدەغە دەکەن و هەموو ئازادییەکان ژێر پێ‌دەخەن و حیزبێك بۆ خۆیان پێکدەهێنن و هەموو دەسەڵاتی بۆ قۆرخ دەکەن و سەرکوتی هەموو مرۆڤەکان و مافەکانیان دەکەن، و قسەکردن و بیروڕا و کۆبوونەوە یاساغ دەکەن و ئەوەی ئەمڕۆ لەگەڵی ڕێکبن سبەینێ پشتی دەشکێنن !!

دوای هەموو ئەو ئەزموونە تاڵانە بزوتنەوە ئیسلامییەکان تا ئێستا گەیشتونەتە ئەم ئەنجامانە:

Nفرەیی سیاسی پێویستە و هەمە جۆرییان خزمەتی کاری سیاسی دەکات و دەرژێتە بەرژەوەندی گەلەوە.

Nلەچەند وڵاتێکدا بزوتنەوەی ئیسلامیی هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبەکانی تردا پێکهێنا. لەمیسر برایان یەکەمجار لەگەڵ حیزبی وەفد دا هاوپەیمانییان کرد، پاشان لەگەڵ هەردوو حیزبی ئازادان (**الأحرار**) و کار (**العمل**)دا. لەپاکستان کۆمەڵی ئیسلامیی لەگەڵ چەندین حیزبدا. لەتورکیا پارتی رەفاه بەسەرۆکایەتی پرۆفیسۆر (**نجم الدين اربكان**) بەهاوپەیمانییەتی لەگەڵ عەلمانیترین حیزبی تورکدا کە حیزبی ڕێگای راستە بەسەرۆکایەتی تانسۆچیلەر کرد و حکومەتیان پێکەوە پێکهێنا. هەروەها بزوتنەوەی ئیسلامیی لەسوریا هاوپەیمانێتی کرد لەگەڵ حیزبە عەلمانیەکانی یەکیەتی سۆسیالیستی عەرەبی و بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی.

---

– الهضيبي) چەندین نامەی بۆ پیاوانی شۆڕش نارد تاواز لەباری نا ئاسایی بێنن و بگەڕێنەوە بۆ سندوقی دەنگدان. سەرچاوە (التربية السياسية عند الإخوان، عثمان عبدالمعز رسلان).



## حیزبی ناموسوڵمانەکان ( أحزاب غیر المسلمین ):

لەبابەتی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە فرەیی سیاسی لە چوارچێوەی پارتانی موسوڵماندا قبوڵکرا، بەو پێیەی هەموو کۆك بن لەسەر ئەوەی ئیسلام بنەمایەکی گشتییە، با لە پلان و پرۆگرام و وردەکاریەکاندا جیاوازبن. ئەم بیرۆکەیە زیاتر گەشەی سەند و قبوڵکردنی رێکەوتن و هاوپەیمانی لەگەڵ هەموو پارت و لایەنێکدا کرا ،جا لەبەر ئەوەی ئیسلام ناموسوڵمانەکان بە بێپارێزگاری کردن بەجێناهێڵێت، بەڵکو ئەوە لەلای گرنگە کە لەکۆمەڵگەی ئیسلامییدا جوان مامەڵە لگەڵ کەمایەتییە ئایینی و سیاسییەکاندا بکرێت. بەپێی ئەمە ئەو کەمایەتییانە مافی ئەوەیان دەدرێتی راوبۆچوونی خۆیان دەربڕن و مومارەسەی چالاکی هزری و سیاسی خۆیان لە رێگای رێکخراو و پارتی سیاسی تایبەت بەخۆیان ئەنجام بدەن(٨٥).

لەوەش زیاتر راوێژکاری برایانی موسوڵمان (**مأمون الهضیبي**) لەلێدوانێکدا ئەوەی بەئاسایی و پەسەندزانی کە قیبتییەکانی میسر پارتێکی تایبەت بەخۆیان پێکبهێنن (٨٦).

خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەباشی باسی هاوپەیمانی (**الفضول**) کە لەسەردەمی نەفامیدا ئامادەی بوو بوو، کە وەکو خۆی پەیمانییان لەسەر یارمەتیدان و سەرخستنی ستەملێکراوان کردبوو، لەوبارەیەوە فەرموویەتی کە ئەگەر لەسەردەمی ئیسلامیشدا بۆ ئاوا هاوپەیمانییەك بانگ بکرێت وەڵام دەداتەوەو هاوبەشی دەکات.

---

(٨٥) عمر بن الخطاب و أصول علم السیاسة و الإدارة الحدیثة، سلیمان الطحاوي ص ٣٨٤.

(٨٦) رابەری گشتی برایان (حسن الهضیبي) ئەوەی دەربڕی کە خراپییەك لە پێکهێنانی حیزبی شیوعیدا نابینێت. التربیة السیاسیة عند الإخوان، ص٣٥٧.

## ئەمە روونکردنەوەیە بۆ خەڵك:

لەبەیاننامەیەکدا کە کۆمەڵی برایانی موسوڵمان لەساڵی (١٩٤٤ ز) لەژێر ناونیشانی فرەیی سیاسی لەکۆمەڵگەی موسوڵماندا, بڵاویان کردەوە، تێیدا هاتووە:

ئێمە لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا باوەڕمان بەفرەیی حیزبی هەیە، هیچ کات پێویست ناکات دەسەڵات لەلایەن خۆیەوە کۆسپ و قەید لەسەر پێکهێنانی کۆمەڵ و پارتی سیاسی دابنێت، بەڵکو پێویستە ڕێگا بدات هەر حیزبێك بانگەشە بۆ هەرچی دەکات با ئاشکرا و روونی بکاتەوە، ، جا کە پێکهێنانی پارتە سیاسییەکان بەو شێوەیە پەسەند بێت، ئەمە ئەوەش دەگرێتەوە کە ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لەنێوان کۆمەڵ و پارتە سیاسییەکاندا پەسەند بێت.

بەم شێوەیە ئەو یەکەم تێڕوانینە دەربارەی بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان کە گوایە دژی هەموو حیزبێکن، ئەوان بەبەیاننامەیەکی ئاشکرا راستی دەکەنەوە، ئەوەش روون دەکەنەوە کە بانگەشە بۆ فرەیی حیزبی و فرەیی کۆمەڵانی سیاسی دەکەن، هەروەکو شێوازی فرەیی لەقوتابخانەکانی بیروباوەڕو فیقهدا، کە لەچەندین قۆناغی جیاوازی مێژووی ئیسلامییدا پێکهاتوون.

ئەم بابەتە بزوتنەوەی برایانی موسوڵمان دەخاتە سەر هێڵێکی تەریب لەگەڵ یاسا سیاسی و دیموکراسییەکان، کە فرەیی حیزبی بەپێوستی سەرەکی پێکهاتەی خۆی دەزانێت.

## ئاڵوگۆڕی دەسەڵات:

لەم بارودۆخە نێودەوڵەتییەی ئێستاداو، لەسایەی ئەو رژێمە دەسەڵاتدارانەی کە هەندێ شت لەئیسلام وەردەگرن و گەلێکیشی لێ پشتگوێ دەخەن و



لەسۆنگەی ئەو هەڵمەتە ئاشکرانەی دەکرێتە سەر بزوتنەوە ئیسلامییەکان و هەرچۆن بن بە توندڕەوی و پەڕگیری خەتاباریان دەکەن... کە ئەگەر داوای هەڵبژاردن بکەن پێیان دەڵێن: دەیانەوێت دیموکراسی بۆ وەلانانی دیموکراسی بەکاربێنن و هەروەها کاری تاکەکەسییان بە بنەمای ئیسلام لێك دەدەنەوە و هەڵەی موسوڵمان بەناتەواوی ئایین دەدەنە قەڵەم.

لەبەر ئەم هۆکارانە – کە هۆکاری بەرجەستەن و ناکرێت پشتگوێ بخرێن– بزوتنەوە ئیسلامییەکان پێویستە پیاچوونەوەی هەندێ قسەڵۆك بکەنەوە کە بەدەم خەڵکەوەیە و هەر دەیلێنەوە، تا هەڵوێستی خۆیان زۆر بەروونی و بەڕاشکاوانە دەربارەیان دیاری بکەن.

**قسەڵۆکی یەکەم:** کەسانێك دەڵێن: ئیسلامییەکان واتێگەیشتون کە ئەم ئوممەتە موسوڵمانە و ئەوان نوێنەری راستەقینەی ئەون و ئەم دەسەڵاتدارانە کەمایەتییەکن و لەڕێگای فێڵ، یان هێز یان میراتییەوە، چونەتە سەر دەسەڵات و بەهێز نەبێت لانادرێن. بۆ ئەم مەبەستە ئایەتەکانی جیهاد دەهێننەوە، ئەوانەی کە جیهاد ناکەن و ئەو دەسەڵاتدارانەی بە غەیری ئەوەی خوا ناردوویەتی، فەرمانڕەوایی دەکەن بەکافر دەزانن و ئەوانە باوەڕیان وایە کە ئەو یاسایانە هێندە دژوارییان تێدایە کە بەهیچ هەوڵێکی ئاشتییانە چارەسەر ناکرێن(٨٧).

ئەمانە ئەوانەن کە ئەمڕۆ کوشتن و تەقاندنەوە ئەنجام دەدەن و گەورەترین خراپە بەرامبەر خۆیان و گەل و ئایینەکەشیان –کە خۆیان بەنوێنەری دەزانن– دەنوێنن.

**قسەڵۆکی دووەم:** کەسانێك دەڵێن: هەندێك لە ئیسلامییەکان باوەڕیان وایەکە پێویست

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص ٥٦.

بەزووترین کات دەست لەدەسەڵات گیر بکرێت و ئەوانەی لەدەسەڵاتدان وەدەربنرێن. چونکە ئەوانە چەندە لەدەسەڵاتدا بمێنن هەموو تواناکانی دەسەڵات بەکاردێنن بۆ ئەوەی ئیسلامییەکان دووربخەنەوە، با لەناو ریزی کۆمەڵگەشدا بەهێزبن و زۆرینەی دەنگیش هی ئەوان بێت[٨٨] !!

**قسەڵۆکی سێیەم:** هەندێکی تر لەخەڵك باوەڕیان وایە:کەئەگەر ئیسلامییەکان بگەنە دەسەڵات هەموو هێزەکانی تر وەدەردەنێن ودیکتاتۆرییەتێکی ئیسلامیی دێتە کایەوە، کە ئایین و دەسەڵات بۆ سەرکوتکردنی رای بەرامبەر دەخەنە کار.

**قسەڵۆکی چوارەم:** کە لەهەمووی گرنگترە دەوترێت: کە ئەگەر ئیسلامییەکان گەیشتنە دەسەڵات ئیتر وازی لیّ ناهێنن، بەهەرچی بێت و هەرچەندی تێبچێت بۆ لایەنێکی‌تر دەستبەرداری نابن.

ئایا دەگونجێت فەرمانڕەواییەك کە باوەڕی بەخوا و پێغەمبەر هەیەو یاسا و شەریعەتی ئیسلام پیادە دەکات بدرێتە دەست لایەنێکی عەلمانی راستڕەو یان چەپڕەو؟ ئایا ئەوە پاشگەزبوونەوە نییە؟

ئەم قسەڵۆکانە کە هەموو نەیارانی سیاسی ئیسلام وسەرکردەی پارتەکان دەیڵێن. هەروەها سەرکردەکانی رۆژئاواش هەر ئەمە دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن: ئیسلامییەکان دیموکراسی بەکاردەهێنن تاکو دەسەڵات بەدەست دەهێنن... دوای ئەوە دیموکراسی وەلادەنێن و دەستدەگرن بەسەر دەسەڵاتدا و رێگای لایەنەکانی تر نادەن.

ژمارەیەك لە نووسەر و بیریارانی ئیسلامیی و بەشێکی دیار لەجەماوەری ئیسلامیی پشتگیری ئەم بیروبۆچوونە دەکەن... لەتێڕوانینی ئەواندا،

---

(٨٨) سەرچاوەی پێشوو، ص ٧٥.

دیموکراسی نەفامییە و پارتەکان دوو جۆرن. پارتی خوا و پارتی شەیتان. . هەموو شتێك لایان یان رەشە یان سپی، بۆیە رێگای ئاڵوگۆڕی دەسەڵات بەبیری ئەواندا گوزەر ناکات.

لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە، ئایا ئیسلامییەکان ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لەگەڵ نا ئیسلامییەکاندا قەبوڵ دەکەن..؟(٨٩)

با هەر لەسەرەتاوە بڵێین چوونە ناو دەسەڵات وەکو چوونەدەر لیێ نیە، زۆربەی ئەوانەی لە جیهانی سێدا بەسیاسەتەوە خەریکن بەجوانی ئەمەیان لەبەرە و هەموویان سەرجەم دەروازەکانی فیقه و یاسای چوونە سەر دەسەڵات شارەزان، بەڵام شارەزاییان لە فیقه و یاساکانی وازهێنان لە دەسەڵات لەئاستی سفر دایە. ئیسلامییەکانیش – هەرچەند تاقی نەکراونەتەوە– لەم حاڵەتە بەدەرنین و لەپاشخانی هزری ئەواندا ئەوە هەیە کە ئەوان هەڵگری پەیامی خوایین و ئاڵوگۆڕی دەسەڵات بەکەمتەرخەمیی لە ئەرکی شەرعی دەزانن!!

ئەم بابەتە بایەخێکی زۆری هەیە. .. شیاو و گونجاو نییە ئیسلامییەکان دەربارەی دیموکراسی و فرەیی سیاسی رای خۆیان یەکلا بکەنەوە، کە گەیشتنە دەسەڵات، پاشگەز ببنەوە و واز لە هەردووکیان بێنن و ئاڵوگۆڕی دەسەلات رەتبکەنەوە.

گەورەترین بزافی ئیسلامیی، ئەم کارەی یەکلا کردووەتەوە، لەبەیانی سیاسی برایانی موسوڵماندا کە لە ساڵی( ١٩٩٤ ز) دەرچووە هاتووە: ئێمە وادەبینین کە قەبوڵکردنی فرەیی سیاسی لە کۆمەڵگەی ئیسلامییدا قەبوڵکردنی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتە لە نێوان کۆمەڵ و پارتە سیاسییەکاندا، ئەمەش لە رێگای هەڵبژاردنی پەرلەمانی دەورییەوە.

(٨٩) الإسلام و الديموقراطية، فهمی هويدی، ص١٦٤–١٧١.

**هەروەها** مامۆستا (**فهمي هويدي**) فەتوایەکی مامۆستا (**يوسف القرضاوي**) لەسەر ئەو بابەتە نەقلّ دەکات، کە تیایدا دەڵێت: ئیسلامییەکان ئەگەر توانییان لەدەرەوەی دەسەڵاتەوە دەنگی خەڵك بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن کە چوونە سەر دەسەڵات ئەو متمانەیان لەدەستدا، مانای وایە کەمتەرخەمییەکی زۆر لەکاریاندا ئاشکرایە و بێتوانایی سەری لێداون لەئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا. لێرەدا پێویستە باجی ئەو ناتەواییە بدەن و دەسەڵات بۆ ئەوانە بەجێ بهێڵن کە خەڵکی متمانەیان پێدەدەن.

لەم حاڵەتەدا ئیسلامییەکان پێویستە بگەڕێنەوە بۆ سەرەتای رێگا. . بچنەوە بۆ قۆناغی بانگەوازکردن کە لەپێش قۆناغی دەوڵەتدارییەوەیە [٩٠].

## برایان و یەکیەتی موسوڵمانان:

ئیمام بەننا ئەوەی روونکردووەتەوە کە لاوازی موسوڵمانان لەپەرتی و ناکۆکیدایە و هێزیان لەیەکگرتن و گردبوونەوەیانە لەسەر ئیسلام. ئەوەشی روونکردوەتەوە کە ئیسلام شوێنکەوتووانی یەك دەخات. . هەرچەندە زمان و رەنگ و وڵاتیان جیاواز بێت، لەژێر ئاڵای خۆیدا کۆیان دەکاتەوە و بۆ یەکیەتی جیهانی ئیسلامیی بانگیان دەکات, ئەمانەی بەبەڵگە لە قورئان و فەرموودە و لەمێژووی ئیسلامییەوە دووپاتکردووەتەوە.

ئەوەشی روونکردووەتەوە کە کارەساتی گەورە ئەوەیە کە رووی لەدڵ و مێشکی موسوڵمانان کردووە. پاشان ئەوەی رووی لە خاك و وڵاتیان کردووە. .. ئەوەیە کە دووچاری رەگەزپەرستی و هۆزگەرایی بوون و هەر گەل و ناوچەیەك شانازی بەرەگەزی خۆیەوە دەکات. ئەوەیان لە بیرچووە کە ئیسلام

(٩٠) الإسلام و الديموقراطية، فهمي هويدي، ص ١٧١.



بۆیە هاتووە ئەو دەمارگیری و خۆهەڵکێشان و شانازیکردنانە بەرەنگ وبنەچە و رەگەزەوە نەهێڵێت.

هەروەها ئەوەشی روونکردووەتەوە کە یەکیەتی موسوڵمانان و کۆدەنگییان فەرزێکە لە فەرزەکانی ئیسلام و لە ژێر ناونیشانی: (یەکیەتیمان لە ژێر رۆشنایی ئاراساتەی ئیسلامییدا) دەڵێت: ئاوات و خواستی ئێمە لەبەردەم ئەم هەموو بارودۆخە تازەی جیهاندا و لەبەردەم ئەم هەموو کێشە و گرفتانەدا یەك چشتە، ئەویش دابینکردنی ئازادی و شکاندانی کۆتی ژێردەستەیی و داگیرکارییە لەسەرمان، بۆیە پێویستە پەنا بۆ ئەوشتانە ببەین کە ئیسلام لەسەری پێویست کردووین. .. لەپێشی هەموویانەوە یەککەوتن و یەکبوونمان, ئەوەش لای ئێمە مانایەکی بەرزی ئیمانییە. بۆ ئەم مەبەستە داوای یەکیەتی دەوڵەتانی ئیسلامیی و یەکییەتی ئوممەتانی ئیسلامیی دەکرد(٩١).

## برایانی موسوڵمان و خەلافەت:

بابەتێکی تر پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکرێت.... ئایا برایان تێڕوانینیان بۆ خەلافەت لە شێوەی تازەیدا چۆنە؟

ئیمام بەننا دەربارەی ئەم بابەتە لەپەیامی پێنجەمین کۆنگرەیان کە لە ساڵی (١٩٣٨ ز)بەسترا و لە ژێر ناونیشانی: (برایانی موسوڵمان و خەلافەت)دا دەدوێت و دەڵێت: خەلافەت رەمزی یەکیەتی ئیسلامە و نیشانەی پێکەوەبوونی گەلانی موسوڵمانە، ئەو دروشمە ئیسلامییە کە پێویستە هزری موسوڵمانان پڕ بکات، بەتایبەتی پاش وەلانانی خەلافەت لە ساڵی (١٩٢٤ ز) دا، لەبەر ئەمە برایانی موسوڵمان ئەم بابەتە لەشوێنی باڵای بەرنامەکانیاندا دادەنێن و کاری بۆ دەکەن.

---

(٩١) مشكلاتنا في ضوء النظام الإسلامي، حسن البنّا ،٣٥٢–٣٥٦ مجموعة الرسائل.

بەڵام هەنگاونان بۆ دامەزراندنەوەی خەلافەت چەندین هەنگاوی تری لە پێشەوەیە.

پێویستە هاریکاری رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و ئابووری لە نێوان گەلانی موسوڵماندا پێك بێت..پاشان هاوپەیمانێتی لە نێوان خۆیاندا دروست بکەن و پێکەوە کۆببنەوە و کۆنگرەی هەمەچەشنە ببەستن.

ئەو کۆنگرە پەرلەمانییەی بۆ پرسی فەلەستین بەسترا و بانگهێشتکردنی وڵاتانی ئیسلامیی بۆی تا داوای مافەکانی گەلی فەلەستین بکەن دوو هەنگاوی چاك و بەسوودی ئەو بوارەن.

دوای ئەوە (**عصبة الأمم الإسلامية**) پێك بهێنرێت و بەرهەمی ئەمانە دیاریکردنی رابەرێك بێت بۆیان کە هۆکاری پێکەوە بەستن و کۆکەرەوەی لایەنەکان و بەجێهێنەری خواستی دڵەکان بێت.

خەلافەت شێوازێکی ئیجتیهادییە، خەلیفەکانی راشیدین دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشتن و چەند سەدە دوای ئەوە بەردەوام بوو، بێگومان شێوزاو ناوەڕۆکی هەیە.

شێوازەکەی موسوڵمانان خۆیان بەگوێرەی گونجانی لەگەڵ زەماندا و بە مەبەستی هێنانەدی ناوەڕۆکەکەی دیاری دەکەن.

ناوەڕۆکی خەلافەت ئەوەیە: شەریعەت فەرمانی پێکردووین کۆدەنگ بین و لەپەرتەوازەیی و ناکۆکی بەدووربین، تاکو ئاسایشی گەلانی ئیسلام بپارێزین و نەبینە جێگای نیازی داگیرکەرانی چاوچنۆك و پێشکەوتن و گەشەی پێویستمان بۆ بێتە دی.

لەپێشترین و گرنگترین ئەرکی ئوممەتی ئیسلامیی لەم سەردەمەدا کە سەردەمی هاوپەیمانێتی و یەککەوتنە،دۆزینەوەی شێوازێکی گونجاوەبۆ خەلافەت،

تاکو هێزو پێزیان دەستکەوێت وببنە شوورای پارێزگاری یەکتری.

ئەوەی کە لەژیانی سیاسی ئەم سەردەمەدا هەیە... وەکو یەکیەتی ئەورووپی و یەکیەتی فیدراڵی ئەمریکی و یەکیەتی ئەفریقی و هاوپەیمانی دەوڵەتانی کەنداو و یەکیەتی دەوڵەتانی مەغریب, بەئەندازەی زیادو کەم لەهێزی پەیوەندییەکانیاندا نموونەی کرداری و ئاستێکی باشن لە هاوکاری سیاسی و کۆمەلآیەتی و ئابووری و جێگای ئەوەن گەلانی ئوممەتی ئیسلامیی سوودیان لێوەربگرن.

پێویستە لەسەر بزاڤە ئیسلامییەکان بەگشتی و کۆمەڵی برایانی موسوڵمان بە تایبەت بایەخ بەم پرسە بدەن، تاکو پسپۆڕانی یاسا نێودەوڵەتییەکان و سیاسەتمەداران ئیجتیهادی شێوازێکی گونجاو و بەسوودی خەلافەت بۆ ئەم سەردەمە بکەن، پێم وایە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نموونەی شایانە بەدیراسە و لێکۆڵینەوەی وردی پێشکەش کردووە, هەروەها یەکیەتی ئەورووپا، دەگونجێت هاوشێوەی ئەوانە شێوازێکی سەردەمیانەی خەلافەت بهێنرێتە کایە کە سوودو چاکەی هەموو گەلانی ئیسلامیی تێدابێت.

ئەم ئەرکە پیرۆزە و ئەم کارە بابەتییە گرنگەی، کە ئەگەر موسوڵمانان پێی هەڵسن سەراپای بەختەوەری دەبێت بۆیان، بێ وەفاییە ئەگەر لەبەردەم بانگەشەکارەکەیدا ئیمام حەسەن بەننا بەڕێزەوە نەوەستین و هەنگاو بۆ جێبەجێکردنی نەنێین و، بەرامبەر ئەو بانگەشە چاکسازییە کە ئەو ژیانی خۆیی بۆ تەرخان کردبوو، نەزانین ئەرکمان چییە؟

بێگومان هەڵسان بەو کارە ئەرکی موسوڵمانانە بەگشتی و ئەرکی بزاڤی ئیسلامییە بەتایبەتی و ئەرکی کۆمەڵی برایانی موسوڵمانە بەتایبەتی تر، تاکو بەرپرسیارێتییان لەبەردەم خوا و ئوممەت و مێژوودا جێبەجێ بکەن... ئەمەش

کارێکی گرانە و رێگای جێبەجێکردنی سەخت و دژوارە، بەکۆمەك وپاڵپشتی خوای باڵادەست نەبێت، کە ئەگەر پشتی پێ ببەستین ئەو باشترین پشتیوان و کۆمەکیمانە: ﴿ **واعتصموا بالله هو مولاكم فنعم المولى ونعم النصير** ﴾ الحج/٧٨.

ئەم پرۆسە ژیارییە گرنگەی کە حەسەن بەننا وەکو بیرۆکە نەخشەکەی روون کردووەتەوە و بۆ جێبەجێکردنیشی چەندین هەنگاوی تێدا گوێزاوەتەوە و پاشان سپاردوویەتی بە برایانی موسوڵمان، پرۆسەیەکە هەر لەبناغەوە لەسەر بێدار بوونەوە و رابوونی ئوممەتی ئیسلامیی دادەمەزرێت، تاکو بێتەوە مەیدان و جارێکی تر بەرەو پێشکەوتن و گەشەکردن و سەربەخۆیی و دادپەروەری رێگا بگرێتە پێش و سەرجەم هۆکارەکان بەکاربهێنێت و بەهێوری و ئارامییەوە شان بداتە ژێر خواستەکانی بانگەوازو بەردەوام پیاچوونەوەی هۆکار و هەنگاوەکان بکات و هەڵەکانی راست بکاتەوە و پەیوەندی بەهێز لەنێوان برایانی موسوڵمان و هێزە سیاسی و فیکریەکان لەناوەوە و دەرەوە پێك بهێنێت و کارای بکات و بگەڕێت بەدوای ئەو هۆکارانەدا کە خزمەت بە بانگەواز و پرۆسەی ژیاری ئیسلامیی دەکەن و دۆست و پشتیوانی بۆ دروست دەکەن و چاوی دوژمنانی بەرامبەر حەقیقەتی ئیسلام و بانگەوازەکەی دەکەنەوە تاکو لانی کەم، نەیارانی دەست لە دوژمنکاری هەڵبگرن و لێی ببنە بێلایەن. دۆستانیشی هەندێ لە کۆسپەکانی رێگا لادەن و لەدەرەوەو ناوەوە هەلومەرجێك خۆش بکەن بەئاسانی جوڵەی تێدا بکەن و هەلەکان بقۆزنەوە بۆ ئەوەی زیاتر بەئاگابن و خەڵکی تر بە ئاگا بێننەوە.

هەر ئەمەش رێبازی ئیمام بەننا بوو لە بانگەواز و بزاڤەکەیدا. .. بانگەواز لای ئەو بوژاندنەوەی ئوممەت بوو، بۆ ئەوەی ببێتە ئوممەتێکی زیندوو و کارا وەك خوای گەورە داوای لێکردووە:﴿**يأيها الذين آمنوا استجيبوا لله وللرسول إذا دعاكم لما**

**یحییکُم﴾الأنفال/٢٤.** ..هەروەها وەك چۆن لە ئامۆژگارییەكاندا بۆ برایان، لەپەیامی لەنێوان دوێنێ و ئەمڕۆ (**بین الأمس و الیوم**) دا ئاماژەی پێداوە و دەڵێت: برایان ! ئێوە كۆمەڵەیەكی خێرخوازی یان حیزبێكی سیاسی یان دەستەیەكی كاتی بۆ مەبەستێكی تایبەتی نین.

ئێوە گیانێكی نوێن لەدڵی ئەم ئوممەتەدا بەقورئان دەیبوژێننەوە ،ئێوە تیشكێكی نوێن تاریكییەكانی بەخواناسین دەتارێنن و روناكی دەكەنەوە، ئێوە دەنگێكی زولاڵن بانگەوازەكەی پێغەمبەر ﷺ دەلێنەوە و خەڵكی بۆ گوێڕایەڵی خوای گەروە بانگهێشت دەكەن.. كە فەرمانڕەوایی بەوەی ناردوویەتی بەشێكی ئایینەكەیەتی و ئازادی فەرزێكە لە فەرزەكانی.

جا ئەگەر پێیانوتن: ئەمە سیاسەتە!! پێیان بڵێین: ئەمە ئیسلامە. ئەگەر وتیان: ئێوە خوازیاری شۆڕشن.. بڵێن: ئێمە خوازیاری حەق و ئاشتین و باوڕەمان هەر بەو رێبازە پتەوەو شانازیشی پێوە دەكەین.

ئیمام بەننا لەپەیام و وانە و كۆنگرەكانیدا پایەكانی راپەڕین وبناغەكانی پرۆسەی ئیسلامیی و بونیادنانی دەوڵەتی ئیسلامیی روونكردووەتەوە. .. جەختی لەسەر رێبازی میانەڕەوی و سیاسەتی نەفەس درێژی كردووە و كاتیشی بە بەشێك لەچارەسەر داناوە.

پەڕاوی (**أساسیات المشروع الإسلامي لنهضة الأمّة، قراءة في فكر الإمام حسن البنّا**) لەنووسینی مامۆستا (**عبدالحمید الغزالي**)دا، وەسفێكی گرنگی ئەم بابەتەی تێدا یە كە دەڵێت: ئەمە هەنگاوێكی كاریگەرو پێشكەوتنێكی فیكری بالآیە و بەرە و تێگەیشتنێكی قووڵی ئەم پرۆسەیە. پرۆسەی جێگیركردنی بەرنامەیەكی پڕ لە هیوا و بەربلاو بۆ بوژاندنەوەی ئوممەتی ئیسلام.

ئێمە هۆکارە بنەڕەتییەکانی هەستانەوە و پێشکەوتنمان هەیە، کە بریتین لە: مرۆڤ و سامانی سروشتی و کات و بیروباوڕێکی بزوێنەر.

گرنگترین ئەرکی بانگخواز ناساندنی وێنەی پرۆسەی راپەڕینی ئەم ئوممەتە و دەرخستنی نەخشەی جوڵەکردنە لەسایەیدا، کە مرۆڤ و سامانی سروشتی و کات کار لەیەکتر دەکەن و وزەی بیروباوەڕیش رۆڵی خۆی دەبینێت و بەرەو لوتکە ئاراستەی دەکات.

شارەزایی لەم پرۆسەیە و کارکردن تێیدا هەموو ئوممەتی ئیسلام پێویستی پێیەتی. . هەروەکو هەموو بانگخوازان پێویستە زۆر بەوردی دەرکیان کردبێت چ لەڕووی تیۆری و چ لەڕووی پراکتیکەوە، چونکە ئەوان پێشەنگی ئەو کاروانە و رێ نیشاندەرینی[٩٢].

## هەندێ چەمکی سیاسی

ئیمام بەننا لەپەیامەکانیدا باسی هەندێ زاراوەی سیاسی کردووە و رای برایانی تیادا روون کردوەتەوە لەوانە: نەتەوایەتی، نیشتیمان پەروەری، بەم شێوەیەی خوارەوە:

## نەتەوایەتی شکۆمەندی:

لە بارەیەوە دەڵێت: ئەوانەی کە شانازی بە نەتەوایەتییەوە دەکەن ئەگەر بیانەوێت نەوەکانیان رێگای باپیرانیان بگرن و شوێن پێی ئەو پێشینە گەورانە هەڵبگرن کە باوەڕیان بە پەروەردگارێتی خوا و پێغەمبەرایەتی (محمد) و ئایینی ئیسلام هەبووە و ئایینیان وەکو بیروباروەڕو شەریعەت و یاسای ژیان ناسی و بڵاویان کردەوە و فەرمانڕەوایی خەڵکیان دادپەروەرانە ئەنجام داو عەقڵی مرۆڤەکانیان بەنووری ئیمان رۆشن کردۆتەوە، ئەوە مەبەستێکی بەرزو

---

(٩٢) فرید عبدالخالق.

مانایەکی جوانە و لای ئیسلام پەسەند و ڕێزگیراوە، چونکە ئیسلام فەرمان بەموسوڵمانان دەدات کەشوێن پێی پێغەمبەر و خەلیفەکانی راشیدین و هەموو ئەو پیاوچاکانە هەڵبگرن، کە بەراستی خواناس و خەباتگێڕو چاکەویست و چاکەکار و مرۆڤدۆست بوون.

## نەتەوایەتی لە پێناو گەلی خۆدا:

ئەگەر مەبەست بەزاراوەی نەتەوایەتی ئەوە بێت کە گەلەکەی خۆت لا شایستە تر و لەپێشتربێت بەخێرو سامان و تێکۆشان لە گەلانی تر، ئەوا ئیسلام هانت دەدات چونکە بەلای ئەوەوە نزیکان بەچاکە لە پێشترن (**الأقربون أولى بالمعروف**). .. بۆیە ئەگەر کەسێك سەدەقە بداتە خزمەکانی دووپاداشتی دەست دەکەوێت. .. پاداشتی سەدەقەکە و پاداشتی چاکەش لەگەڵ خزمان[٩٣].

ئائەوە مەبەستی ئەو ئایەتە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ: ﴿**يسألونك ماذا ينفقون قل ما أنفقتم من خير فللوالدين والأقربين واليتامى والمساكين وابن السبيل وما تفعلوا من خير فإن الله به عليم**﴾**البقرة**/٢١٥. واتە: پرسیارت لێدەکەن کە چی ببەخشن، بڵێ هەرچیتان لەخێرو چاکە بەخشی، با بۆ دایك و باوك و خزمان و بێ باوکان و هەژاران و ڕێبواران بێت. ئەوەش بزانن کەهەر چاکەیەك ئەنجام بدەن خوای گەورە تەواو زانا و ئاگایە پێی.

هەروەها مانای فەرمودەیەکی تری پێغەمبەر ﷺ کە بە (**أبوطلحة**)ی فەرموو کاتێك ویستی باخە خورماکەی کە باشترینی سامانی بوو بکاتە سەدەقە و لە ڕێگای خوا بیبەخشێت و پێی فەرموو: پێم باشە بیبەخشیت بە خزمە نزیکەکانت، ئەویش دابەشی کرد لەنێوانی خزمانی نزیك و کوڕە مامەکانیدا[٩٤].

(٩٣) ئەوە فەرموودەیەکی (متفق علیە)یە.

(٩٤) ئەوە فەرموودەیەکی (متفق علیە)یە.

## نەتەوایەتی نەفامیی :

مەبەست لەم جۆرە نەتەوایەتییە بانگەشەیە بۆ زیندووکردنەوەی ئەو خوو و نەریتە نەفامییانەیە کە ئیسلام لەگۆڕینان، وەکو: دەمارگیری رەگەزیی و خۆبەزیادگرتن بەسەر خەڵکی تردا و رەواجدان بەبەهاکانی سەردەمی نەفامیی و وەلاخستنی بەها ئیسلامییەکان و مانا ئیمانیەکان و رەوشتە پەسەندەکان، بەو چەشنە پارتەی عەلمانیە نەتەوەییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و ئیسلام بە کۆنەپەرستی ناوزەدو تۆمەتبار دەکەن و پێیان وایە دەبێت ئایینی ئیسلام لە ژیان وەدەربنرێت و لەجێی ئەو فیکری عەلمانیی و سۆشیالیستی و شیوعی جێگیر بێت.

ئیمام بەننا دەربارەی ئەوە دەڵێت: ئەوە نەتەوایەتییەکی چەپەڵ و ئەنجام خراپ و چارە رەشە. ئەوە گەلانی رۆژهەڵات پێی ریسوا دەبن، کە واز لەجوانترین سیفات و ئاکاری خۆیان بێنن و پیرۆزترین دیاردەی پڕ شەرەفمەندیی خۆیان ژێر پێ بنێن، بەوە خۆیان تووشی زیانی گەورە دەکەن و ئایینی خوا زیانێکی لێناکەوێت... چونکە بڕیاری خوا وایە، ئەگەر خەڵکی بەو چەشنە پشت بکەنە ئایینەکەی، خوای گەورە دەیانگۆڕێت، ئەوان لەناو دەبات و کۆمەڵێکی تر دەهێنێت کە وەکو ئەوان نەبن: ﴿**وإنْ تتولوا يستبدلْ قوما غيركُم ثُم لا يكُونوا أمثالكُم**﴾محمد/٣٤ [٩٥].

## نەتەوایەتی دوژمنکاری:

ئەگەر مەبەستیش لە نەتەوایەتی شانازیکردن بەرەگەزی خۆوە بێت، تا ئەو پلەیەی کە خەڵکی تر بەکەم بزانرێت و دوژمنایەتییان لەگەڵدا بکرێت و بکرێنە

(٩٥) رسالة دعوتنا من مجموعة الرسائل –حسن البنّا ص ١٠٩.

قوربانی مانەوەو بەرژەوەندی خۆ. .. وەکو ئەوەی ئەڵمانیا و ئیتالیا کاتی خۆی بانگەشەیان بۆ کرد.. یان وەك ئەوەی دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان دەیانەوێت خۆیان بسەپێنن.. ئەوە مانایەکی چەپەڵە و دوورە لە رەوشتی مرۆڤایەتی و ئەنجامەکەشی ئەوەیە گەلان کوشتوبڕی یەکتر دەکەن، لەسەر شتێك کە لە راستیدا هیچ ئەرزش و بەهایەکی نییە, بەڵکو وەهمێکە و بەس[٩٦].

برایانی موسوڵمان نەتەوایەتی بەم مانایە و هاوشێوەکانی پەسەند ناکەن و باوەڕی پێناهێنن... چونکە ئیسلام رێگا بە فیرعەونییەت یان فینیقییەت یان عەرەبچێتی و شتانی لەو چەشنە نادات. بەڵکو باوەڕیان بەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کە خوای گەورە دەمارگیری و نەفامی و خۆهەڵکێشان بەباوپیرانی لەناوبردووە، خەڵك هەمووی نەوەی ئادەمن و ئادەمیش لە خۆڵە و کەس لەکەس رێزدارترنیە بەکردەوەی چاك نەبێت[٩٧].

## نەتەوایەتی لەتێڕوانینی ئیمام بەننادا :

حەسەن بەننا نەتەوایەتی بەمانایەکی ئیسلامیی لێکدەداتەوە و ئەو مانایەش لەسەر پەیوەندی بیروباوەڕ دادەمەزرێت، و ئەو پێی وایە ئەوەی باوەڕی بە پەروەردگار هێنا و ئیسلامی کردە بەرنامەی ژیانی و (محمد)ی بە پێغەمبەر و رێنیشاندەری خۆی زانی، ئەو کەسە لە نەتەوی ئیسلامە و پێویستە موسوڵمانان خۆشیان بوێت و پشتگیری بکەن و ماڵ و گیانیان بۆ پاراستنی بەکاربهێنن.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پەیوەستی خۆیانیان بۆ لای خوا گێڕایەوە و پاڵیان دا بەئایینەکەیەوە و هەرچەند وڵات و رەگەز و زمانیان و هۆزیان جیاواز بوو، بوونە برایانی خۆشەویستی یەکتری و شانازیان بەم پەیوەندیەوە دەکرد.. بۆیە

---

(٩٦) رسالة دعوتنا من مجموعة الرسائل –حسن البنّا ص ١٠٩.

(٩٧) سەرچاوەی پێشوو، ص ١٠٩–١١٠.

کە پرسیار لەیەکێکیان بکرایە ئایا تۆ لە هۆزی تەمیمی یان لە قەیس؟ لەوەڵامدا دەیگوت: ئیسلام باوکی منە و جگە لەو باوکێکی ترم نیە، گەرچی خەڵکی خۆیان بە قەیس و تەمیمەوە هەڵکێشن (٩٨).

لێرەدا تێدەگەین کە نەتەوایەتی ئیسلامیی نەتەوایەتییەکی مرۆڤایەتییە و هەموو رەگەز و گەل و هۆزێك دەگرێتەوە و تێدەگەین کە پەیوەندی بیروباوەڕ لەپەیوەندی خوێن و هۆز و زەوی و بەرژەوەندی بەهێزترە. ..هەرئەویشە کە دەتوانێت سەرجەم مرۆڤەکان بەدەوری یەکدا کۆبکاتەوە(٩٩).

## نیشتیمانپەوەری:

ئیمام بەننا لە پەیامی (دعوتنا)دا باس لەوە دەکات کە لەم چەرخەدا هەندێك بانگەشە سنووریان بەزاندووە و پێویستە بەتەرازووی ئیسلام رێك بکرێنەوە... ئەوەی کە رێك و گونجاو بوو بەسەرسەر و بەسەرچاو و ئەوەشی نەگونجاوە ئێمە لێی بەدوورین، لەم سۆنگەیەوە مانای نیشتمانپەوەریی شەن و کەو دەکات و رووە باشەکانی دەردەخات و پشتیان دەگرێت، و رووە خراپەکانیشی رەتدەکاتەوە،دوای ئەوە تێگەیشتنێکی سیاسی ئیسلامیی بۆ نیشتیمانپەوەریی دەهێنێتە کایەوە و دەڵێت: ئیسلام ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە نیشتیمانی خۆیان خۆشبوێت و بەرگری لیَ بکەن. . وەختە بلێّم: پەراوێکی فیقه یان فەرموودەت دەست ناکەوێت بەشێکی بۆ ئەو بابەتە لە ژێر ناونیشانی (جیهاد)دا تەرخان نەکردبێت و (جیهاد)یان بەم مانایە لێك نەدابێتەوە کە بریتییە لە بەرگری کردن لە نیشتیمان و هاووڵاتیان و ماڵ و سامان و حورمەتیان.

---

(٩٨) مجموعة الرسائل، ص ١٣٢-١٣٤.

(٩٩) مجموعة الرسائل، ص١١١-١١٢.



بۆ ئەمەش خۆشەویستیی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەککە دەکاتە بەڵگە، کاتێك کە (اصیل) باسی خۆشی مەککەی دەکرد و سۆزی خۆی بۆ دەردەبڕی، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەسرین لەچاوەکانی دەباری و دەیفەرموو:

(**یا أصیل دع القلوب تقرّ**) واتە: ئەی ئەصیل وازبێنە با دڵەکان ئۆقرە بگرن [١٠٠].

لە(صحیح) بوخاریشدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مەککە فەرموویەتی: (**واللە انّك لخیر أرض اللە، و أحبّ أرض اللە اليّ، ولولا أنيّ أخرجتُ ماخرجتُ**) [١٠١]، واتە: سوێند بەخوا تۆ چاکترینی زەوی خوایت و خۆشەویسترین زەوی خوایت لەلام ،ئەگەر لێت دەرنەکرامایە دەرنەدەچووم.

(بلال)ی کوڕی (رباح) کە لەخاکی مەککە بستێك زەوی نەبوو، بەڵام تێیدا ژیابوو، خۆشەویستیی چوو بوویە ناو دڵی، بۆیە کە باسی بکرایە دڵی دەهاتە جۆش و دەگریا و دەیووت:

**ألا لیت شعري هل أبیتنّ لیلة — بوادٍ و حولي إذخرٌ وجلیلُ**
**وهل أردنَ یوماً میاهَ مجنّةٍ — وهل یبدون لي شامةٌ و طفیلُ**

واتە: ئای خۆزگە دەگونجا شەوێك لە دۆڵێکدا بمامایەتەوە دەورم درەختی ئیزخرو جەلیل بوایە، ئایا ڕۆژێك دەچمە سەرئاوی (مجنە) و شاخی (**شامة**) و (**طفیل**)م لێوە دیاربێت؟.

**هەروەها** ئیمام بەننا –ڕەحمەتی خوای لێ بێت– ئەوەی ڕوون کردوەتەوە کە پێویستە لەسەر هاووڵاتیانی وڵاتێك پەیوەندی نێوانیان بەهێز بێت و ڕێنمایی کردوون کە چۆن ئەو پەیوەندییە بۆ بەرژەوەندیی دنیا و قیامەتیان بەکاربێنن و ئەوەشی بە فەرزێك لە فەرزەکانی ئیسلام داناوە و کردوونی بە بەڵگە کە

(١٠٠) مجموعة الرسائل، ص١٠٣.
(١٠١) صحیح البخاري.

پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی: (**وكونوا عبادالله إخواناً**) رواه مسلم، واتە: ببنە بەندەی خواو و برای یەکتری، هەروەها ئەو ئایەتانەی کە فەرمان دەدەت باوەڕداران ناحەزان و دوژمنانی خۆیان نەکەنە دۆست و ئاگایان لەخۆیان بێت نەکەونە داویان، چونکە ئەوان حەزیان لەچارەی ئەمان نیە، و چیان پێ بکرێت بۆ زیان پێگەیاندن خۆیانی لێ لانادەن و حەزیان لێیەتی، کینە و رق بەدەمیانەوە دیارە و ئەوەی لەدڵیاندا پەنگی خواردوەتەوە گەورەترە. ..

خوای گەورەش ئایەتەکانی خۆی بۆ ژیرەکان روون کردوەتەوە: ﴿**ياأيها الذين آمنوا لا تتخذُوا بِطانةً من دونِكُم لا يألونكُم خبالاً ودوا ما عنِتم قَد بدت البغضاءُ من أفْواههم وما تخفي صدورهم أكْبر قَد بينا لكُم الآيات إنْ كُنتم تعقلُونَ**﴾ **آل عمران/١١٨**.

هەروەها ئیمام بەننا ئەوەشی روونکردوەتەوە کە فراوانکردنی سەروەریی ئیسلامیی و بەهێزکردنی پێگەی نیشتیمان کە بیروباوەڕ و شەرعی خوا فەرمانڕەوایی بکات فەرزێکە لەفەرزەکانی ئیسلام.

## حیزباندنی نیشتیمانپەوەری:

ئیمام بەننا پێی وایە ئیسلام ئەم جۆرە نیشتیمانپەروەییە بەهەڵە و پوچەڵ دادەنێت و پێی وایە دەبێتە هۆی پەرتکردنی ئوممەت و کاولکاری وڵات، چونکە حیزبەکان دەبنە هۆی ناکۆکی و خوێنڕێژی و پیلانگێڕان و ململانێ لەسەر بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی خۆیان، ئەوەش دەبێتە بەرنامەی پیادەکراویان و بەوەش ئاگری ناکۆکی و ئاژاوە گیانی خەڵك و ئارامی وڵات لەناو دەبات. بۆیە دەڵێت: (ئەو جۆرە نیشتیمانپەوەرییە درۆ و بێخێرە، نەخوازیارانی و نەخەڵك سوودی لێ نابینن)[١٠٢].

(١٠٢) رسالة دعوتنا –مجموعة رسائل، ص١٠٥.



## نیشتیمانپەوەری لە فیقهی سیاسی ئیسلامییدا :

ئیمام بەننا –رەحمەتی خوای لیّ بێت– نیشتیمانپەوەریی لەڕوانگەی تێگەیشتنی سیاسی ئیسلامییەوە وادەبینێت، کە لەسەر پایەکانی بیروباوەڕ دادەمەزرێت، نەك لەسەر بەرزایی و نزماییەکانی زەوی، هەرپارچە زەویەك موسوڵمانێکی تێدابێت و (**لاإله الاّ الله**)ی تیادا بڵێت، ئەوە نیشتیمانی ئیسلامە و حورمەت و پیرۆزیی خۆی هەیە، پێویستە خۆشمان بوێت و بۆی دڵسۆزبین، لە پێناوی خێرو خۆشییدا کۆشش بکەین، هەموو موسوڵمانان لەهەرکام لەوڵاتانی ئیسلامییدا کەس و برای ئێمەن بەلامانەوە گرنگن و لەخۆشی و ناخۆشیدا هاوسۆزیانین.

جیاوازی لە نێوان نیشتیمانپەوەریی حیزبی و نیشتیمانپەوەریی ئیسلامییدا ئەوەیە: یەکەمیان سنووردار و تەسکە و دووەمیان بێسنوور و فراوانە، یان بەسنووری بیروباوەڕ جیادەکرێتەوە.

بەپێی ئەمە ئەو نیشتیمانەی موسوڵمانان کاری بۆ دەکەن، هەموو جیهانە پێویستە پەیامی ئیسلامی بگاتێ تاکو کاروباری رێکبخات و بەرژەوەندییەکانی بپارێزێت و دانیشتووەکانی خۆشبەخت بکات، هەرچەندە رەنگ و وڵات و زمان و ئایینیان جیاواز بێت.

جا ئەگەر بانگخوازانی نیشتیمانپەوەریی حزبی ئاواتیان رزگارکردنی ئەو پارچە زەوییە بێت کە لەسەری دەژین، تاکو سوود لەخێروبێری وەربگرن، برایانی موسوڵمان پێیان وایە ئەوە بەشێکی رێگاکەیە، یان قۆناغێکە لە قۆناغەکانی، چونکە وادەبینین کە پێویستە لەسەریان بۆ رزگارکردنی هەموو زەوی و ئاسوودەکردنی هەموو مرۆڤ خەبات بکەن... تاکو کەس مافی کەس پێشێل نەکات و گەلێك ستەم لەگەلێکی تر نەکات... کە ئەمە مانای (**لاإله الا

**الله**)و مەبەستی قورئانی پیرۆزەو خەباتی موسوڵمانان بۆ بەرزبوونەوەی ئەو ئالآیەیە [١٠٣].

## برایانی موسوڵمان و توندو تیژی

برایانی موسوڵمان خوازیاری شۆڕشێکی چەکدارانەی ناو کۆمەڵ نین، هەروەکو کودەتای سەربازییشیان لاپەسەند نییە و کارو ئیشی ئەو کۆمەلآنەشیان لا ناپەسەندە کە خۆیان بەموسوڵمان دادەنێن و لەسەر پێناس(**هوية**) خەڵك دەکوژن... یان رەشە کوژی دەکەن. ..

برایان لە بەیاننامەکەدا ئیعلانی ئەوەیان کردووە کە: (ئەوان لەگەمەی سیاسیدا پابەندن بەبنەماکانی شەرعەوەو هۆکاری حەلاڵ بەکاردێنن و شێوازی ئاشتیانە دەگرنە بەر و چەکی ئەوان گوتاری ئازاد و راستگۆیانەیە و لەبوارە کۆمەلآیەتییەکاندا دەستکراوەو بێدرێغین، باوەڕیان وایە ئاگایی و هۆشیاریی رۆڵەکانی ئەم ئوممەتە بڕیاردەری دادەپەروەرانەیە لەنێوان تەوژمە فیکری و سیاسییەکاندا، ئەوانەی کە لەسایەی دەستوور و یاسادا کێبەڕکێی شەرەفمەندانە دەکەن. لەبەر ئەمانە بەهەموو جۆرێك توندوتیژی رەتدەکەنەوە و هەموو جۆرە زۆر بەکارهێنانێك پەسەند ناکەن و پێیان وایە هەر جۆرە زۆر بەکارهێنانێك رەنگە فرسەتی پەڕینە سەر دەسەلآت بۆ کۆمەلێکی نەشیاو بەدی بهێنێت. کە ئەوە لەگەڵ ویستی جەماوەردا نەگونجاوە و ئازادی پێ دەستەبەر نابێت و درزێکی گەورە لە دیواری ئاسایشی سیاسییدا دروست دەکات و بارودخێکی نەخوازراو لەکۆمەڵگەدا دێنێتە بوون. بۆیە برایانی موسوڵمان

(١٠٣) رسالة دعوتنا – مجموعة رسائل، ص١٠٥ – ١٠٧.



لەهەموو شێوازێكی توندو تیژی بەری و بەدوورن و هەموو چەشنە تۆقاندنێك بەخراپ دەزانن[١٠٤].

برایانی موسوڵمان لەبانگەوازەكەیاندا جگە لەوشەی ئامانجدار و كاری سوودبەخش هیچی تر بەكارناهێنن، چونكە ئەوە خواستی قورئانە لە بانگخوازانی، كە دەفەرموێت: ﴿**ادع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة**﴾ النحل/١٢٥. بەڵام ئەی چی بكەن كاتێك دوژمن پەلاماریان دەدات و وڵاتیان داگیر دەكات؟ لەوكاتەشدا ئەوان كۆمەڵێكن لەموسوڵمانان ئایینەكەیان فەرزی دەكات لەسەریان بەرگری لەوڵاتیان بكەن و دوژمنان و داگیركەرانی لێ بكەنە دەرەوە.

## هزری سیاسی بزاڤی ئیسلامیی[١٠٥]:

لەكۆتایی ئەم بەشەدا كە دەربارەی هزری سیاسی حەسەن بەننایە، لێكۆڵینەوەیەك بەناونیشانی (هزری سیاسی بزاڤی ئیسلامی) كە ڕاوێژكار (**طارق البشري**) نووسیویەتی تۆماردەكەم ، كە نووسەرەكەی دوای لێكۆڵینەوە لە هزری سیاسی حەسەن بەننا هەوڵی داوە ئەم هزرە بەراورد بكات لەگەڵ ئەو هزرە سیاسییە نیشتیمانی و نەتەوایەتی و ئیسلامییانەی تر كە


ڕاوێژكار طارق البشري

(١٠٤) بيان الإخوان المسلمون في ١٩٩٥/٤/٣٠.
(١٠٥) طارق البشري.



لەگۆڕەپانی سیاسی میسردان. ئەو دەڵێت:

١–بانگەوازی ئیسلامیی لەفەرمانە گشتگیرەکانی ئیسلامەوە سەرچاوە دەگرێت و کاروباری دنیا و قیامەت رێکدەخات. خوای گەورە و باڵادەست پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە و ئیسلامیش بەرنامەی دینداری و دنیاداری خەڵکە، بەرنامەی پەرستش و کارکردنیانە, موسوڵمان باوەڕدارە بەخوا و ئەنجامدەری کردەوە چاکەکانە و بنەڕەتی یاسا و ئاکارە ئیسلامییەکانیش قورئانی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، ئەگەر ئوممەت دەستیان پێوەی بێت هەرگیز رێگا ون ناکەن. ... ئەو یاسایانەی کە پێویستە لەسەر ئوممەت گوێڕایەڵی بن و لەسەری بڕۆن، لەم سەرچاوە خاوێنە هەڵجنراوە.

ئەمە بنەڕەتی بانگەوازی ئیسلام و هۆکاری بەرپابوونیەتی و بەیارمەتی خوای گەورەش تا دنیا بمێنێت ئەویش دەمێنێت و لەئەنجامدا شەریعەتی خوا فەرمانڕەوای بەندەکانی دەبێت و موسوڵمانان بەو شەریعەتە پەیامی ژیاریی خۆیان بەهەموو مرۆڤەکان پێشکەش دەکەن.

٢–مەبەستی ئەم بانگەازە پێکهێنانی بەرەیەکە لە باوەڕداران، کە ژیان بە رەنگ و سیمای ئیسلام بڕازێنێتەوە و هەموو بوارەکانی چالاکی و مامەڵە و پەیوەندییەکانی پێ جوان بکات.

هۆکارەکانیان بۆ هێنانەوەی ئەو مەبەستە، گۆڕانکارییە لەباوە گشتییەکان و پەروەردەکردنی پشتیوانانی بانگەوازە لەسەر ئاکارە ئیسلامییەکان، تا لە گوێڕایەڵی و پابەندبوون و سووربوون لەسەر جێبەجێکردنی ببنە نموونەی بەرجەستە بۆ هەموو خەڵك.

موسوڵمانان بۆ گوێڕایەڵی فەرمانی هێزئامادەکردن لە ئایەتی: ﴿**وأعدوا لهم ما استطعتم من قُوة**﴾دا (**الأنفال**/١٠) ئەوە دەزانن یەکەمین پلەکانی هێز هێزی



بیروباوەڕە، پاشان هێزی یەکیەتی و پێکەوە بوون و دوای ئەوانە هێزی بازووە بۆ بونیادنانی کۆمەلگە بەشێوەیەکی دروست تا توانای گەشەکردنی هەبێت. پاش ئەمانە هێزی چەك دێتە پێشەوە، ئەویش لەدەستی دەوڵەتدا بێت تا پارێزگاری خەڵك و خاکی پێ بکات و ویستی خەڵکی پێ بهێنێتە دی و ستەمکاران و شەڕخوازانی پێ دوور بخاتەوە و خواستی زلهێزان و فشارو هەڕەشەکانیان پووچەڵ بکاتەوە.

پلەبەندی ئاستەکانی هێزیش بەگوێرەی بارودۆخی دنیا و دەوروبەر و حاڵی کۆمەڵگە وخواستەکانی لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر دەگۆڕێت.

ئەم بانگەوازە داوادەکات کە بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەی زوڵاڵی ئیسلام و دەرکی ئەوەشی کردووە کە زۆربەی ئەو بۆچوون و زانستانەی پێشتر لە ئیسلامەوە وەرگیراون رەنگی ئەو زەمانەیان پێوەیە کە تیایدا هێنراونەتە کایە و بۆ گەلانی ئەو سەردەمانە چاك بوون. .. بۆیە ئەگەر ویستمان هاوەڵان ئاسا لە ئیسلام تێبگەین، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ بەردەم ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و خۆمان نەبەستنەوە بە قەیدێکەوە کە خوا داوای لێنەکردووین و سەردەممان بە رەنگێك رەنگ نەکەین کە لەگەڵی ناگونجێت و ئیسلام لەبازنەی سەردەمێکی دیاریکراودا قەتیس نەکەین، چونکە ئیسلام ئایینە بۆ هەموو خەڵك و بۆ هەموو سەردەمێك.

ئیسلام ئایینی ژیانە و کاروباری هەموو گەل و نەتەوەکان لەهەموو کات و شوێنێکدا رێکدەخات. تەواویی و بەرزیی لەوەدایە کە وردەکارییەکانی ژیانی هێشتووەتەوە تا بەگوێرەی بارودۆخ و شوێنی گەل و ئوممەتەکان دیاری بکرێن، ئەوەندە هەیە کە رێسا گشتییەکانی ئەو کاروبارانەی جێگیر کردووە و

ڕێنومایی خەڵکی کردووە کە بونیادیان لەسەریان بنێن و لق و پۆپیان لێبکەنەوە و لەسنوورەکانیاندا کاری خۆیان ئەنجام بدەن.

ئەوە بانگەوازێکە تایبەت نیە بە کۆمەڵێکی دیارییەوە، ڕوو لەهەموو ئوممەت دەکات و کرۆکی ئایینی بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەیەوێت هەوڵەکانی یەکبخات تاکو کارەکانی چاکتر و بەرهەمەکانی زیاتر و سەرکەوتن و پێشکەوتنەکانی گەورەتر بێت. ئەو لەگەڵ ڕاستیدایە لەهەر کوێ بێت و رقی لە جیاوازییە و پێی وایە گەورترین دەردی ئەم ئوممەتە ناکۆکی و پەرت بوونیەتی، پێی وایە سەرکەوتنی ڕابردووی بەهۆی یەکیەتی و تەبایی و خۆشەویستییەوە بووە و کۆتایی ئەم ئوممەتەش تەنیا بەوە چاك دەبێت کە لەسەرەتاوە پێی چاك بووە.

جیاوازی لەوردەکارییەکانی دینداریدا کارێکە دەبێت ببێت. .. چونکە تێگەیشتن لە ئایەت و فەرمووودەکان بەگوێرەی کات و شوێن دەگۆڕێن. جیاوازی تێگەیشتن لە نێوان هاوەڵاندا هەبووە، کە ئەوان نزیکترین کەسانێك بوون لە پێغەمبەرەوە ﷺ و چاکترین کەسانێکن کە لەئایەت و فەرموودەکان تێگەیشتوون، بۆیە ئەو جیاوازییە تا ڕۆژی قیامەت دەمێنێت، ئەویش نابێتە عەیب و ناتەواوی، بەڵکو بەپێچەوانەوە نیشانەی زیندوویەتی و گونجانی ئەم ئایینەیە کە بۆ سەرجەم زەمین و زەمانەکان کارێگەرو چارەسەرە، چونکە سەختگیری و چەقبەستویی تێدا نییە.

عەیب و ناتەواوی لە جیاوازی ڕاوبۆچوونەکاندا نییە، بەڵکو لەوەدایە، کە ڕاوبۆچوونەکان دەمارگیربن و لە ڕاوبۆچوونەکانی خەڵك ڕێگر بن. ..

ئەم لێبوردەیی و فراوانییە یە کە خەڵکی لەدەوری یەك بیرۆکە کۆدەکاتەوە. خەڵك ئەوەندەیان بەسە کۆدەنگ بن لەسەر ئەوەی مرۆڤ پێی دەبێتە

موسوڵمان و خواناس. . پاشان لەبازنەی فراوانی خواناسیدا ئازادانە جووڵەی دروستی خۆیان بکەن.

ئەم بانگەوازە هاوچەرخە، لەرۆژی سەرهەڵدانییەوە بڕیاری داوە بەهیچ شێوەك بەگژ کەسەکاندا نەچێت و ئەوەندەی لەسەر بێت فەرمانەکانی شەرعیان بۆ روونبکاتەوە و ئایەت و فەرموودەکان بخوێنێتەوە، ئەگەر پێویست بوو وتەکانی فیقه بێنێت، ئیتر بوار بداتە هەرکەسێك بەچ شێوەیەك بۆ خۆی گونجاوە پیادەی بکات، ئەم بانگەوازە بانگخوازییە نەك دادوەریی و هەڵگرانی بانگخوازان نەك دادوەر.

هەر مرۆڤێك بەوتنی شایەتومان دێتە ناو بازنەی ئیسلامەوە، بەوتنی موسوڵمان بوونی دەسەلمێت... پاش ئەوە ئەو ئەرکانەی ئیسلام داوای دەکات لەسەری پێویست دەبێت و ئەوانەی ئیسلام قەدەغەی دەکات, لێی قەدەغە دەبێت.

کەموکووڕیش لەمانەدا لەبازنەکە نایکاتە دەرەوە. . بەڵکو لادانەکەی بەو شێوەیە دەپێورێت کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ سنووریان بۆ داناوە.

نەفامی(**الجاهلية**) لەروانگەی ئیسلامەوە وەکو وشەکانی رێونکردن(**الضلال**)، یاخیبون(**العصيان**)، لەرێدەرچوون (**الفسوق**)، ستەم (**الظلم**) وایە، کە لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی خاوێندا بەکارهاتوون، مانایان لادانە لەفەرمانەکانی ئایین نەك دەرچوون لەئایین یان پاشگەزبوونەوە لێی.

کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە (**أبوذرّ**) دەفەرموێت: (**إنت امرؤ فيك جاهلية**) **رواه البخاري** ، واتە: تۆ کەسێکیت نەفامییت تێدایە. بوخاری دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: گوناهەکان فەرمانی نەفامین، خاوەنەکەی پێیان کافر نابێت جگە لە هاوبەشدانان (**الشرك**).

جیاوازی زۆرە لە نێوان گوناهکردن و ئەوکارەی دەبێتە هۆی دەرچوون لە ئایین... فەرمانە شەرعییەکان ئەوەیان روونکردوەتەوە. کەواتە کاتێ کە دەوترێ کۆمەلگەی نەفامیی ئەمە وەکو ئەوە وایە بلێین کۆمەلگەی رێ لێ ونبوو، مەبەست پێی ئەو سیفەتە زاڵە بەسەر کەسەکان و یاسا و باوەکانیدا.

ئێمە ئەوەمان لاقەدەغەیە کە موسوڵمانێك دوای ئەوەی شایەتومانی هێناو بەگوێرەی ئەو شایەتومانە جوولایەوە بەهۆی گوناهەوە بەکافری دابنێین... مەگەر خۆی دان بەکافریی خۆیدا بنێت یان شتێکی ئاشکرای ئایین رەتبکاتەوە یان قورئان بەدرۆ بزانێت، یان بەشێوازێك لێکی بداتەوە کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ زمانی عەرەبیدا نەسازێت، یان کردەوەیەك ئەنجام بدات کە جگە لە کوفر مانایەکی تر هەڵنەگرێت.

داواکاریی خوایی بەستراوە بەدنیای هۆکارەکان و بەرێساکانی خواوە لەبوونەوەردا، ئێمە لەچوارچێوەی ئەو هۆکار و رێسایانەدا داوامان لێکراوە، ئەوەندە هەیە خوای گەورە ئاسانکاری بۆ مرۆڤی باوەڕدار دەکات، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت رێساکانی بوونەوەر و هۆکارەکانی گەیشتن بە ئامانج پشتگوێ بخرێن. چونکە یاسای خوایە تامرۆڤەکان لەناخەوە خۆیان نەگۆڕن خوا حاڵی دەرەوەیان ناگۆڕێت: ﴿إن الله لا يغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم﴾الرعد/١١.

هۆکاری زۆر هەیە بانگەوازی پێ ئەنجام بدرێت و رای گشتیی پێ دابڕێژرێت و ئەو هێزانەی پێ دابین بکرێت کە ئوممەت لەهەموو بوارە جیاکاندا پێویستیەتی. هەموو ئەوانە بەشێکن لەجیهانی هۆکارەکان و ناکرێت پشتگوێ بخرێن.

هەر بەو شێوەیەش دەستدانە کاری سیاسی و ئابووری پەیوەستە بەو هۆکار و رێسا خواییانەوە کە بە دەستەبەرکردنیان شتەکان دەستەبەردەبن و بەپشتگوێ خستنیان شتەکان لەدەست دەچن.



ئەوانەی لەدەرەوەی بزاڤی ئیسلامییدا سیاسەت یان هەر کارێکی تر دەکەن هۆکار بەکاردێنن و ڕێسا جێبەجێ دەکەن.

دارشتنی دەروونی مرۆڤ و پەروەردەکردنی خەڵك و ڕێکخستنی پەیوەندی نێوانیان، ئەمانەش بەگوێرەی ڕێسای خوایی دەکرێن، پێویستە ئەو ڕێسایانە بدۆزینەوە کە دەمانگەیەنێتە ئامانج، ئامانجی پەروەردەکردنی دەروونی خواناس و دارشتنی پەیوەندییەکانی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی دروست، کێبەرکێی مرۆڤەکان یاسای هەیە، جەنگ و ئاشتیش یاسایان هەیە، هەروەکو بەدەستهێنانی باڵادەستی یاسای هەیە.

ئەوەی لەسەر ئێمەیە هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی ئەو یاسایانە و لێ تێگەیشتنیان و دارشتنیان لەبەر ڕۆشنایی ئیسلامدا بۆ خزمەتکردنی خەڵك.

کەمتەرخەمیی لەبەکارهێنانی هۆکارەکاندا، هۆکاری لەدەستدانی دەسەڵات و دواکەوتنی ئوممەت و پاشکۆیی ژیان و بەدبەختی خەڵکە، ئەمانەش هەموو تاوانی گەورەن.

گرنگیدان بەجیهانی هۆکارەکان و بەدەستهێنانی ڕادەی پێویست لێیان لەهەر بوارێکدا و پێگەیاندنی پسپۆڕ بەئەندازەی پێویستی خەڵك ئیسلام بەفەرزی کیفایەی داناوە. زانستەکانی سیاسەت و ئابووری و پسپۆڕبوون تیایاندا بەشێکن لەوانە.

## هزری کۆمەڵایەتی لەلای پرۆگرامی قورئانی پیرۆز لەچاکسازی کۆمەڵایەتیدا :

ئیمام بەننا بنەماکانی چاکسازی کۆمەڵایەتی بەو شێوەیەی قورئان هێناویەتی لەژێر ئەم ناونیشانەدا بەم شێوەیە دیاری کردووە:

١-خواویستی.

٢–بەرزكردنەوەی گیانی مرۆڤایەتی و مرۆڤدۆستی.
٣–جەختكردن لەسەر بیروباوەڕ بەپاداشتی خوایی.
٤–راگەیاندنی یەكسانی و برایەتی لەنێوان خەڵكدا.
٥–چاككردنی تواناكانی پیاو و ئافرەت پێكەوەو راگەیاندنی یەكسانی و تەواوكاری لە نێوانیاندا و دیاریكردنی رۆڵی گرنگی هەردوولایان زۆر بەوردی.
٦–بیمەكردن(**التأمين**)ی كۆمەڵگە بەبڕیاردانی مافی ژیان و سامانداری و كاركردن و تەندروستی و ئازادی و فێركردن و ئاسایش بۆ هەموو تاكێك.
٧–راگیركردنی هەردوو غەریزەی خۆپاراستن و جۆرپاراستن و رێكسختنی خواستەكانیان لە رۆزی و هاوسەرگیری.
٨–سەختگیری بۆ بنەبڕكردنی تاوانە سەركییەكان، تایبەتی بن یان گشتی.
٩–دووپاتكردنەوەی یەكیەتی ئوممەت و نەهێشتنی دیاردەی دووبەرەكی و هۆكارەكانی.
١٠–فەرزكردنی خەبات و تێكۆشان لەسەر ئوممەت بۆ پاراستنی ئەو بنەما پڕ لەراستییانەی ئەم یاسایانەی لەسەر بەندە.
١١– دەوڵەت سەرپەرشتیار و پارێزگاری ئەم یاسایەیە و بەرپرسە لەهێنانەدی ئامانجەكانی لە كۆمەڵگەدا، هەروەكو بەرپرسە لەگەیاندنی بەخەڵك.

## دروشمە كردارییەكانی ئەم پرۆگرامە:

ئەم پرۆگرامە قورئانییە لەهەموو یاسا دەستكردەكان و فەلسەفە تیۆریەكان بەوە جیا دەكرێتەوە كە بنەماكانی بەشێوازی تیۆری لەدەروونەكاندا و وەكو راوبۆچوون لەپەراوەكاندا و وەكو وشە بەسەر لێوەكانەوە ناهێڵێتەوە. . بەڵكو بۆ دامەزراندن و چڕكردنەوە و سوودوەرگرتن لەئاسەوار و بەرەنجامەكانیان،



خستونیەتیە چەندین قالبی کرداربیەوە، فەرزی کردەوە لەسەر ئەوەی باوەڕی بەم ئاینە هەیە و بڕیاری گوێڕایەڵی دەدات پابەند و سوور بێت لەسەر جێبەجێکردنیان، کەمتەرخەمی و فەوتانیان قبوڵ نەکات و پاداشتی گەورەی بۆ ئەنجامدەرانیانی دیاریکردووە، هەر وەکو سزایشی بەرامبەر ئەنجامنەدان و کەمتەرخەمی تیایاندا بڕیار داوە، کە هەندێ جار سزاکە هێندە سەخت و گرانە بۆنی ئەوەی لێ دێت کە مرۆڤ لە ئایین بکاتە دەرەوە.

گرنگترینی ئەو فەرزانەی کە خوای گەورە بۆ پیادەکردن و پاراستنی بنەماکانی ئەم پرۆگرامە دیاری کردوون ئەمانەن:

١-نوێژو یادی خوا و تەوبەکردن و داوای لێخۆش بوون. ..هتد.

٢-رۆژووگرتن و داوێنپاکی و خۆدوورگرتن لە رۆچوون و زیادەڕەوی لە چێژە ماددیەکاندا.

٣-زەکات و صەدەقە و سامان خەرجکردن لە خێرو چاکەدا.

٤-حەج و گەشتکردن و گەڕان بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکان و سەرنجدان لە مەلەکوتی خودا.

٥-کارکردن و رەنجدان بۆ بەدەستهێنانی پێویستییەکان و حەرامکردنی سواڵ و دەست پانکردنەوە لەخەڵك.

٦-کۆشش و خەبات و هاوبەشیی جەنگورێکخستنی جەنگاوەران بۆ پاراستنی وڵات و خەڵك و بەرژەوەندییەکانیان.

٧-فەرمانکردن بەچاکە و ئامۆژگاریکردن.

٨-قەدەغەکردنی خراپەو دوورکەوتنەوە لەخراپەکاران و شوێنی خراپەکاریی

٩-گەڕان بەدوای زانستداو فەرزکردنی لەسەر هەموو موسوڵمانێك مێ بێت یان نێر و لەسەرجەم هونەرەکانی ژیاندا، هەرکەس بەگوێرەی بەهرەی خۆی و گونجان بۆی.

١٠–جوان مامەڵەکردن و خوگرتن بەئاکارە جوانەکانەوە.

١١–سووربوون لەسەر پارێزگاری جەستە و هەستەکان.

١٢–زەمانەتی کۆمەڵایەتی و هاوکاری لەنێوان کاربەدەستان و خەڵکدا بەچاودێری و گوێڕایەڵی[١٠٦].

## کاریگەری ژیاری ڕۆژئاوا لە ژیانی کۆمەڵایەتی زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییدا:

سەختترینی ئەو دیاردانەی دەرئەنجامی ژیاری ڕۆژئاوای ماددیی، کە ئایینی لە ژیان وەدەرنراوە، لەم خاڵانە کورت دەبێتەوە:

١–ئیلحاد و گومان دەربارەی خواو ڕەتکردنەوەی هاتنی ڕۆژی دوایی و خۆ قەتیس کردن لەسنوورە ماددیەکانی ئەم بونەوەرەدا.

٢–قەدەغە نەهێشتن و خۆتاودان بەدوای چێژ و زیادەڕەوی لە ڕابواردن و بێسنوورکردنی غەریزەکان.

٣–قۆرخکردن و دەستگرتن بەسەر خێر و بێری وڵاتدا لەلایەن هەندێ تاك و چین و گەلەوە.

٤–سووخۆری و گرتنەبەری هەموو ڕێگایەك بۆ بەربڵاوکردن و گشتگیرکردنی لەناو خەڵك و دامودەزگاکاندا.

بەرهەمی ئەم دیاردە ماددیانە لەکۆمەڵگەکاندا بریتییە لە گەندەڵی دەروونەکان و لاوازی ڕەوشت و خاوبوونەوە لەبەرهەڵستی تاوانەکاندا. بۆیە کێشەکان زۆر و قورس بوون و ئاگری شەڕیماڵوێرانکەر هەموو لایەکی گرتۆتەوەو شاکان و کۆمپانیاکان و گەلان و دەوڵەتان دژی یەك دەوەستن و

(١٠٦) بين الأمس و اليوم ص ١٢٨–١٢٩ مجموعة الرسائل.

ملی یەکتر دەشکێنن و ئەوە سەلماوە کەئەم شارستانییەتە لەدابینکردنی ژیانی کۆمەڵایەتی و سەقامگیرکردنی ئارامی و جێگیرکردنی ئاشتیدا دەستەوسانە و ناتوانێت مرۆڤەکان ئاسودە و بەختەوەر بکات، ئەگەر هەندێ کۆمەڵگەی لە رووی مادییەوە خۆشگوزەران کردبێت، ئەوە بەتێکشکانی کۆمەڵگەکانی تر کردوویەتی. ئەو هەموو زانست و سامان و هێزو دەسەڵاتەی هاتووەتە کایە، زیاتر بەباری شەڕو زیاندا بەسەر مرۆڤایەتیدا شکاوەتەوە، لەکاتێکدا کە هێشتا تاکە سەدەیەك بەسەر دەسەڵاتیدا نەگوزەراوە(١٠٧).

ئەم ژیارە رۆژئاواییە بەدیاردە خراپەکانییەوە وڵاتانی ئیسلامیی لەسەردەمی تێکشکاندا داگیر کردووە... بۆیە کۆمەڵگەکانیان بەئەندازەی جیاواز کەوتونەتە ژێر کاریگەریی تا ئەو رادەیەی کە موسوڵمانان حەقیقەتی ئایینەکەیان شارەزانین و نازانن کە ئیسلام یاسای کۆمەڵایەتی تێروتەسەلە، هەربەوشێوە دەربارەی یاساکانی دیکەی، لەڕووی سیاسی و ئابووری و راگەیاندن و رۆشنبیری و پەروەردەییەوە.

بۆیە سەختترین ئەرکێك دەکەوێتە سەر فیکری ئیسلامیی و بانگخوازانی، ئەوەیە کە ئوممەتی ئیسلامیی ئاگاداربکەنەوە لەلایەنەکانی خراپەی و هۆکارەکانی خراپبوونی و بیخەنەوە سەر رێگای چاکسازی و چارەدۆزی بۆ کێشەکانی و بنەبڕکردنی هۆکارەکانی خراپەکاری و گەندەڵی(١٠٨).

(١٠٧) بين الأمس و اليوم، حسن البنّا، ص١٤٠–١٥٨.
(١٠٨) سەرچاوەی پێشوو ص ١٤٠.

## هەندێك لەسەرنجامەكانی گەندەڵیی یاسا كۆمەڵایەتییەكان لەمیسر:

هەروەها ئیمام بەننا لەپەیامی شەشەمین كۆنگرەی برایاندا، لەساڵی (١٩٤١ز) لەسەر ئەم بابەتە دەدوێت، بە ئامار و داتای بەڵگەدار روونی دەكاتەوە، هەر چەندە لەو كاتەوە تا ئێستا دنیا زۆر گۆڕاوە بەڵام ئەو رەگەزانەی كە ئەو لەسەریان دوابوو، هێشتا وەكو خۆیانن، لێرەدا تەنها ئاماژەیان پێ دەكەین:

١–ژمارەی جوتیاران لە میسر لەگەڵ رووبەری زەوییە كشتوكاڵییەكان ناڕێكە، زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و لاوازبوونی دەستهاتی نەتەوەیی لەسامانی كشتوكاڵی كە زیاتر لە چل ساڵە سەرەولێژ دەڕوات.

كاتێك كە بانگەوازی برایانی موسوڵمان دامەزرا، یاسای موڵكایەتی كشتوكاڵی لە چڵەپۆپەی خراپیدا بوو، بۆیە برایانیش لە پێگەی گشتگیری خۆیانەوە ویستی چاكسازییان لەسەرجەم لایەنەكانی ژیاندا هەبوو، گرنگییان بەكاروباری هەموو چین و توێژەكان دەدا، بۆیە ناچاربوون بایەخ بەوپرسەش بدەن، ئەو بایەخدانە بەم شێوازانە بوو:



ئیمام بەننا لەگەڵ خۆشەویستانی



## گرنگیدانی رۆژنامەکانی برایان بە پرسەکانی جوتیاران و دێهاتەکانی میسر:

لەساڵی (١٩٣٥ز) دا ئیمام بەننا وتارێکی لەژێر ناونیشانی (دەنگی دێهات) بڵاوکردەوە تیایدا هاتبوو کە: (دێهاتی میسر هەژاری و داماوی سیمای ژیانیانە و نەزانین و بێ ئاگایی باڵی بەسەریاندا کێشاوە و نەخۆشی و شێواویی جەستە تیایاندا زۆرە و تاوان و گەندەڵیی تیایاندا باوە و خووی خراپ و خەرافیات تیایاندا بڵاوە. هەموو ئەمانە پێویستیان بەچاکسازیی خێرا و کاریگەر هەیە. ئایا ئەوانەی کاروباری ئەم وڵاتەیان بەدەستەو ئەوانەی کەبەسەر جەستە و رەنجی جووتیارانەوە خەریکی رابواردنی بێ سنورن هەوڵی چارەسەری ئەو هەموو ناهەمواریيە دەدەن؟! یان جوانی کەناری دەریا و نەرمی ژیان ئەو داماوانەی لەبیربردوون...؟) [١٠٩].

## گرنگیدانی کرداریی بەدێهاتەکانی میسر و کارکردن بۆ چاکسازیی

### گوزەرانی جووتیاران :

أ-هەر لقێك لە لقەکانی برایان لەناوچە و دێهاتەکاندا ناوی قوتابیانی ئامادەیی و زانکۆکانی ئەو ناوچەیەی لابوو، بۆ ئەوەی لەوەرزی هاوین و کاتی گەڕانەوەیان بۆ دێهات پەیوەندییان پێوەبکەن و خولی رۆشنبیری و تەندروستی و فێرکردنیان بۆ بکەنەوە لەخزمەتی دێهاتەکانیاندا خەریکیان بکەن. ئەوانە کاریان بۆ رێکدەخرا کە لەمزگەوت و جێگا گشتیەکاندا خەڵك فێری خوێندەواری

---

(١٠٩) هەفتەنامەی (الإخوان المسلمون) ژمارە ٢١ ساڵی ١٣٥٤ ك.

بکەن و ڕێنمایی تەندروستییان بکەن و شێوازی چارەسەری کێشەکانیان بۆ ڕوون بکەنەوە.

ب- هەموو لقێکی برایان کە سەرپەرشتی دێهاتی دەکرد کۆمەڵێکی لەسەر فریاکەوتنی سەرەتایی رادەهێنا و بڕێك پێویستی داودەرمانیان لابوو، بۆ یارمەتیدانی ئەوانەی دووچار دەبوون تا دەگەیەنرانە نەخۆشخانە.

ج- هەموو لقێکی برایان کاری خۆبەخشیان بۆ خاوێنکردنی دێهاتەکان پێکدەهێنا، کە خەڵك ئاسەواری پاکوخاوێنییان دەبینی دەهاتن بۆ لقەکان بۆ کاری خۆبەخش خۆیان ناونووس دەکرد، جگە لەوەش کارەکانیان جێگای ڕەزامەندی پیاوچاکان و کەسە کاریگەرەکان بوو.

د- شەوانی تاریك هاتوچۆی خەڵکی دێهات نارەحەت بوو, بۆیە هەموو کەرت یان ناوچەیەکی برایان لە لادێکاندا چرای فانۆسیان لەسەر ڕێگاکاندا هەڵدەواسی، بۆیە لەلایەن خەڵك و بەرپرسانەوە پشتگیری و دەستخۆشییان لێدەکرا.

(**محمد شوقي زكي**) ئاماژەی بۆ ڕۆڵی ئەم کارانە لە چاکسازیی دێهاتدا کردووە و دەڵێت: ڕێکخراویان بەمەبەستی گرنگیدان بە دێهات و هۆشیارکردنەوە و ڕاپەڕاندنی خەڵکەکەی پێکدەهێنا، هەندێك لەبرایان کێڵگەی نموونەییان دروست دەکرد تاکو خەڵك ڕێنمایی بکەن بۆ شێوازی کشتوکاڵی سەرکەوتوو هەروەها هاریکاری هەژارانیان دەکرد بە خواردن پێدان و یارمەتیدانی خاوەن مردووەکان و ئاشتەوایی کردن لە نێوان ئەوانەی پێکەوە ناکۆکییان هەبوو، لەرەمەزاندا زەکات و سەرفیترەیان کۆدەکردەوە و دەیانگەیاندە هەژار و دەستکورتەکان. یەکێك لە لیژنەکانی ئەو ڕێکخراوانە سەرژمێری منداڵە بێ سەرپەرشت وخێزانە بێ دەرامەتەکانی کردبوو. .. بۆ

ئەوەی بەگوێرەی توانا و لێهاتنیان کاریان بۆ دابین بکەن، ئەوانەی کە پەککەوتوو بێتوانابوونایە بەخێویان دەکردن (١١٠).

زۆرێك سەریان سوڕدەما کاتێك لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا ئەوەیان دەخوێندەوە کە برایان داوای سنوردارکردنی موڵکایەتی زەوی دەکەن. واتە داوای ئەوەیان دەکرد زەوی لە موڵکدارەکان وەربگیرێتەوە و دابەش بکرێت بەسەر جووتیارەکاندا.

(**د.زکریا البیومي**)ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە: کۆمەڵی برایان دەست پێشخەرییان هەبوو بۆ بانگەشەکردن بۆ سنووردارکردنی موڵکایەتی. ئیمام بەننا یەکەم کەس بووە کە دەنگی بەرزکردووەتەوە، لە یەکێك لەوانەکانی سێشەممەدا دەپرسێت: خانەوادەی شای میسر خاوەنی چەند زەوی و زارن لە میسردا؟(١١١)

٢-کرێکارانی میسر و کێشە کۆمەڵایەتییەکانیان و داڕوخانی ئاستی کاراییان لەهەموو بوارەکانی کاردا. . گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان حاڵی خراپ کردبوون و حاڵەتی جەنگ ژمارەی بێکارانی زیادکردبوو، تا دەهات حاڵیان بەرەو خراپتر دەچوو.

ئەوەی شایانی باسە دامەزرێنەرانی کۆمەڵی برایانی موسوڵمان شەش کرێکار و پیشەوەر بوون و ژمارەیەکی زۆری ئەوانەش یەکەمجار پەیوەندییان پێیانەوە کرد، کرێکار و پیشەوەر بوون.

توێژەری ئەڵمانی(بنین) لە باسەکەیدا بەناونیشانی (بزوتنەوەی کرێکاریی لەمیسر) دەڵێت: برایانی موسوڵمان ڕۆڵی خۆیان لەناو بزوتنەوەی کرێکارییدا دی، چونکە ئەوان هاوخەمی کێشەکانیان بوون و کاریان دەکرد بارودۆخی

---

(١١٠) الإخوان المسلمون و المجتمع المصري، محمد شوقي زكي.

(١١١) الإخوان و الجماعات الإسلامية، زكريا سليمان بيومي ص ٣٠٨.

ماددی و رۆحیان چاك بكەن. .. هەوڵیان دەدا فەرمانەكانی شەریعەتیان لەگەڵدا پیادەبكەن، یارمەتی بێ ئیشەكانیان دەدا، تاكو دەكەوتنە ئیش و یارمەتی بەردەوامی ئەوانەیان دەدا كە پەكیان كەوتبوو.

٣-كۆمپانیا قۆرخكارەكان لەمیسر بەناوی كرانەوەو ئابووری بەكاربەرەوە ناوەكانی خۆیانیان گۆڕیبوو بۆ كۆمپانیای بەرهەمهێنانی هاوبەش، ئەو حاڵەتە لە ساڵانێكی كەمدا ژمارەیەكی زۆری سەرمایەداری بەرهەمهێنا بوو، كە دیاردەی كارەكیانیان بەرتیل خواردن و گەندەڵی بوو، بەناوی كرانەوە بانكە بیانیەكانیش لەو قۆرخكارییەدا پشكی شێریان هەبوو.

٤-نەخوێندەوای تا ئێستاشی لەگەڵ بێت رێژەكەی لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی دانیشتواندا زیاد دەكات. . حكومەتیش لە چارەسەركردن و ریشەكێشكردنی خەمسارد بووە.

برایانی موسوڵمان هەر لەسەرەتای دامەزراندنیانەوە قوتابخانەی شەویان كردەوە لەهەموو لقەكاندا بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری كاریان دەكرد، جگە لەوەش بیرۆكەی مامۆستای گەڕۆكیان داهێنا. كاتێكیش كە حكومەت لەساڵی (١٩٤٦ز)دا لەسەردەمی (**العشماوي**)دا پرۆگرامی نەهێشتنی نەخوێندەواری هێنایە كایە، داوای لەبرایان كرد كە یارمەتی وەزارەت بدەن بۆ جێبەجێكردنی پلانەكەی[(١١٢)].

٥-نزمبوونەوەی ئاستی رەوشت و بڵاوبوونەوەی خراپەكاری: ئەوانە دیاردەیەك بوون لەگەڵ تیپەڕبوونی رۆژگاردا زیادی دەكردو چاوەڕوانی سەرەنجامی خراپی لێدەكرا.

٦-رەوشی تەندروستی و چارەسەركردنی نەخۆشییەكان:

---

(١١٢) الإخوان و المجتمع المصري، ص١٩٥.



چەندەها جۆر نەخۆشی درێژخایەن و پەتای ناکاو بلاّوبوو ،شێوازی چارەسەرکردنیش هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی بەخۆیەوە نەدەدی [١١٣].

ئەمانە و زۆری تریش بارودۆخی کۆمەلاّیەتی کۆمەڵگەی میسری بوون، لەو سەردەمەدا کە کۆمەڵی برایانی موسوڵمان دامەزرا و کاری تێدا دەکرد، (بێگومان هاوشێوەی لەسەرجەم جیهانی ئیسلامیی بەدی دەکرا).

## رێگا بۆ چارەسەر:

ئەو رێگایانەی برایانی موسوڵمان بۆ چاکسازی حاڵی کۆمەڵگەی میسری بەراستیان دەزانی و دەیانگرتە پێش و کۆششیان بۆ دەکرد و بەپایەی دامەزراوی ئەم چاکسازی و چارەدۆزیەیان دەزانی، بریتی بوو لەناساندنی ئیسلام و بووژاندنەوەی گیان پێی و باوەڕهێنان بەدروستی و راستی پرۆگرامەکانی لە چاکسازیدا و لێبڕان بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگە بە جەنگکردن لەگەڵ نەزانین و نەخۆشی و هەژاری و رەوشت نزمیدا. ئەمانەش بەم شێویەیەی خوارەوە:

١–پەروەردەکردنی تاکی موسوڵمان و خواناس، کە باوەڕی دامەزراو و پەرستشی رێکوپێك و خوگرتن بە رەوشتە جوانەکانەوە کالاّی بالاّی بێت و ماف و ئەرکەکانی خۆی بزانێت و تواناکانی بۆ راپەڕاندنی ئوممەتەکەی و بەرزکردنەوەی فەرمانی خوا بەکاربێنێت.

٢–پێکهێنانی خێزانی موسوڵمان لەو تاکانە –نێربن یان مێ– کە بەو پەروەردە جوانە گۆش دەکرێن.. تاکو نەوەی داهاتوو بەجوانی پەروەردە بکەن وڕێز لەو رێسایانە بکرن کەئیسلام بۆخێزانی موسوڵمانی داناوە و هەر تاکێکیش

(١١٣) رسالة المؤتمر السادس، حسن البنّا، ص٣٣٤.

لەخێزاندا ئەرکەکانی جوان راپەڕێنێت.

٣-بونیادنانی کۆمەڵگەی موسوڵمان لەو تاك و خێزانانەی کە ئەو پەروەردەیە بەرهەمی هێناون، کە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی باوەڕ و پابەندبوونە بەفەرمانەکانی ئایین و دوور بێت لە قەدەغەکانییەوە، ئەو ئایینەی کە مافەکانی فەرمانڕەوا و خەڵکی دیاری کردووە [١١٤].

٤-کارکردن بۆ پێکهێنانی حکومەتێك، یاسای خوا پیادە بکات و فەرمانڕەوایی بەسپاردە بزانێت و خەڵك لەسایەیدا هەست بە بوون و رێز و ماف و رۆڵی خۆیان بکەن.

٥-کارکردن بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك بتوانێت رابەری دەوڵەتانی موسوڵمان بکات و پرژو بڵاوییان کۆبکاتەوە و مافە زەوتکراوەکانیان بۆ وەربگرێتەوە و ئاڵای بانگەوازکردن بۆ لای خوا بەرزبکاتەوە، تاکو هەموو جیهان لەئیسلام بەهرەمەند بێت [١١٥].

## چەند هەنگاوێکی چاکسازی لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە:

ئەمانە چەند هەنگاوێکن، برایانی موسوڵمان باوەڕیان بەکاریگەرییان هەیە و بانگەشەیان بۆ کردووە و بەگوێرەیان کاری خۆیانیان ئەنجام داوە و مێژووی خۆیانیان پێ نووسیوە.

Nلەپاڵی رێکخستنی برایاندا بەشێکیان بۆ خوشکان پێکهێنا و دایەنگاو باخچەی ساوایان و قوتابخانەیان بۆقۆناغە جیاجیاکان دەکردەوە. کە لقەکانی برایان لە ناوچەکانی وڵاتدا زۆربوون، کردنەوەی ئەم دەزگا و قوتابخانانە بوویە

(١١٤) رسالة التعاليم، ركن العمل، حسن البنّا.

(١١٥) الإخوان المسلمون تحت راية القرآن، حسن البنّا، ص١٤.

نەریت و باو و بەشێك لە ئامانجەکانی برایان لە پەروەردەو فێرکردن و چاکسازیی کۆمەڵایەتییدا پێ هێنرایە دی.

لەبەر ئەوە یاسا و پرۆگرامی خوێندن بەزۆری لەلایەن داگیرکارانی ئینگلیز و فەرەنسییەکانەوە راستەخۆ یان بەهاوکاری دۆستەکانیان یان لەژێر کاریگەریی ئاراستەی توێژەر و لێکۆڵەرەکانیاندا بوو، کە ئاراستەی پرۆسەی فێرکردنی جیهانی ئیسلامییان پێدەکردن، یان کاریگەری ئەو قوتابخانە و پەیمانگایانەیان لەسەر بوو کە لەوڵاتانی ئیسلامییدا دەیانکردەوە، یان لەژێر کاریگەریی راوبۆچوونی ئەوانەدا بوو کە بۆ خوێندنی باڵا بۆ وڵاتانی رۆژئاوا رۆیشتبوون و گەڕابوونەوە. لەبەر ئەمانە و لەبەر ئەوەی پرۆسەی فێرکردن بڕبڕەی پشتی بونیادی ئوممەتە، برایانی موسوڵمان بەرپرسیارێتی چاکسازی پرۆسەی فێرکردینان کردبوویە ئەرکی خۆیان.

هەروەها لە شارەکاندا, لەگەڕەکە هەژارەکاندا و لەدێهاتەکانی میسردا دەستیان دایە کردنەوەی بنکەی تەندروستی، ئەم بنکانە چالاکی خۆیانیان هەبوو لەچارەسەرکردنی نەخۆشەکان کە بەدەیان هەزاریان لەساڵێکدا دەهاتنە ئەو بنکانە و چارەسەر دەکران.

هەروەها تیمەکانی دیدەوانییان پێکهێنا کە ژمارەیەکی یەکجار گەورەی لاوانی موسوڵمانی هێنابوویە گۆڕەپانی خزمەتکردن بە خەڵك بەتایبەتی لەبواری فێرکردن و بڵاوکردنەوە رۆشنبیری تەندروستی و ئەنجامدانی کارانی بەسوود بۆ خەڵك.

جگە لەمانە ئیمام بەننا چەندین نامە و نووسراوی ئاراستەی بەرپرسان و کاربەدەستان دەکرد، بۆ ئەوەی لابکەنەوە بەلای خەڵکەوە و کێشەکانیان چارەسەر بکەن. لەیەکێك لەو نامانەدا داوادەکات کە:

١–چارەسەری پرسی ئافرەت بکرێت ،تاکو رۆڵی ئیجابی خۆی لە کۆمەڵگەدا ببینێت. چارەسەرێك کە دەستبداتە باڵی و بەرزی بکاتەوە و پارێزگاری لیّ بکات، تا نەبێتە قوربانی ئارەزووەکان، بۆ رۆشنبیرکردنی پێداچوونەوە بۆ پرۆگرامەکانی خوێندندا بکرێت و هانی هاوسەرگیریی بدرێت و لەچۆنیەتی وەچەخستنەوە و پەروەردەکردنی منداڵ شارەزا بکرێت و گرفتەکانی ژیانی خێزانی چارەسەر بکرێت و رێگە نەدرێت لەسەیرانگاو شوێنە گشتییەکاندا ببێتە نێچیری چاوچنۆك و بەدڕەوشتان.

٢–رێگری لەخراپە و لادانی کۆمەڵایەتی بکیرێت, هۆکارەکانی راگەیاندن بۆ چاك ئاراستەکردنی کۆمەڵگە بەکاربهێنرێت و کۆمەڵگە لەئالودە بوونی فیکری بپارێزرێت [(١١٦)].

٣–گرنگیدان بەکاروباری تەندروستی گشتی لە دێهات و شاردا.

٤–دانانی سیاسەتێکی گونجاو و دامەزراو بۆ فێرکردن و گرنگیدان بەپەروەردەی ئایینی لەقوتابخانەو زانکۆکاندا و هەروەها بایەخدان بەزمانی عەرەبی و مێژووی ئیسلامیی و نیشتیمانی و مێژووی ژیاری ئیسلامی.

٥–کۆمەڵگە رێزی ئاکارە ئیسلامییە گشتییەکان بگرێت و سزا لەسەر ئەو تاوانانە دابنرێت کە زیان بەئابووری و رەوشت و هەست و نەستی خەڵك دەگەیەنن و گیانی بیانیویستی و بڵاوبوونەوەی رەوشتی بیانی دوور بخرێتەوە و رێگری بکرێت لەدوژمنایەتی کردنی ئایین و بێحورمەتی کردن بەرامبەر خەڵکەکەی.

وەکو داوای ئەم شتانەیان لەکاربەدەستان و دەسەڵاتداران دەکرد، خۆشیان

(١١٦) لەم بارەیەوە برایان گرنگییان بەشانۆی ئیسلامیی دا، یەکەمین شانۆ مامۆستا عبدالرحمن البنا دایمەزراند و یەکەمین بەرهەمی شانۆیی شانۆگەری (جمیل بثینة) بوو لەسەری پێشکەش کرا، کرا بە یەکەم هەنگاو بۆ گەڕانەوە بۆ کەلتوری خۆماڵی و چیرۆکەکانی مێژووی خۆمان.

دەستپێشخەرییان دەکرد، بۆیە لەگەڵ کردنەوەی هەر ناوچە و لقێکی برایاندا خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتیی راستەوخۆ دەستی پێدەکرد.

لەوبارەیەوە مامۆستا حەسەن بەننا دەڵێت: بیرۆکەی برایان لەزیاتر لە پەنجا شاری میسردا بڵاوبووەتەوە. لەزۆربەیاندا لیژنە بۆ یارمەتیدانی هەژاران و چاکەکاری لەگەڵ خاوەن پێویستییەکاندا پێکهێنراوە, لەپاڵ ئەو لیژنانەشدا لیژنە هەیە بۆ گرنگی بەفەرزەکان و زیندوکردنەوەی ئەو سوونەتانەی خەڵك لەبیریان چوو بوویەوە.... ئەمانەش بەشێوازی کرداری، نەك هەر بەقسە، لەوانە کۆکردنەوەی زەکات و دابەشکردنی بەسەر هەژاراندا بێ هیچ جۆرە جیاوازییەك(١١٧).

## هزری ئابووری لە پەیامەکانی حەسەن بەننادا:

لە سییەکانی سەدەی بیستەمەوە ئەم جیهانە لە رۆژهەلات و رۆژئاوادا دووچاری ئاڵۆزییەکی ئابووری سەخت بووە، ئەو ئاڵۆزییە هەرچەندە کاری زۆریش بۆ کەمکردنەوەی دەکرێت بەتایبەتی دوای جەنگی جیهانی دووەم، ئێستاش لە ئاستی دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا ترسناکیی گەورەی سیاسی و کۆمەڵایەتی لێوەچاوەڕوان دەکرێت، لە ئاستی دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەمیشدا چاوەڕوانی گرانی و داڕوخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی لێدەکرێت.

بێگومان پەیوەندی بەهێزو کاریگەر لەنێوان باری ئابووری و کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە. ئەم ژیارە رۆژئاواییەی ئێستا کە باڵی بەسەر جیهاندا کێشاوە، بنەما سیاسییەکانی لەسەر خۆپەرستی و ستەم و ژێر پێ خستنی مافی گەلانیتر دامەزراوە، هەرچەندە چەندین دەزگای نێودەوڵەتی و پەیمانی

---

(١١٧) هل نحن قوم عمليون، حسن البنا.

جیهانی بانگەشەی دادو یەکسانی دەکەن، بەڵام ئەوانە کاریگەرییەکی گەورەیان نەبووە و نەیاتوانیوە جیهان و مرۆڤ لەبەدبەختی و ئاڵۆزی رزگار بکەن و نەشیانتوانیوە داڕوخان و دواکەوتن و گرانی و جەنگەکان چارەسەر بکەن.

بیریاران و فەیلەسوفانی رۆژئاوا دەوڵەت و سیاسەتمەدارەکانیان ئاگادارکردووەتەوە، کەئەم ژیارە رۆژئاواییە بەهێزو گەشە سەندووەی کە بەهێز و دەسەڵاتی جیهانی ژێر چەپۆك خستووە، بەرەو تیاچوون هەنگاو دەنێت، چونکە دەستبەرداری وزەی رۆحی و بنەما مرۆییەکان بووە و لەدەریایەکی ماددی و خۆپەرستی و بەرەڵڵایی و ململانێ لەسەر سەپاندنی دەسەڵات بەسەر گەلانی چەوساوەدا نغرۆ بووە.

ئێمەش پاشکۆییمان بۆ ئەم ژیارە رۆژئاواییە و یاسا ئابووری و دەسەڵاتە سیاسی و سەربازییەکەی، بۆ سەرنجامێکی فەوتێنەر پەلکێشمان دەکات. . کە هەر لە ئێستاوە لەبارودۆخێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی زۆر نالەبارداین.

بارودۆخێکی ئابووریمان لەئاستی نێودەوڵەتییدا خەمی گەورەی بۆ دروست کردووین. تەرازووی بازرگانیمان زۆر لارەسەنگە و داهاتی نەتەوەییمان زۆر لاوازە و هێزی کڕینمان نزمە و بێکاری و قەرز و گرانی کاڵاکان و لاوازی وەبەرهێنانی خۆماڵی و دواکەوتنی کشتوکاڵ و پیشەسازیمان خەریکە لە ژیان بێ هیوامان دەکەن.

ئوممەتێکیش ئەگەر بیەوێت هەڵسێتەوە، پێش هەموو شتێك پێویستی بەرێکخستنی کاروباری ئابووری هەیە. .. ئەوە گرنگترین شتی ئەم سەردەمەیە.

ئیسلام ئەم لایەنەی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو یاسای پێویستی بۆ داناوە و جگە لەوەی سروشتی خۆی و فراوانی بواری یاسادانان تێیدا روونە، بۆ



بەدیهێنانی بەرژەوەندیی گشتیی ڕێی پێداوین سوود لەهەموو یاسایەکی چاك وەربگرین.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئیسلام گەشە و پێشکەوتن دەخوازێت، نەك چەقبەستوویی و دواکەوتن. ئەگەر لەفیقهی ئیسلامیی تێبگەین هۆکاری کێشە ئابوورییەکانمان دەزانین و چارەشیان بۆ دادەنێین و سوود لەئەزموونی خەڵکانی تر وەردەگرین و نموونەیەکی کەم وێنەی ئابوورییەکی سەرکەوتوو پێشکەش بەدەوڵەتانیش دەکەین، کەزۆربەیان ئابووری و کێشە ئابووریەکان بووەتە گرێ کوێرەی ژیانیان و چارەسەریشی نازانن.

ئەمە هەڵوێست و تێگەیشتنی برایانی موسوڵمانە لەچەمکی ئابووری و کێشە ئابووریەکان و چارەدۆزی بۆیان.

یاسا ئابووریەکانی دیکە کە ئەنجامی ئەزموونی مرۆڤن هەرچەندە عەیبی گەورەیان هەیە. . لەچاکەش خاڵی نین بەڵام یاسایەکن لەزەوی ئێمەدا شین نەبوون و بۆ چارەسەری بارودۆخێك هاتوون، وەکو بارودۆخی وڵاتانی ئێمە نیە، وە لەکۆمەڵگایەکدا پەیدابوون جیاواز لە کۆمەڵگەکانی ئێمە، بۆیە ئێمە خێریان لێ نابینین. ئەوە لەلایەك و لەلایکی تریشەوە، ئێمە یاسایەکی ئابووری تێروتەسەل لەبەردەستماندایە ئەگەر جێبەجێی بکەین بەئاسانی چارەسەری کێشەکانمان بۆ دەکات، لەچاکەی یاساکانی تریش سوودمەند دەبین و لەخراپەیان پارێزراو و، ئاستی بژێویمان بەرزدەبێتەوە و چینەکانی خەڵك لەیەکتر نزیك دەبنەوە و بەکورتترین ڕێگا دەگەینە ژیانی کامەرانی(١١٨).

(١١٨) النظام الإقتصادي، حسن البنّا، ص٣٣٧–٣٥٢، مجموعة رسائل.

## پایەکانی سیستەمی ئابووری لە ئیسلامدا:

ئیمام بەننا زنجیرەیەك باسی لەژێر ناونیشانی (کێشە ناوخۆییەکانمان لەبەر رۆشنایی سیسەتەمی ئیسلامییدا) نووسیوە، لەیەکێك لەبابەتەکانیدا باسی سیستەمی ئابووری دەکات. .. لەو باسەدا کرۆکی سیستەمی ئابووری ئیسلامیی روون کردووەتەوە و پایەکانی بەجوانی دیاری کردووە. بۆ ئەوەی لەرێگای راپەڕینی نویێ و چاکسازی لەلایەنە ترازاوەکانی ژیانمان رێنمایی پێویستیان لیێ وەربگرین. ئەو پایانەش ئەمانەن:

### یەکەم: سامانی چاك هۆکاری جێگیربوونی ژیانە:

ئیسلام مەدحی سامانی چاکی کردووە، پەیداکردن و جوان مامەڵە پێکردنی و خستنەکاری فەرز کردووە و سەنای پێگەی سامانداری سوپاسگوزاری کردووە. سامانداری سوپاسگوزاریشی بەو کەسە داناوە کە سامانەکەی لە رەزامەندی خواو سوودی خەڵکدا بەکاردێنێت. ئەوەشی روونکردووەتەوە کە زوهدکردن لە ئیسلامدا بەو مانایە نایەت کە خەڵك بەرازیبوون بەهەژاری و داماوی لێکیدەدەنەوە. .. ئەو ئەندازەش کە باسی خراپی دنیا و سامان و دەوڵەمەندیی کردووە، مەبەست پێی ئەو ئەنجامەیەتی کە خوانەناسان لەسەرکەشی و یاخیبوون و چەوسانەوەی مرۆڤەکاندا بەکاری دەهێنن.. ئەگینا لە فەرموودەدا هاتووە: (**نعم المال الصالح للرجل الصالح**) ماڵی چاك بۆ پیاوی چاك چەندە چاکە !!

قورئانیش بەهۆکاری جێگیرکردن و راگیرکەری ژیان ناوزەدی کردووە، بۆیە پێویستە نەدرێتە دەست نەفام و هەرزەکاران، خوای گەورە دەفەرمویێ:

**ولا تؤتوا السفهاءَ أموالكُم التي جعلَ الله لكُم قياما**﴾**النساء/٥**.

هەروەها پێغەمبەریش بەزایەدانی ماڵی قەدەغە کردووە و ئەوەی راگەیاندووە کە: خوا وتی وتی و زۆر پرسیارکردن و سامان بەفیڕۆدانی حەرام کردووە و فەرموویەتی: (**إنّ الله ينهاكم عن قيل وقال، و كثرة السؤال و إضاعة المال**) ئەوەشی روونکردوەتەوە ئەوەی لە پێناوی بەرگریکردن لەماڵ و سامانەکەیدا بکوژرێت ئەو شەهیدە دەفەرمووێ: (**ومن مات دون ماله فهو شهيد**).

**دووەم: کارکردن و سامان بەدەستهێنان لەسەر توانادار فەرزە:**

ئیسلام هانی باوەڕدارانی بۆ کارکردن داوە و سامان بەدەستهێنانی لەسەر تواناداران فەرزکردووە و سەنای پیشەوەرانی کردووە و سواڵکردنی حەرامکردووە و ئەوەی راگەیاندووە کە باشترین پەرستش کارکردنە و ئیشکردن رێبازی پێغەمبەرانە و باشترین خواردن و بژێوی ئەوەیە کە بەرهەمی دەستی خۆبێت. هەروەها سەرزەنشتی بێکاران و ئەوانەی کردووە کە خۆیان لەبەر هەر هۆکارێك دەکەنە بار بەسەر کەسانی ترەوە. .. ئەگەر چی بەخۆ یەکلاکردنەوە بۆ پەرستشیش بێت. .. کە هەندیك بەناوی پشت بەستن بەخواوە ئەنجامی دەدەن!! پشت بەستن بەخوا بریتییە لە گرتنەدەستی هۆکارەکان و ئاراستەکردنی هەوڵەکان بەرەو ئامانجەکانیان ئەوەی هۆکار بەکارنەهێنێت بەرەو ئامانج رێگای پێ نەگرێتەپێش ئەوە پشتی بەخوا نەبەستووە و لەمانای رۆزیبەخشی خوا تێنەگەیشتووە. خوا رۆزیبەخشینی پەیوەست کردووە بە هەوڵ و تێکۆشان و داهێنانەوە فەرموویەتی: ﴿**وقُلْ اعملُوا فَسيرى الله عملَكُم ورسولُه والْمؤمنونَ وستردونَ إلى عالم الْغيبِ والشهادة فَينبئُكُم بِما كُنتم تعملُونَ**﴾**التوبة**/١٠٥. .. واتە پێیان بڵێ: کاربکەن خوا و پێغەمبەر و باوەڕداران کارەکانتان دەبینن و پاشتر دەبرێنەوە بۆ لای خوای گەورە کە زانای پەنهانی و ئاشکرایە، ئەوسا هەواڵتان دەداتێ چ کردەوەیەکتان ئەنجام داوە.

هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت: (**ما اكل أحدٌ طعاماً خيراً من أن يأكل من عمل يده، وإنّ نبي الله داود عليه السلام كان يأكل من عمل يده**). واتە: کەسێك خواردنێکی نەخواردووە چاکتر بێت لەوەی کەبەرهەمی دەستی خۆی بخوات.. داود پێغەمبەر –سەلامی خوای لەسەر بێت– لەبەرهەمی دەستی خۆی دەخوارد، خەلیفە عومەریش –خوای لێ رازی بێت– دەڵێت: (**لايقعد احدكم عن طلب الرزق، وهو يقول: اللهم ارزقني، وقد علم أنّ السماء لاتمطر ذهباً و لافضة**). واتە: با کەسێکتان واز لەبەدەستێهانی رۆزی نەهێنێت، و دابنیشێت و بڵێت: ئەی خوایە رۆزیم پێ ببەخشە.. کە دەشزانێت ئاسمان نەزێڕو نەزیو نابارێنێت. هەروەها لەفەرموودەدا هاتووە: (**لايزال الرجل يسأل الناس حتّى يأتي يوم القيامة و ليس في وجهه مزعة لحم**). واتە: کەسی واهەیە هێندە داوا لەخەڵك دەکات کە رۆژی قیامەت دێت بەهۆی شەرمەزرابوونیەوە تۆزقالێك گۆشت بە رومەتیەوە نەماوە.

**سێیەم: دۆزینەوەی سەرچاوەکانی سامان:**

ئەوەی لەئاسمانەکان و زەویدایە خوا بۆ مرۆڤی فەراهەم هێناوە، توانای بەمرۆڤیش داوە کە سوودیان لێوەربگرێت، بۆیە دۆزینەوەی سەرچاوەکانی سامان و هەوڵدان بۆ بەرهەمهێنانیان یەکێکە لەکارەکانی مرۆڤ بەگشتی و مرۆڤی باوەڕدار بەتایبەتی. . چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿**ألم تروا أن الله سخر لكم ما في السماوات وما في الأرض وأسبغ عليكم نعمه ظاهرةً وباطنةً**﴾ واتە: ئایا نابینن کە خوای گەورە هەرچی لەئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدا هەیە بۆ ئێوەی ژێربار هێناوە و بەخششەکانی ئاشکرا و پەنهانی بەسەرتاندا رژاندوە). ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دۆزینەوەو بەکارهێنانی ئەو بەخششانە لەسەرمان دەبێتە ئەرك و، ئاماژەشە بۆ ئەوەی ئەگەر دەمانەوێت لەنیعمەتەکانی خوا



سوودمەندبین دەبێت بۆیان بگەڕێین و بیاندۆزینەوە. ئەوەی سەرنجی قورئان بدات زۆر بەوردی و فراوانی ئەو شتانە بەدی دەکات.

## چوارەم: قەدەغەکردنی ڕێگای خراپ لە بە دەستهێنانی ساماندا:

ماڵی چاك ئەو ماڵەیە کە بەڕێگای چاك بەدەست بهێنرێت، بەدەستهێنانی سامان لەڕێگای پیس و خراپەوە لە ئیسلامدا قەدەغە کراوە... لەو ڕێگایانە: سووکاری، قومار، دزی، فێڵ، بازرگانی بەمادە هۆشبەر و سڕکەرەکان ،گۆشتی بەراز، هەروەها لەهەر ڕێگایەکەوە کە ئیسلام ڕێگای پێ نەدابێت.

## پێنجەم: نزیکخستنەوەی چینەکان :

ئیسلام هەوڵی ئەوە دەدات چینایەتی لەناو کۆمەڵگەدا نەمێنێ، بۆیە پارە مۆڵکردن و بەهەدەردان و کەشخەپێوەکردنی قەدەغە کردووە و لەسەر سامانداڕانی فەرزکردووە کەئاستی بژێوی کۆمەڵگە بەرزبکەنەوە و هەژاری قەڵاچۆ بکەن، هەروەها مافی نەداران و هەژارانی لەسامانی دەوڵەت و سامانی دەوڵەمەنداندا داناوە و ڕێوشوێنی پێویستی بۆ گەیشتن بەو ئەنجامە دیاریکردووە.

## شەشەم: گرنتی کۆمەلایەتی( الضمان الإجتماعي ):

ئیسلام بڕیاری زەمانەتی کۆمەڵایەتی بۆ هەموو هاووڵاتییەك داوە، ئەو هاولاتییە هەر کەس بێت. هەروەها بڕیاری دابینکردنی ئاسایش و بژێوی بۆی داوە، بەمەرجێك ئەرکی سەرشانی بەجێ بهێنێت، سامەگەر ناتوان بێت، عومەری کوڕی خەتتاب –خوای لێ ڕازی بێت– جولەکەیەك دەبینێت کە دەست لەخەڵك پان دەکاتەوە، دەربارەی هۆکاری سواڵکردنەکەی پرسیاری لێ دەکات، بۆی دەردەکەوێت پەککەوتەیە، لۆمەی خۆی دەکات و پێی دەڵێت: بەرامبەرت بەئینساف نەبووین، کاتێك بەهێزبوویت جیزیەمان لێ سەندیت،

ئێستا کەلاواز بوویت پشتگوێمان خستوویت. بڕیاریدا مووچەی بۆ ببڕێتەوە. ئەمە و لەگەڵ خۆشی وچاکە و بەزەیی ویستن بۆ هەموو خەڵك.

**حەوتەم: هاندان بۆ خەرجکردنی ماڵ و سامان لەخێر و چاکەدا و فەرزکردنی زامنداری و هاوکاری لەسەر چاکە لە نێوان هاووڵاتیاندا:**

ئیسلام جگە لەوەی باوەڕدارن هاندەدات کە ماڵ و سامانیان لە ڕێگای چاکەی مرۆڤەکاندا خەرج بکەن و پاداشتی گەورەی (٧٠٠) حەوت سەد قات زیاتریشی بۆ ئەو کارە دیاری کردووە، جگە لەوەش هۆشیاری دەداتە شوێنکەوتووانی کە لەچرۆکی و سووخۆری و منەتکردن و ئازاردان بەدوور بن و، بۆ هاوسەنگ کردنی ژیان ڕێگای هاوکاری و دەستگرتن و قەرزی بێ سوودی داناوە بەیەك دەنگ بانگیان دەکات، کە لەسەر خێر و چاکە هاوکاری یەکتر بن و لەسەر خراپە هاوکاری یەکتر نەکەن: ﴿**وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان**﴾**المائدة**/٢.

**هەشتەم: ڕێزگرتنی سامان و موڵکداری تایبەتی بەمەرجێك لەگەڵ بەرژەوەندی گشتییدا دژ نەبێت:**

سامان بەخششی خوایە بۆ مرۆڤەکان، پێویستە ڕێزی لێ بگیرێت و بێ هودە لەناو نەبرێت، موڵکداری تایبەتییش مافی هەر مرۆڤێکە، پێویستە پارێزگاری لێ بکرێت، بەو مەرجەی زیانی گشتیی تێدا نەبێت و هەر شتێك ببێتە هۆی زیان گەیاندن بە سامان یان بەسامادار قەدەغە و حەرامە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**کل المسلم على المسلم حرام دمه و ماله و عرضه**). واتە: هەموو شتەکانی موسوڵمان.. خوێن و سامان و ناموس و کەسایەتی قەدەغەیە لەسەر موسوڵمان نابێ زیانی پێ بگەیەنێت، هەروەکو فەرموویەتی: (**لا ضرر و**

**لاضرار)** واتە: زیان گەیاندن بەخەڵك و تۆڵەكردنەوەی زیان بە زیانگەیاندن لە ئیسلامدا نین. واتە: حەرامن.

**نۆیەم: ڕێكخستنی مامەڵە داراییەكان بە یاسایەكی پڕ لەداد و بەزەیی و وردبینی لەكاروباری دراودا:**

ئیسلام مامەڵە داراییەكانی ڕێكخستووە و سنووری بەرژەوەندییەكانی تاك و كۆمەڵگەی دیاریكردووە و ڕێزی گرێبەستەكانی فەرزكردووە و فەرمانی بەوردبینی لە مامەڵە بەدراو كاڵاكان داوە. بۆ ئەو مەبەستەشە بەكارهێنانی ئاڵتون و زیوی بۆ هەندێ مەبەست قەدەغە كردووە، چونكە نرخی دراوی جیهانین.

**دەیەم: بەرپرسیاركردنی دەوڵەت لە پاراستنی سیستەمی دارایی:**

ئیسلام دەوڵەتی بەرپرسیاركردووە لە پارساتنی سیستەمی دارایی و جوان مامەڵ پێكردنی ماڵی گشتیی بەپەیداكردنی و پاراستنی و خەرجكردنی لەبەرژەوەندی خەڵك و وڵاتدا، عومەر –خوای لێی ڕازی بێت– دەربارەی ئەمە دەڵێت: (ئەم سامانە بەخششی خوایە و ئێوەش بەندەی ئەون، باهەموو كەسێك تادەگاتە شوانێك، لە دورترین جێگای وڵات بەشی خۆی پێ بگات باخەریكی ئاژەڵداریی خۆیشی بێت.. ئەوەش لەم سامانە شتێك بۆ خۆی لابدات، لادەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخ).

## حەرامكردنی بەكارهێنانی دەسەڵات بۆ بەدەستهێنانی سامان:

بۆ ئەم مەبەستە بەرتیلدان و بەرتیل وەرگرتن و دەڵاڵی نێوان بەرتیلدەر و بەرتیلوەرگری قەدەغە كردووە، نەك هەر بەرتیل بەڵكو دیاری بردن بۆ كار بەدەستانیش. عومەر –خوای لێی ڕازی بێت– ماڵی زیادی كاربەدەستانی

دەست بەسەردا دەگرت بۆ گەنجینەی وڵات و لێی دەپرسین: ئەمانەتان لە کوێ بوو؟ ئاگر بۆ خۆتان کۆدەکەنەوە و عەییەش بەسەر خۆتان و نەتەوەکانتان دێنن.

والی و کاربەدەستان ئەوەندەیان دەدرایە کە بەشیان بکات، (أبوبکر) کاتێك کردیانە خەلیفە بە کۆمەڵی موسوڵمانانی ووت: من لەمەوپێش بە کارکردن رزق و رۆزی ماڵ و خێزانم پەیدا دەکرد، بەڵام ئێستا کار بۆ ئێوە دەکەم بڕیاری بژێویم لەدارایی وڵات بۆ بدەن. (**أبوعبیدة**) موچەیەکی مامناوەندی بۆ بڕیاردا، لەگەڵ بەرگێك بۆ زستانی و بەرگێك بۆ هاوینی و وڵاغێکیش تاکو بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی سواری بێت. تەخمینی پێویستی ساڵێکیان بە دووهەزار درهەم بۆ کرد، وتی: بەشم ناکات. پێنج سەد درهەمی تریان بۆ زیاد کرد.

## رێگای کرداری بۆ خستنەگەڕی رێسا بنەڕەتییەکان:

ئیمام بەننا پرۆگرامی کارکردنی وادارشتبوو، کە لایەنی تیۆری و شارەزایی هاوتەریب لەگەڵ لایەنی کرداری و پراکتیکدا پێکەوە برۆن. ئەمە سیفەتێکی کارەکەیان بوو کە لە کاری بانگخوازان و چاکسازانی تری جیادەکردەوەو رەوتی بانگەوازو بانگخوازەکانیان تایبەتمەندیی خۆیی هەبوو و کارەکانیان ئامانجدار و پلان بۆ دارێژراو و روون بوون، ئەوەشی روون کردەوە کە جێبەجێ کردنی خواستەکانی ئەو دەپایەی سیستەمی ئابووری ئیسلامیی بارودۆخێکی ئابووری تەندروست دێنێتە کایە..بۆ ئەم مەبەستەش بابەتە سەرەکییەکانی دیاری کردبوو، زیاتر لەسەریان قسەی دەکرد تاکو وێناکردنی روونتر بێت و بۆ بەکردەکردنیان هەنگاوی بێترسانە بنرێت.

## برایانی موسوڵمان چالاکبیە ئابورییەکان:

برایان کۆمەڵێك کۆمپانیای هاوبەشیان پێکهێنا. ژمارەیەکی زۆر بەشدارییان تێدا کردبوو، بەپێچەوانەی کۆمپانیاکانی تر، کە ژمارەیەکی زۆر کەم لە سەرمایەداران خاوەنی بوون، روونترین نموونە بۆ ئەمە:

١–کۆمپانیای برایانی موسوڵمان بۆ رستن و چنین، کە سەرمایەکەی (٦٥٠٠) جونەیە بوو (٥٥٠) کەس تێیدا هاوبەش بوون.

٢– کۆمپانیای مامەڵە ئیسلامییەکان کە لەساڵی (١٩٣٩ ز) بەسەرمایەی (٤٠٠٠) جونەیە دامەزرا و لە ساڵی (١٩٤٥ز) دا سەرمایەکەی بوویە (٢٠٠٠٠) جونەیە. ئەم کۆمپانیایە چەند هێڵیکی گواستنەوەی پێکهێنا و کارگەیەکی گەورەی گەورەی مسی دامەزراند.

٣– کۆمپانیای دەرهێنانی کان و بەرد لە ساڵی (١٩٤٧ ز) بەسەرمایەی (٦٠٠٠٠) جونەیە دامەزرا.

٤– کۆمپانیایەکی تر بۆ رستن و چنین، لەساڵی (١٩٤٨ ز) دامەزرا و سەرمایەی (٨٠٠٠) جونەیە بوو و ژمارەی کرێکارەکانی (٦٠) کەس بوون و هەموویان تێیدا بەشدار بوون. لەماوەی دەمانگدا پوختەی قازانجەکەی گەیشتە (١٤٠٠) جونەیە.

٥– کۆمپانیای چاپەمەنی ئیسلامی و رۆژنامەی رۆژانە.

٦– کۆمپانیای بازرگانی و کاروباری ئەندازیاری لە ئەسکەندرەییە، بەسەرمایەی (١٤٠٠٠) جونەیە پێکهات، دابەش بوو بەسەر (٣٥٠)بەشدا، بۆ هەڵسان بەکاروباری بازرگانی و ئەندازیاری.

٧– کۆمپانیای بەبریکاریکردنی بازرگانی.

٨– کۆمپانیای ریکلامە عەرەبییەکان.

## بانکە ئیسلامییەکان:

ئەوەی لەکاروباری ئابووری ئیسلامیی هاوچەرخدا خەریکی باس و لێکۆڵینەوە بێت.. ناتوانێت ئەو دیاردە تازە و دروستەی دەربارەی بانکە ئیسلامییەکان فەرامۆش بکات، کە ئاواتی ساڵەهایە لەمێشکی خەمخۆرانی ئابووری موسوڵماناندا، تا خوای گەورە مۆڵەتی دا دەرگا لەو ئاواتە بکرێتەوە و ئەو بیرۆکەیە ببێتە دامەزراوە و ئێستا لە زۆرێك لەوڵاتانی ئیسلامییدا دەست بەکارە.

ئەم کارە نوێیە کە جێگای بیرکردنەوە و گرنگی پێدانی موسوڵمانانە و بەهەموو هۆکارێکی ماددی و ئەدەبی یاریدەی دەدەن. . بەڵام سەرخستنی پێویستیی بە چوارچێوەی هونەریی تایبەتی هەیە، لەهەموو بوارەکاندا پسپۆڕی تایبەتی دەوێت. هەر لەکارگێڕی و ژمێریاری و شارەزایی لە چەکە بانکییەکان و شێوازی مامەڵەکردن لە ئاستی جیهاندا، بەتایەبتی لەم بارودۆخە ئاڵۆزەی جیهانی ئابووری و داراییدا.

زۆریش پێویستە زانایان هاوکاری یەکتر بن و لەگەڵ پسپۆڕان و شارەزایانی بواری دارایی و ئابووریدا فەتوای پێویست بدەن، تاکو بانکە ئیسلامییەکان بتوانن لەبوارەکانی وەبەرهێناندا جووڵە بکەن و ماڵ و سامانی موسوڵمانان بۆ سوود و بەرژەوەندی گەل و وڵات لە ڕێگای حەڵاڵەوە بخرێتە گەڕ و ڕۆڵی سەرکەوتووانەی خۆی پێ‌ببنرێت.

لەوڵاتانی ئیسلامییدا ئومێدێکی زۆر بەبانکە ئیسلامییەکان هەیە، کە بە دوور لە سوودکاری، چاکسازیی بارودۆخی ئابووری بکەن و ئەم وڵاتانە لە ژێر دەسەڵاتی زلهێزەکاندا رزگار بکەن، ئەو زلهێزانەی کە بانکەکانیان کردووەتە کوتەکی فەرمانڕەوایی و خۆسەپاندن بەفشارخستنە سەر حکومەتەکان و

سامانەکانیان کردووەتە هۆکاری فشار بۆ مژینی سەروەت و سامانی تاك و گەلانی جیهانی ئیسلامیی.

## کاری خوێندکاران

بانگەوازی برایانی موسوڵمان چیی بە قوتابیان و خوێندکاران لە قوتابخانەکان و زانکۆکاندا بەخشیوە؟ قوتابیانی برایان چیان بەمیسر و وڵاتانی ئیسلامیی پێشکەش کردووە؟

لەباسی کاروباری خوێندکاراندا ئەم باسانە دێتە پێش و هەوڵ دەدەین لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا وەڵامیان بدەینەوە:

١-برایانی موسوڵمان یەکەمین دامەزراوەن کە لەزانکۆ و قوتابخانەکاندا کاری بانگەوازیان ئەنجامداوە.

٢- قوتابیانی برایان یەکەمین کۆمەڵن کە مزگەوت و نوێژگەیان لە زانکۆ و قوتابخانەکاندا دامەزراند و لەپێناوی ئەوەدا، لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە و زانکۆکاندا هەوڵی نەپساویان دا.

٣- قوتابیانی برایان یەکەمین دەستە بوون لەبۆنە ئیسلامییەکاندا بۆ ئاگادارکردنەوە و شارەزاکردنی قوتابیان و گەشەدان بەگیانی دینداریی‌یان ئاهەنگیان ساز دەدا.

٤- قوتابیانی برایان لەساڵی (١٩٣٨ ز) پەیوەندی لێکۆڵینەوەی ئابووری و سیاسی ئیسلامییان دامەزراند و ئەو پەیوەندییە گەشەی سەند و بوویە کۆمەڵەی لێکۆڵینەوەی ئابووری و سیاسی و دارایی ئیسلامیی لە کۆلیجی بازرگانی.

٥-هەر قوتابیانی برایان بوون رووبەڕووی ئەو نوسین و هێرشانە بوونەوە کە ئینگلیزەکان دژی ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ لە کۆلیجی ئادابەوە دەیاننووسی.

**٦- قوتابیانی برایان یەکەمین کۆمەڵ بوون کە شوێنی نیشتەجێبوونیان بۆ هاوکاری قوتابیانی وڵاتانی تر دەستەبەر کرد.**

**٧- قوتابیانی برایان لیژنەی چاکەکاری بەقوتابیانی هەژاریان لەساڵی(١٩٤٤ز) دا پێکهێنا بۆ هاوکاری قوتابیان لەڕووی ماددی و کۆمەڵایەتییەوە.**

**٨- قوتابیانی برایان لە(١٩٤٦/٢/٩ز) دا گەورەترین ڕێپێوانیان ئەنجام دا، داوای کشانەوەی ئینگلیز و پێکهێنانی یەکێتی دۆڵی نیلیان دەکرد.**

٩-حەوت لە قوتابیانی برایان لە خۆپیشاندانداا لە ڕۆژی (١٩٤٦/٢/٢١ ز)دا شەهیدبوون. . ئەورۆژە دواتر بوویە ڕۆژی قوتابی جیهانی. ئەو حەوت قوتابییەش (**محمد علی محمد**) لە کۆلیجی بازرگانی لە قاهیرە، (**محمد غنیم شاهین**، **سعد حسني برهان**، **سید علی غندور**) لە زەقازیق، (**محمد عزمي**، **محمد یاسین**)لە دەمقەلییە، (**محمد المغربي**)لە ئەسکەندەرییە بوون[١١٩].



ئیمامی شەهید لەگەڵ قوتابیانی ئیخوان

(١) گۆڤاری الآخوان المسلمون، ژمارە ٩٠.



١٠–قوتابیانی برایان بەرهەڵستی رێکەوتننامەی (**صدقي –بيڤن**)یان کرد، کە مافی میسرییەکانی تێدا خورابوو، رێپێوانیان کرد، تاکو ئەو رێکەوتننامەیە هەڵوەشێنرایەوە و سەرۆك وەزیران دەستی لەکار کێشایەوە.

١١–بەرپرسی قوتابیانی برایان (**مصطفى مؤمن**) کارێکی ناوازەی مێژوویی ئەنجامدا. .. سەفەری کرد بۆ ئەمریکا لە هۆڵی ئەنجوومەنی ئاسایش لەکاتێکدا گفتوگۆیان لەسەر پرسی میسر دەکرد لە (١٩٤٧/٨/٢٢ ز)، چوویە هۆڵەکە و بە ئینگلیزی وتارێکی دا، داوای ئازادی میسری کرد لە دەست ئینگلیز، هەروەها ئازادی فەلەستین لەدەست ئینگلیز و جولەکە.

١٢–قوتابیانی برایان هاوبەشی پڕوپاگەندەو کۆکردنەوەی کۆمەکیان کرد بۆ چارەسەری کێشەی فەلەستین.

١٣–ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیانی برایان خۆیان بەخشی بۆ خەبات لە پیناوی فەلەستیندا. . کەسەرکردەی وەکو (**حسن دوح و علي صديق و عبدالرحمن البنّا**)یان تێدا بوو.

١٥– ژمارەیەك لە قوتابیانی برایان لەسەنگەری خەباتی فەلەستیندا شەهیدبوون لەوانە (**عبدالرحمن البنانوني**، **حلمي جبريل**، **فرج ابراهيم**) و کەسانی تر.

١٦– قوتابیانی برایان هاوبەشی نەبەردەکانی کەناڵیان دژ بە ئینگلیز لەساڵی (١٩٥١ ز) کرد.

١٧– قوتابیانی برایان لەناو زانکۆکاندا سەربازگەیان بۆ ئەنجامدانی مەشقی سەربازی بۆ بەگژاچوونی ئینگلیز پێکهێنا .

١٨– قوتابیانی برایان سەرپەرشتی گەورەترین هێرشیان کرد بۆ سەر سوپای ئینگلیز لە کەناڵی سوێسدا لەناوچەی گردی گەورە لە (١٩٥٣/١/١٣ ز)دا.

نوسەری ئینگلیزی (جۆن ۆتەر فیلد) لەپەڕاوەکەیدا (میسر) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە لاوانی برایان بەو هێرشانەیان کە کردیان بۆ سەر سوپای ئینگلیز، سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا (چەرچڵ) یان ناچار کرد دەست لە مۆڵەتەکەی هەڵگرێت و بەپەلە بگەڕێتەوە بۆ لەندەن تاکو خۆی سەرپەرشتی پلانەکانی وەزارتی بەرگری بکات بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو بەرهەڵستیانەی برایانی موسوڵمان دژ بەهێزەکانی بەریتانیا پێی هەڵدەستان(١٢٠).

چەرچڵ روونکردنەوە بەناوبانگەکەی راگەیاند کە: (لەگۆڕەپانی جەنگدا رەگەزێکی نوێ و کارا بۆمان دابەزیوە) (١٢١).

١٩ –پێنج لە قوتابیانی برایان لەنەبەردەکانی دژ بە ئینگلیز لە کەناڵی سوێسدا شەهیدبوون، کە بریتی بوون لە شەهیدان(**محمد أحمد اللبان**، **محمود عبدالله عبدربّه**) لە قوتابیانی ئیسماعیلییەش (**خالد أحمد الذكري**) لە قوتابیانی ئەسکەندرەییەش (**خالد غانم**، **عمر شاهين**، **أحمد المنيسي**) بوون، هەموو ئەمانە لە مانگی یەکەمی ساڵی (١٩٥٢ ز) دا شەهید کران.


شەهید أحمد المنيسي


شەهید عمر شاهين

(١٢٠) الإخوان المسلمون في كتابات الفريقين، زياد أبو غنيمة، ص٧٠.
(١٢١) صفحات من جهاد الشباب المسلم، حسن نوح، ص ٧٣.



٢٠–لەرۆژی (١٩٥٤/٢/٢٨ ز) دووان لە قوتابیانی برایان لەگەورەترین ریپێوانی جەماوەریدا شەهید بوون کە داوای چاکسازی بارودۆخی سیاسی و گەڕانەوە بۆ ژیانی نوێنەرایەتییان دەکرد، کە بریتی بوون لە (**محمد توفيق عجينه**)لە کۆلیجی ئەندازیاری و (**محمود السحرتي**)لە دواناوەندی ئیسماعیلییە.

٢١– قوتابیانی برایان لە زانکۆکاندا بۆ چەندین ساڵ لەیادی شەهیداندا ئاهەنگیان دەگێڕا و وتار و هۆنراوەیان پێشکەش دەکرد و لەو کۆڕانەدا یادی دانەدانەی ئەوانەیان دەکردەوە و مامۆستایانیش دەربارەی رەوشت و ئازایی و لێهاتنی ئەو قوتابییە شەهیدانە وتاریان دەدا و شاهیدی کاریگەری مامۆستا حەسەن بەننایان لەسەر قوتابیانی برایانی موسوڵمان بەرز دەنرخاند.

لەنێو ئەوانەدا دکتۆر (**احمد الحوفي**) دەڵێت: لە قوتابخانەی (**سعيديه**) شەش ساڵ و لە کۆلێژی (**دار العلوم**) پێنج ساڵ مامۆستابووم لە نزیکەوە چاودێری ئەزموونی مامۆستا (حەسەن بەننا)و گەورەیی و کاریگەریی ئەوم لەسەر هەوادارانی کردووە، کەسم نەدیوە وەکو ئەوان راست و لێهاتوو و حەقگۆ و رەوشت بەرز و دڵسۆزبێت، کە شانازییان بەئاینەوە دەکرد، لەوانەکانیاندا سەرکەوتوو بوون هەربەلاوی پیاوەتییان لێ دەچۆڕاو رۆشنبیر بوون و توانای روونکردنەوەیان سەرنج راکێش بوو(١٢٢).

هەروەها دکتۆر (**عثمان خليل**) راگری کۆلێژی یاسا لە زانکۆی (**عين شمس**) هاوڕای دکتۆر (**احمد**)ە, دەڵێت: قوتابیانی هەواداری مامۆستا (حەسەن بەننا) بەڵگە بوون لەسەر راستی پەیامەکەیان. ئەوان بەڕەوشتیان (حەسەن بەننا)یان پێ ناساندم و تێگەیشتم کە ئەو پیاوە چ بلیمەتێکە، وا بە ئامۆژگاری و رێنوێنییەکانی ئەم ئیمانە بەهێز و ئەو رەوشت جوانی و ئەو مەردایەتییە لە

(١٢٢) گۆڤاری (الدعوة) ،ژمارە (١٠٤).

گیانی شوێنکەوتوانیدا دەچەسپێنێت[١٢٣].

## ئافرەت لەهزری ئیمام حەسەن بەننادا

کاتێك ئیمام بەننا کۆمەڵی برایانی موسوڵمانی لە ساڵی (١٩٢٨ ز)دا دامەزراند، ئافرەت لە تاریکایی ژیانی نەفامی و ستەمدا دەیناڵاندا، لەلایەکی تریشەوە ئاراستەی بەرەو رەوشتی خۆرئاوایی و ریشەکێشکردنی دیاردەکانی ژیانی ئیسلامیی پەلکێش دەکرا.

ئەو سەردەمە خۆری ژیاری ئیسلامیی بە پەڵە هەوری چڵکن و داپۆشرابوو، دەوڵەتی خەلافەت کە هێمای یەکیەتی موسوڵمانان بوو بۆ چەندین سەدە خاوەنی رێز و هەیبەت بوو، پاش ئەوەی پیرو پەرت پەرت بوو، بوویە جێگای تەماعی دوژمنان، پەلاماریانداو هەڵیان وەشاندو خاکەکەیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد.

رۆژهەلاتناس جیب دەڵێت: (مەبەست لەو هێرشانەی کرانە سەر جیهانی ئیسلامیی لێکهەڵوەشانی ژیاری ئیسلامیی بوو کە یەکیەتی موسوڵمانانی پێوە بەند بوو،چونکە هەر وڵاتێك لەژیاری رۆژئاوا ئەوەی پێویستی بێت وەری دەگرێت، کە پێویستییەکان بە گوێرەی ناوچەکان لەیەکتر جیان، ئەو کاتە شێوازی ژیانی ئیسلامیی یەکیەتی خۆی لە دەستدەدات و شتێك نامێنێت ناوی ژیاری ئیسلامیی بێت، پاشان دەپرسێت: ئاخۆ خاڵی هاوبەش لەنێوان گەلانی موسوڵماناندا دەمێنێت؟ ئایا هەستکردن بەیەکیەتی ئامانج و یەکیەتی کارکردن بەردەوام دەبێت؟ یان راوبۆچوونە تازەکان و پێویستییە نوێیەکانی ژیان زاڵ دەبن؟ ئەو کاتە کۆمەڵگەی موسوڵمانان پەرت دەبێت).

کەواتە تەنیا لێکهەڵوەشاندنی یەکیەتی موسوڵمانان ئامانجی بەرەو

---

(١٢٣) گۆڤاری (الدعوة) ،ژمارە (١٠٤).



خۆرئاوا بردنی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان نەبوو، بەڵکو رقبوونیش بوو لەژیاری ئیسلامیی کە دەوڵەتە داگیرکەرەکان بەکۆسپی گەورەی بەردەمی خۆیانیان دەزانی، کە بەهۆیە ناتوانن دەسەڵاتیان بەسەر ئەو وڵاتانەدا بسەپێنن. ئەمە زۆرێك لەگەورە پیاوانی خۆرئاوا ئاشکرایان کردووە، لەوانە: (لۆرد کرۆمەر) کە لەسەردەمی داگیرکاری وڵاتانی ئیسلامییدا لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا نوێنەری باڵای بەریتانی بوو لە میسر، دەڵێت: ئیسلام بەسروشتی خواستەکانی دوژمنی ژیاری ئەوروپییە، ئەو موسوڵمانەی رەوشتی ئەوروپایی نەبێت ناتوانێت فەرمانڕەوایی میسر بکات. لەبەر ئەوە پاشەڕۆژی فەرمانڕەوایی میسر بۆ ئەوانەیە کە لەسەر دەستی ئەوروپییەکاندا پەروەردە دەبن.

## بەشی خوشکانی موسوڵمان :

ئیمام بەننا ئەوەی لا ئاشکرا بو کە ئافرەت لە ئیسلامدا رۆڵی گرنگی هەیە لەپەروەردەکرنی باوکان و دایکانی داهاتوو، لەپشتگیری هاوسەران تا خواستەکانی بانگەواز بگرنە ئەستۆ.

ئەو پایانەش کە بانگەوازی برایانی موسوڵمانی لەسەر دامەزراوە بریتییە لە: پەروەردەکرنی تاکی موسوڵمان کە لەبیرکردنەوە و باوەڕ و رەوشت و سۆزداری و کارکردن و خەرجکردندا پابەندبێت بەئیسلامەوە، تاکو دوای ئەوە خێزانی موسوڵمان پێك بهێنێت. لەبەر ئەمە چۆن بایەخ بەپیاو دەدات هەرواش بایەخ بەژن دەدات، چونکە پێکهێنانیماڵی موسوڵمان بەندە بەژن و پیاوی تێگەیشتوو پێگەیشتووەو لەپێکهێنانی ماڵی موسوڵمانەوە دەگەینە پێکهێنانی کۆمەڵگەی موسوڵمان و لەوێشەوە دەگەینە پێکهێنانی حکومەتی ئیسلامیی و بونیادنانی دەوڵەتی ئیسلامیی.

# پرۆگرامی ئیمام بەننا بۆ پێگەیاندنی ئافرەت

## لەبواری کاری بانگەوازیدا:

ئیمام بەننا هەر لەسەرەتای بانگەوازەکەیەوە بۆ بەئەنجام گەیاندنی پرۆسەی چاکسازیی گرنگی بە هاویەشیی ئافرەت دەدا و ئەمەش لەپەیڕەوی ناوخۆی بەشی خوشکانی موسوڵماندا ئاماژەی پێکرا بوو.

زۆر پێویست بوو لای خوشکان خۆیان بەوکارە گرنگە هەڵسن بەپەروەردەیەکی راست و دروست خۆیان پەروەردە بکەن... پەروەردەیەك لەسەر بیروباوەڕێکی دامەزراو گەشەی لایەنی عەقڵی و زانستی دامەزرابێت و هۆکاری گرنگ بێت بۆ راستکردنەوەی هەڵسوکەوت و بیروبۆچوونیان، بۆیە بایەخ دەدا بە پەروەردەیەك بایەخ بەلایەنی جەستەیی و رۆحی بدات بەبێ‌جیاوازی، تاکو بەتوانابن و بتوانن ئەرك و کارەکانیان راپەڕێنن.

بۆ ئەم مەبەستە ئیمام بەننا هەر لەسەرەتاوە لەساڵی (١٩٢٨ ز) لەگەڵ دروستکردنی مزگەوتی برایاندا قوتابخانەیەکی بۆ کچان کردەوە بەناوی قوتابخانەی (**أمهات المؤمنين**) کە ئاکاری ئیسلامیی و زانستی تیۆری و کرداریی پێویست بۆ ئەو سەردەمە بابەتەکانی خوێندنیان بوون.

کردنەوەی قوتابخانەیەکی لەو جۆرە و لەو بارودۆخەدا کە نەخوێندەواری بەتایبەتی لەناو ژناندا رەگی داکوتابوو، کارێکی ناوازەبوو، بەتایەبتی قوتابخانەیەك بایەخ بە زانیاری ئایینی و شارستانی بدات و خوێندن تێیدا لەسەر شێوازی نوێ بێت.

پاش ئەوە ئیمام بەننا بەشی خوشکانی لە ژنان و کچان و خزمانی برایان پێکهێناو بەناوی تیمی خوشکانی موسوڵمان و بەشێوازێکی زانستی و پلاندار

لائیحەی کاری خوشکانی بۆ داڕشتن. ئامانج و هۆکار و پەیڕەوی ناوخۆی بۆ دیاریکردن.

لەئامانجە دیاریکراوەکانیان لەو لائیحەدا پابەندبوون بەئاکاری ئیسلامی و بانگخوازی و رەوشت جوانی و روونکردنەوەی زیانی ئەو بیرە پووچانەی لەو سەردەمەدا لەناو ژناندا باو بوون.

دوای گواستنەوەی بارەگای برایانی موسوڵمان بۆ قاهیرە لەساڵی (١٩٣٣ ز) تیمێك بۆ خوشکان پێکهێنرا و لەیەکەمین وتاریدا سەرۆکی ئەو تیمە (**لبيبة أحمد**) بارودۆخی خراپی کۆمەڵگەی میسری بۆ خوشکان روون کردەوە، بەپێویستی زانی بزاڤێکی چاکسازی بێتە کایەوە لەناخ و ماڵ و دەزگاکاندا دەست بداتە چاکسازی حاڵی ئەو ئوممەتە و یەکەمین هەنگاویش لە ئافرەتەوە دەست پێ بکات، چونکە ئافرەت یەکەمین مامۆستای ژیانە و بەدەستێك لانکە دەجووڵێنێت و بەدەستەکەی تری دەتوانێت جیهان بهەژێنێت، هەروەها ئاراستەی ژنانی کرد کە بایەخ بەخۆیان بدەن و رۆڵێ چاکسازی بگێڕن و لەو کارەشدا پێویستە فەرمانەکانی ئیسلام ئاراستەیان بکات.

ئیمام بەننا گرنگی بە پێگەیاندنی کادر و سەرکردەی ئافرەتان دەدا، تاببنە پێشەنگ بۆ ژنان و بەپابەند بوونیان بە بەها ئیسلامییەکانەوە ئاراستەی کۆمەڵگە و چاکسازیی دۆخی ژن بکەن. لە م سۆنگەیەوە هەوڵی دەدا کەسانێك لەژنان پەروەردە بن تاکو بتوانن ئەو بەرپرسیارێتییە بگرنە ئەستۆ، بۆیە کۆمەڵێکی لێ هەڵبژاردن، وانەی تایبەتییان لەرووی پەروەردەیی و بیروباوەڕ و چۆنیەتی گرتنی هەڵوێستی دروست لەهەلومەرجە جیاوازەکاندا دەخوێندو کاریان لەسەر دەکرا بۆ ئەوەی ببنە کادری سەرکەوتوو و پێشەنگ و سەرکردە بۆ ژنان، تابتوانن سەرکەوتووانە نوێنەرایەتی خوشکانی موسوڵمان لەدام ودەزگا و کۆڕ و بۆنەکاندا بکەن.

هەروەها دەستیان دایە کۆکردنەوەی ئەو خوشکانەی کە لە زانکۆکاندا بوون و ئەوانەی لەبوارەکانی ژیاندا شارەزایی و رۆشنبیریان هەبوو،کە لەو کاتەدا ژمارەیان سەدو بیست خوشك بوو.. خولێکی یەك ساڵەیان بۆ کردنەوە بۆ شارەزابوونیان لە بیروباوەڕی دروست و زۆرێکی تری بوارەکانی ئایین و ژیان.

## ئامانجەکانی پرۆگرامی پەروەردەیی خوشکان :

١–بوژاندنەوەی گیانی خواناسی و دینداریی و شارەزابوون لە ئیسلام بەو رادەیە خوشکانێکی کارا و بەتوانا پەروەردە ببن بتوانن پرۆگرامەکانی چاکسازیی برایانی موسوڵمان بەرجەستە بکەن.

٢–برەودان بەرەوشتە جوانەکان و ئاکارە بەرزەکان بۆ گەشەدان بەگیان و ئاراستەکردنی بۆخێر و چاکە.

٣– ئاراستەکردنی ئافرەتان بۆ رێگا پەروەردەییە دروستەکان تاکو نەوەی نوێ بەشێوەی تەندروست لەهەموو روویەکەوە پەروەردە بکرێت و لەهەموو کەمتەرخەمی و ناتەواوییەکی جەستەیی و عەقڵی بپارێزرێت.

٤–هەوڵدان بۆ رەنگڕێژی ماڵەکان بەرەنگی موسوڵمانێتی، بۆ پیادەکردنی فەرمان و رێنموونییەکانی قورئان و سوننەت و شارەزاکردنی خوشکان لەژیانی هاوسەرانی پێغەمبەر و ئافرەتە هەڵکەوتووەکان لە مێژووی ئیسلامدا.

٥–بنبڕکردنی بیدعە و خورافیات و ئەو بیروبۆچوونە پووچەڵانەی مێشکی ئافرەتیان پڕ کردبوو، هەروەها ئەو رەوشت و خووە ناپەسەندانەی لەناویاندا باو بوون.

٦–بلاوکردنەوەی رۆشنبیری نوێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی شارەزایی و لێزانی.

٧-گرنگیدان بەکارو باری ماڵ و پێکهێنانی خێزان و پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر بناغەی ئیسلامیی دروست.

٨-بەشدارکردنیان لەپرۆسە کۆمەڵایەتییە بەسوودەکاندا بەگوێرەی لێهاتن و تواناکانیان وەکو: بنکە تەندروستییەکان و خانەی منداڵان و شوێنی سەرپەرشتی بێ سەرپەرشتان و باخچەی ساوایان و قوتابخانەکان و دەزگاکانی یارمەتیدانی هەژاران. ئەوەش بەگوێرەی لائیحەی تایبەتی بە هەر پرۆسەیەك لەو پرۆسانە و بە پێی خواستی دەستە کارگێڕییەکانیان و سەرجەم ئەمانە بەپێی یاسای ژمارە (٤٩)ی ساڵی (١٩٤٥ ز) لەوەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی تۆمارکران.

٩-یارمەتیدانی دەستەی گشتی برایانی موسوڵمان لە راپەڕاندنی کارەکانی و پیادەکردنی پرۆگرامە چاکسازییەکەیدا.

## چالاکییە گشتییەکانی خوشکان:

لەو چالاکییانەی کە خوشکان لە ریزی کۆمەڵی برایانی موسوڵماندا لەسەردەمی ئیمام بەننادا پێی هەڵدەسان جۆراوجۆر بوون لایەنی بانگەواز و پەروەردە و کۆمەڵایەتییان دەگرتەوە، جگە لەهەڵوێستی سیاسی. رۆڵیان لەکاتە سەختەکان و ماوەی بوونی هاوسەرەکانیان لەزیندان و بەندینخانەکاندا لەبەرچاو و کاریگەر بوو، لەهەموو ئەو پێشهاتە سەختانەی بەسەر ئەو کۆمەڵەدا هات هەر لەساڵی (١٩٤٨ ز) ەوە تا سەردەمی ناصر و سادات و دوای ئەویش خوشکان پاڵەوانانە رۆڵیان گێڕا.

لەساڵی (١٩٤٨ ز) لەبەشی خوشکان دوو لیژنە بۆ رووبەڕوو بوونەی ئەو ناڕەحەتییانەی تووشیان هاتبوو پێکهێنرا، یەکەمیان خواردن و بەرگ و

دەرمانی ئامادە دەکرد بۆ ئەو برایانەی لە زیندانەکاندا بوون و ئەوی تریان سەرپەرشتی ئەو خێزانانەیان دەکرد کە پیاوەکانیان بەندکرابوون.. سەریان لێدەدان و لەڕووی ماددی و مەعنەویەوە هاوکاریان دەکردن، بەتایبەتی هەژار و کەمدەستەکانیان و بۆرزگارکردنیان لە زیندان سکاڵایان پێشکەش بەلایەنە بەرپرسەکان دەکرد.

پێش ئەوە لەساڵی (١٩٤٦ ز) دا قوتابخانەیەکیان بۆ کچە بێ باوکەکان کردەوە بەناوی (لانەی پەروەردەی کچ). بەڕێوبەرەکەی (**فاطمة عبدالهادي**) و سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕییەکەی (**آمال عشماوي**)بوو.

چالاکی خوشکان پەرەی سەند پێشانگای ساڵانەیان لەمیسر و لەدەرەوە ڕێکدەخست. لەو پێشانگانەدا کاری دەستی خوشکان پیشان دەدرا، بۆ ئەو مەبەستە دەستە ڕەنگینەکان دەخرانە گەڕ. جگە لە کردنەوەی ئەو جۆرە قوتابخانانە و ئەو جۆرە پێشانگایانە چالاکی خوشکان لەبواری تەندروستیشدا هەنگاوی ناو دەستیان دایە کردنەوەی بنکەی تەندروستی، لەساڵی (١٩٥٤ ز)دا یەکەم بنکەی تەندروستییان پێکهێنا، کە لەبەڕێوەبردنی ئەم بنکانەدا برایانیش خۆبەخشانە هاوکاریان دەکردن. چەندین پزیشك و شارەزا بەشدارییان تیایاندا دەکرد، لەوانە دکتۆر (**أحمد الملط**) کە پێکهێنەری یەکەم ڕێکخراوی پزیشکی ئیسلامییە لەهەشتاکانی سەدەی بیستەمدا.

خوشکانی هەر لقێك تیم و لیژنەیان پێکدەهێنا و پلانیان دادەنا بۆ ناسینی ئافرەتانی ناوچەکەیان، سەردانیان دەکردن و لەڕووی تەندروستی و کۆمەلایەتی و ئایینییەوە شارەزایان دەکردن، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی گرفتە تایبەتەکانیان سەردانیان دەکردن و دیاریان بۆ منداڵان و کۆمەکی ماددیان بۆ



خێزانە هەژارەکان دەبرد، هەروەها سەردانی نەخۆشەکانیان لە نەخۆشخانەکان دەکرد و بە دیاری و دڵنەوایی بەسەریان دەکردنەوە.

جگە لەمانەش لەپرسەکانیاندا بەشداریان دەکرد و ئامۆژگاری پێویستیان دەکردن کە ڕێز لەمردووەکانیان بگرن و واز لەو خوو نەریتە خراپانە بێنن کە لە پرسەکاندا پەیڕەوییان دەکرد. لەسەرجەمی ئەم چالاکییانەدا سوودیان لە شارەزایان وەردەگرت و هاوبەشیان پێدەکردن، تاکو لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەکەیاندا ڕۆڵی جوانیان هەبێت. . سەر ئەنجام ژمارەیەکی دیار پزیشك و مامۆستا و ڕۆشنبیرانی شارەکان دڵسۆزانە سەرپەرشتی ئەو کار و چالاکیانەیان دەکرد.

## بەرهەڵستی بەگاورکردن:

نێرراوە بەگاورکەرەکان (تەبشیرییەکان) هەژاریی خەڵکیان دەقۆستەوە و لەڕێگای دیاری بردن و کۆمەککردنەوە بانگیان دەکردن تاکو ببنە گاور، خوشکانی موسوڵمان لەڕوویاندا وەستان و ساماندارە موسوڵمانەکانیان لەوە ئاگادار کردەوە، تاڕۆڵی خۆیان ببینن و سامانەکانیان لە خزمەتی ڕزگارکردنی خەڵك لەداماوی و هەژاری بەکاربێنن و ڕێگا لەهێرشی بەگاور کردن ببڕنەوە، ئەمەش کاریگەریی زۆری هەبوو لە پوچەڵکردنەوەی پلان و نەخشەکانی تەبشیرییەکان بۆیە ناچاربوون نائومێدانە بەرەو دوا گەڕانەوە.

## چالاکی خوشکان لەبواری سیاسیدا :

لەو سەردەمەی مێژووی میسردا خوشکان هەڵوێستی سیاسی سەخت، بەڵکو ئازایانە و پێشەنگییان هەبوو... لەڕووی داگیرکاری ئینگلیز و دار و دەستەکانیدا دەوەستان، لەساڵی (١٩٤٦ز) دا سکاڵانامەی ناڕەزایان دایە

نوێنەری باڵای بەریتانی، لەسەر ئەوەی سەربازەکانیان ئازاری خەڵکی سفیلیان دابوو.


حاجی زینب غەزالی

هەروەها لەکاتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی برایاندا لەلایەن حکومەتی میسرییەوە، سکاڵانامەیەکیان دایە سەرۆك وەزیران هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکەیان بەپووچەڵ و بێبایەخ سەلماند، وێنەیان دایە سەرجەم وەزیران و ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران و بەرپرسە گەورەکان و کۆشکی شا و سەرۆکایەتی وەزیران.

ئەمانە کۆمەڵێك چالاکی گرنگ و ناوازە بوون، بەتایەتی بۆ ئەو سەردەمە، جگە لەمانە خوشکانی وەکو (**زينب الغزالي**) لەبواری بانگەواز و کاری سیاسیدا هەڵکەوتن و لەسەردەمەکانی پاشایەتی و (جمال عبدالناصر) و (أنور السادات) و (حسنی مبارك)دا سەرکەوتووانە کاری بانگخوازی و سیاسییان ئەنجام دەدا و رۆڵی گەورەیان دەبینی.

ئەوەی سەرنجی کاری خوشکان بەگوێرەی رێبازی ئیمام بەننا بدات بۆی دەردەکەوێت کە پرۆگرامێکی کرداریی بۆ وەگەڕخستنی تواناکانی ژنان لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا رەچاوکراوەو سوود لەتوانای ژنانی شارەزا لەمامۆستایان و پزیشکان و کەسانی تریش وەرگیراوە. ..

ئەمانەش بەمە زیاتر روون دەکرێنەوە کە:

١-هانی خوشکان دراوە کە لە هەر بوارێکی پێویستی ژیاندا کارمەندبن، بەو مەرجەی رەچاوی پابەندبوون بە فەرمانە ئیسلامییەکانەوە بکەن.

٢-ڕۆڵی ئافرەت تەنیا بە قسەکردن و ڕادەربڕین نەبووە، بەڵکو ڕاستەوخۆ لەمەیداندا دەست بەکاربوون، بۆیە کارەکانیان سوودمەند و بەرهەمدار بوو، چونکە پرۆگرامەکەیان بۆ جێبەجێ دەکرا و زۆرێك لەواقیعی ئافرەتانی موسوڵمانیان گۆڕی [١٢٤].

## برایانی موسوڵمان و قیبتیەکانی میسر

ئیمام بەننا و برایانی موسوڵمان هەر لەسەرەتاوە نموونەی لێبوردەیی ئایینی بوون، لەدەمارگیری بەدوور بوون، سەیری برا قیبتییەکانیان وەکو برای هاووڵاتی دەکرد، جگە لەوەش ئەوانیان بەخاوەن کتێبی ئاسمانی دەزانین، موسوڵمانانیش لەسەریانە باوەڕیان بەخوا و فریشتەکان و پێغەمبەران و پەڕاوەکانی خوا هەبێت، ئیمام بەننا ئەم مانایەی لە دڵی قوتابییەکانیدا دەچاند و نووسراو وتار و وانەکانی بەم مانایە دەڕازاندەوە.

ئیمام بەننا لەم بارەیەوە دەڵێت: ئیسلام بەرنامەی خوایە کە ڕابووردوو ئێستا و ئایندەی گەلان دەزانێت. دەقەکانی ئەم بەرنامە پیرۆزە بەروونی و ڕاشکاوانە مافی کەمایەتییەکان دەپارێزێت.. دەفەرموێت: ﴿**لا ینهاکُم الله عن الذین لَم یقاتِلُوکُم في الدین ولَم یخرجوکُم من دیارِکُم أنْ تبروهم وتقْسِطُوا إلیهم إن الله یحب المقْسِط**ین﴾**الممتحنة**/٨.

واتە: خوای گەورە قەدەغەی نەکردووە لێتان لەگەڵ ئەوانەی لەسەر ئایین، لەگەڵتان ناجەنگن و لەجێ و شوێنی خۆتان دەریان نەکردوون کە چاکەیان لەگەڵ بکەن و لەگەڵیان دادپەروەر بن, خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت، واتە: کاتێك خوا ئێوەی خۆشدەوێت لەگەڵیان دادپەروەربن.

---

(١٢٤) وتارێکی د.مکارم الدیری لە ٢٠٠٦/١١/٣٠.

ئیسلام رێز لە مرۆڤبوونی ئادەمیزاد دەگرێت و بەیەك دەنگ رووبەهەموان دەفەرموێت: ﴿**يأيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائلَ لتعارفوا**﴾**الحجرات**/١٣.

واتە: ئەی خەڵکینە هەموو ئێوەمان لە نێرو مێیەك فەراهەم هێناوە و کردومانن بەچەندین گەل و هۆز, تاکو یەکتر بناسن و چاکە لەگەڵ یەکتر بکەن.

پاشان ئیسلام رێزی بیروباوەڕ و ئایینی مرۆڤەکان دەگرێت و فەرزی کردووە کە شوێنکەووتوانی باوەڕیان بەهەموو ئایینە ئاسمانییەکان هەبێت ﴿**قولوا آمنا بالله وما أنزلَ إلينا وما أنزلَ إلى إبراهيم وإسماعيلَ وإسحاق ويعقوب والاسباط وما أوتي موسى وعيسى وما أوتي النبيونَ من ربهم لا نفرق بين أحد منهم ونحن له مسلمونَ**﴾**البقرة**/١٣٦.

واتە: بڵێن باوەڕمان هەیە بەخوا و بەو پەڕاوەی بۆ ئێمە هاتووە و بەو پەیام و پەڕاوانەی بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانیان هاتووە.. بەوانەش کە لەلایەن خواوە بۆ موسا و عیسی و پێغەمبەرانی تر هاتوون و جیاوازی لەنێوان هیچ کام لە پێغەمبەراندا ناکەین و ئێمە بۆ فەرمانی خوا گوێڕایەڵین.

پاشان رێزی لە باوەڕداران گرتووە و بەبرای یەکتر وەسفی کردوون و برایەتی کردووە بە بناغە بۆ چاکسازیی لە نێوانیاندا، ئەوەشی روون کردووەتەوە ئەو چاکسازییە خواپەرستییە و بەو هۆیەوە خوا رەحمیان پێدەکات: ﴿**إنما المؤمنونَ إخوةٌ فأصلحوا بين أخويكم واتقوا الله لعلكم ترحمونَ**﴾**الحجرات**/ ١٠.

ئەمە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە کەلەسەر چاکەکاری و دادو ئینساف دامەزراوە، شوێنکەوتووانی جیاکاری و دووبەرەکی نانێنەوە، بەڵکو بەرگی پیرۆزی لەبەر ئەو چاکەکاری و دادپەروەری و برایەتییە دەکەن (١٢٥).

(١٢٥) رسالة نحو النور، حسن البنّا.



## واقیع باشترین نموونەیە:

ئەوە ئاراستەی ئیسلام بوو بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئایینەکانی تردا، ئیمام بەنناش سوور بوو لەسەر ئەنجامدانی ئەو ئاراستانە ولەڕووی ئەوانەشدا دەوەستا کە ئیسلامییان بەدەمارگیری ناوزەد دەکرد..

لەوانەیە هەندێك کەس بڵێن: بنەما و قسەکان زۆرن و ئەنجامدان و کردەوەکان کەمن!! بەڵام واقیعی مێژوویی چەندین هەڵوێست و ڕووداوی تۆمارکردووە، ئەوەی سەلماندووە کە ئەو کەسایەتییەو برایانی موسوڵمان بەوپەڕی خۆشەویستی و لێبوردەیی و جوامێرییەوە لەگەڵ هاوڵاتییە قیبتییەکاندا ژیاون و ئەوانیش هاوشێوەی ئەمان هەڵوێستی جوانیان نواندووە، هەرچەندە چەندین ناحەزو کینە لەدڵ ویستوویانە نێوانیان تێکبدەن و پەیوەندییان ئاڵۆز بکەن.

### لە ئیسماعیلییە:

کەسانێك لە ئیسماعیلییە لەسەرتای بانگەوازەوە ویستیان ئاشوب بنێنەوە لەنێوان موسوڵمان و مەسیحییەکاندا، سکاڵایەکیان بەناوی کەسێکی مەسیحییەوە نوسیبوو، دابوویانە وەزارەت، کە مامۆستایەکی موسوڵمانی دەمارگیر بەناوی (حەسەن بەننا) کۆمەڵێکی دەمارگیری و دامەزراندووە و سووکایەتی بەقوتابییە مەسیحییەکان دەکەن و قوتابییە موسوڵمانەکان زاڵ دەکەن بەسەریاندا. بۆیە داوایان کردبوو ئەو مامۆستایە بگوێزرێتەوە تاوەکو ئاشوبێك لە ئیسماعیلییە بەرپا نەکات. ئەم سکاڵایە گەڕێنرایەوە بۆ ئیدارەی قوتابخانەکە و مەسیحییەکان زۆریان لاسەخت بوو، بۆیە شاندێکیان بەسەرۆکایەتی چاودێری کەنیسەکەیان لەگەڵ چەندین کەسی دیاریان هاتن و

سکاڵای نارەزاییان دژی ئەو سکاڵایە نووسی و ناردیانەوە بۆ وەزارەت کە ئەو جۆرە کارانە پیلانگێڕین و دەستی خراپەکارانی لەپشتەوەیە.

## لەشاری قەننا:

لەساڵێ (١٩٤١ز) لەسەردەمی (حسن سری پاشا)دا، لە ژێر فشاری ئینگلیز حەسەن بەننا گوێزرایەوە بۆ شاری قەننا و لەوێ دەستە تێکدەرەکان بەپەلە کەوتنە پڕوپاگەندە کردن دژی ئەو و دژی برایانی موسوڵمان کە گوایە چاویان قیبتییەکان نابینێت و هەمیشە لە کەمیندان بۆ زیان پێگەیاندنیان.

جا داخۆ ئیمام بەننا چۆن ئەو بوختانەی پووچەڵ کردەوە؟

لەنامەیەکیدا کە بۆ باوکی نووسیوە دەڵێت: کۆمەڵی برایانی موسوڵمان سەرکەوتووانە بەرەو ئامانجی خۆی هەنگاو دەنێت. .. دوێنێ ئاهەنگێکی گەورەمان گێڕا، سەرجەم قیبتییەکان بەمەترانەکەشیانەوە بانگهێشت کرابوون، هەموو هاتبوون، ئێمەش راوبۆچوونی خۆمانمان باسکرد، کە جێگای رەزامەندی ئەوان بوو، هەروەها گوڕزێکی کاریگەر بوو دژی پیلانگێڕان و دووڕووان کە دەیانەوێت ئاشوب لەنێوان ئێمە و ئەواندا بنێنەوە.

## فریستۆ بریکاری حەسەن بەننا بوو:

کاتێك لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٤٤ز)دا ئیمام بەننا خۆی بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەنی نوێنەران لەبازنەی ئیسماعیلییە پاڵاوتبوو، پیاوێکی بەڕەگەز یۆنانی مەسیحی –کە ناوی (خواجە باولۆ فریستۆ) بوو– کردە بریکاری خۆی. ئەمەش لای خەڵك زۆر جێگای سەرنج بوو، کە هەڵوێستی برایانی موسوڵمان لەگەڵ مەسیحییەکاندا چۆنە... هەرچەندە پارتی سەعدییەکان و بەتایبەتی (أحمد پاشا نقراشی) و (محمود فهمی النقراشی) ئەم کارەیان کردبووە جێگای توانج و گاڵتە پێکردن.



## سەردانی خۆشەویستیی:

مەسیحییەکان لەسەرانسەری میسردا لەگەڵ برایانی موسوڵماندا هەستیان بەگیانی خۆشەویستیی و لێبوردەیی دەکرد، بەتایبەتی لەبۆنە ئایینییەکاندا سەردانی یەکتریان دەکرد و برایانیش هەواڵی ئەو سەردانانەیان لە رۆژنامەی **(الإخوان)** دا بڵاودەکردەوە. یەکێك لەو هەواڵانە لەبەرواری (١٩٤٦/١١/١٠) دا، بەم شێوەیە بڵاوکراوەتەوە: (بەڕێز مەترانی شەرقییە و پارێزگاکانی صەعید لەرۆژی جەژنی قوربانی (١٣٦٥ ك) بۆ پیرۆزبایی سەردانی بارەگای برایانی موسوڵمانی لە زەقازیق کرد. بە ڕێزیان لەژێر ناونیشانی (دیاری جەژن)دا، وتارێکی درێژیان پێشکەشی ئامادەبووان کرد، وتارەکەی بانگەشە بوو بۆ یەکڕیزی. چونکە یەکڕیزی هۆکاری سەرکەوتنە و لەکۆتایی وتارەکەیدا وتی: سوپاسی برایانی موسوڵمان دەکەم چونکە ئەوان بەهەست و نەست برامانن، هەروەکو لە پشتگیری و کارکردندا برامانن).

## پێگەی کۆبوونەوەی ئایینەکان:

یەکێك لەو رووداوە خۆشی ئاوەرانە لە ساڵی (١٩٢٧ ز)دا ڕووی داوە ئیمام بەننا لە یاداشتەکانیدا تۆماری کردووە نوسیویەتی: (چل رۆژ دوای گەیشتنمان بە ئیسماعیلییە، لەبەر ئەوەی شوێنی نیشتەجێ بوونەکەمان بەکەڵکی حەوانەوە نەدەهات، گەڕاین بۆ ئەوەیماڵێك بە کرێ بگرین، رێمان کەوتە ماڵێکی سێ نهۆمی. نهۆمی سێهەممان بەکرێ گرت، نهۆمی یەکەمیان کۆمەڵەك جولەکە کردبوویانە یانە و کنیست و نهۆمی دووەمیش کۆمەڵەیك مەسیحی کردبوویانە یانە و کەنیسە و ئێمەش نهۆمی سێهەممان کردە شوێنی نیشتەجێ بوون و نوێژگە، بۆیە ئەم ماڵە بوویە پێگەی کۆکردنەوەی هەرسێ ئاینە سەرەکییەکە، ئەوەشم بیرناچێ زێوانی کەنیسێتەکە ناوی (دایکی شالۆم) بوو،

هەموو شەوێكی شەممە بانگی دەكردین بۆ ئەوەی چراكانی بۆ هەڵكەین و لە (**توليع و أبوالجاز**) دا یارمەتیمان دەدا، بەدەم گاڵتەكردنەوە پێمان دەوت: تاكەی لەم فێڵانە كۆڵ نادەن. . ئەم فێڵانە لای خوا سوودتان پێناگەیەنن!! پێمان دەگوت: كە خوای گەورە رووناكی و ئاگری لە رۆژی شەممەدا لێ قەدەغە كردوون، ئەی خۆ سوود وەرگرتن و چاوكردنەوەی لێ قەدەغە نەكردوون... ئەویش داوای لێبوردنی دەكرد و گفتوگۆكە بەخۆشی كۆتایی پێدەهات).

## هاوكاری بەبێ بەكەم دانان و كەمتەرخەمی:

ئەوەی لەو حاڵەدا پێی هەڵدەساین بەرامبەر دراوسێكانمان هاوكاری و لێبوردنی راستەقینە بوو، بەرامبەر هەر بەهایەكی ئایینی و نیشتمانی.. بۆیە كاتێك برایانمان یەكێك لە گەورە پیاوانی مەسیحییان بینی بەناوی (**القمص سرجيوس**) بەشێوەیەكی ناشیاو بەرامبەر ئایین و نیشتیمان دەجووڵایەوە، یەكسەر لە رۆژنامەی (**الإخوان**)دا لە ١٩٤٧/٥/١٣ دا بەسەختی لەسەریان نووسی: دەزانین كە (**القمص سرجيوس**) لەگەڵ هەندێ لە هاونیشتمانی قیبتیدا لە كەنیسەیەكی ناو سەربازگەی بەریتانیدا بۆ رێكخستنی پیلانێك كۆبوونەتەوە، تا هێرش بكەنە سەر كەنیسەی زەقازیق. لەو كارەدا دەستی داگیركاران بە ئاشكرا دیارە كە دەیانویست ناكۆكی و ئاژاوە بخەنە ناو رۆڵەكانی ئەم نیشتمانە. كە ئەوەش سیاسەتێكی چەپەڵی داگیركارانە، كە هەمیشە ناكۆكییان خستۆتە نێوان خەڵك تا خۆیان باڵا دەست بن، جا چۆن پیاوێكی ئایینی مۆڵەت بە خۆی دەدات ببێتە جێبەجێكاری پیلانەكانی ئەوان دژ بە وڵات و ئایین.

(**سرجیوس**) بەم کارەی و بەو وتارانەی کە بڵاوی دەکردنەوە و تیایاندا گاڵتەی بەکەسایەتی رابەری گشتی و بانگەوازی برایانی موسوڵمان دەکرد، نەك هەر هەستی موسوڵمانانی بریندار دەکرد، بەڵکو هەستی مەسیحییەکانیشی بریندار دەکرد، کە یەکێك لەوان بەناوی (أمین برسوم) وتارێکی بڵاوکردەوەو تیایدا روو لە ئیمام بەنناو برایانی موسوڵمان دەکات و دەڵێت: (برایانی هاونیشتیمانیم ئەوەی لای سەرجەم قیبتییەکان جێگای داخە، هەندێ وتاری ئابڕوبەرانەی (**القمص سرجیوس**) مان بینی، زۆر بەنەشیاوی دەزانین لە پیاوێکی ئایینییەوە دەرچێت.. گاڵتە بە رابەری گشتی برایانی موسوڵمان بکات ئێمە ئەو وتارانە ریسوا دەکەین...ئێمە لەگەڵ برایانی موسوڵمان هەست بە برایەتییەکی گەرم دەکەین... ئێمە هەموو لەم نیشتیمانەدا هاوبەشین و ئاییندارییش بۆ خوا دەکرێت).

ئەوەی لەمیسر دەگوزەرێت و گەلێك جار ئاشوب سەردەردێنێ و شەیتان ژەهری خۆی دەرێژێت برایانی موسوڵمانیش بە دانایەتی و لێبوردەیی و چاوپۆشی دەیگوزەرێنن وامان لێدەکات داوای بەزەیی و سۆزی خوایی بۆ گیانی ئەو شەهیدە بکەین، کە چەندە لێزان و دووربین بووە و چەندە لای گرنگ بووە رێز لەهەموو خاوەن ئایینێك بگرێت. قوتابیان و شوێنکەوتووانیشی بەرێگاکەی ئەودا دەڕۆن و دەستبەرداری نابن.

## هەڵوێستی برایانی موسوڵمان دەربارەی پرسی قیبتیەکان لە پەرلەماندا:


د. أكرم الشاعر

دکتۆر (**أکرم الشاعر**) ئەندامی پەرلەمانی میسری لەسەر لیستی برایانی موسوڵمان ئەوەی

دووپاتکردووەتەوە کە خۆی و سەرجەم ئەندامانی پەرلەمانی برایان لەسەر خواستی کۆمەڵی برایان ئامادەن کە پشتگیری تەواو لە سەرجەم پرس و داخوازییەکانی قیبتییەکان بکەن و بەو پێیەی ئەوان کۆمەڵێکی رەسەنی کۆمەڵگەی میسرین و لێی جودا نین و نابن بەپێی ئایینی ئیسلام ئەوان هاوبەشی ئەم وڵاتەن و هەموو ئەو مافانەیان هەیە کە موسوڵمانان هەیانە و ئەو ئەرکانەشیان لەسەرە کە لەسەر ئەوانە و چارەسەری کێشەکانیان چارەسەری کێشەکانی نیشتیمانە.

(**أكرم الشاعر**) دەڵێت: یاداشتنامەیەکی ئامانجداری لەیەکێك لەسەرکردە قیبتییەکانەوە کە (عادل جرجيس) بەرپرسی لاوانی کەنیسەیە لە پۆرسەعید بەدەست گەیشتووە. .. تیایدا کێشەکانی قیبتییەکان و چۆنیەتی چارەسەریان دیاری دەکات و رێگا لەو گرژی و ئاڵۆزییانە دەگرێت کەبەناوی تایفەگەریەوە دێنە ئاراو چارەی زۆر کێشەی دیاری کردووە، کە رۆژانە روو دەدەن لەوانە کێشەکانی هاوسەرگیری و جیابوونەوە لای قیبتییەکان و کێشەی میرات کە پێشنیاری کردووە بە پێی شەریعەتی ئیسلام بێت، و کێشەی ئەوقافی قیبتی و چەندین کێشەی تر کە هەن، یان روو دەدەن. ئاماژەشی بۆ ئەوە کردووە کە ئەو یاداشتنامەیە چەندین کەسایەتی قیبتی هاوبەشی کردووە لە ئامادەکرنیدا..

**هەروەها** (عادل جرجيس) لەسەرەتای ئەو یاداشتنامەیدا ئەوەی باسکردووە کە برایانی موسوڵمان لەلایەن دەوڵەتەوە ستەمیان لێکراوە بەو ستەم لێکردنەوە کەوتونەتە پێگەی بەرگری لەخۆکردن، دەوڵەت وا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات کە کارێکی ترسناکیان ئەنجام دابێت یان رێگر و جەردە بن. . بۆیە ئەوانیش ناچاربوون کەخۆیان یەکلابکەنەوە بۆ بەرگری لە خۆکردن، دەربارەی تاوانێك کە لە بنەڕەتدا نەیانکردوەو نیە، پاشان دەڵێت: برایانی موسوڵمان



ئەرکێکی گەورە دەکەوێتە سەریان کەسەرکردایەتیکردنی ئەم گەلەیە کە لێی بێبەش کراون.

جەرجیس لۆمەی برایان دەکات لەسەر ئەوەی چوونەتە پێگەی بەرگری.

هەروەها ئەوەشی روون کردوەتەوە کە دەوڵەت خۆی ئاشوب لەنێوان موسوڵمانان و قیبتییەکان دەخولقێنێ.. ئەوەی ئەگەر کێشەیەك لە نێوان موسوڵمانێك و قیبتییەك رووبدات، دەبێ بچنە دەزگای ئاسایش کە ئەمە جیاکارییە بەرامبەریان.

لە کاتێکدا برایانی موسوڵمان داوای ئەوە دەکەن قیبتییەکان لە کۆمەڵگەی میسریدا جیاکاریان لەگەڵ نەکرێت و وەکو موسوڵمانان ماف و ئەرکیان هەبێت. .. ئەمە پێشنیارێکە کە گۆشەگیری قیبتییەکان چارەسەر دەکات و ئەو کاتە کێشەکان بەئاسایی لای پۆلیس چارەسەر دەکرێن نەك لای ئاسایش.

(أكرم الشاعر) ترسی ئەوەی هەیە کە پشتگیری برایان لەپرسی قیبتییەکان رقی دەوڵەت هەڵسێنێت، کە بۆ بەهانەیەك دەگەڕێت تا وڵات بەرەو کێشە و گرفت ببات، گوایە بەوە دەسەڵاتی بەهێز دەبێت.

لەوەش سەرسامە کە هەندێك وای بۆ دەچن برایان دژی قیبتییەکان بن، لە کاتێکدا کە ئەو نوێنەرێکی برایانە، نوسینگەکەی لەماوەی پێنج ساڵی رابووردودا (٤٠) هەزار داواکاری لەسنووری بازنەکەی خۆی پێگەیشتووە، زیاتر لە (٥٠٠٠)پێنج هەزار دانەیان داواکاری قیبتییەکانی پۆرسەعید بووە.

ئەوەشی روون کردەوە کە تەنها نووسینگەکەی ئەو بەو شێویە نەبووە، بەڵکو نووسینگەی سەرجەم نوێنەرانی برایان بەو شێوەیە بوون...ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە قیبتییەکان برایانی موسوڵمان بەدۆستی خۆیان دەزانن و باوەڕیان وایە کە ئیسلام چارەسەری کێشەکانی ئەوانیشی تێدایە.

## بۆچوونی بابا نیسین:

بابا دکتۆر کریستیان ڤان نیسین، راهیبێکە لە دێری باوکە یەسوعییەکان لەشەبرا، بەڕەگەز هۆڵەندییە و لەساڵی (١٩٦٢ز)ەوە لە میسر نیشتەجێیە، لە بواری پەیوەندی نێوان موسوڵمان و مەسیحییەکاندا کارایە، نەك هەر لە ڕووی سیاسییەوە بەڵکو لە بواری کۆمەڵایەتی و کلتوریشەوە. ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەو کەسێکی ئایینی و زانسیتییەو لەبواری کارەکەی خۆیدا زۆر شارەزایە، بەتایبەتی کە ماوەیەکی زۆرە لە میسر لە کۆلیجی زانستە مرۆڤایەتییەکان مامۆستای فەلسەفە و لاهوتە و ئەندامی لیژنەی فەلسەفەیە لە ئەنجوومەنی باڵای رۆشنبیری، هەروەها ئەندامە لەلیژنەی فەلسەفە و ئایینەکان لە ئەسکەندەرییە و ئەندامی دەستەی وانەبێژییە لەپەیمانگای دۆمەنیکان بۆ لێکۆڵینەوە رۆژئاواییەکانی بابا جۆرج.

کریستیان پەیوەندی ئیمانی نێوان موسوڵمان و مەسیحییەکان بە پرسی ژیان و خولگەی لێکۆڵینەوەکانی دەزانێت و ئەو پەیوەندییەی بەدرێژی لە پەڕاوێکدا بەزمانی فەرەنسی بەناوی (مەسیحییان و موسوڵمانان لەبەردەم خوادا بران) چارەسەر کردووەو پێشکەشی دکتۆر(محمود رجب) مامۆستای فەلسەفەی کردووە و نووسیویەتی: بۆ یادگاری برای لەبەر خوام (محمود رجب) کە هاوڕێیەتی ئەو سەرچاوەی زوڵاڵی ئەم کتێبە بووە.

لە چەند دێڕێکدا شارەزایی و قەناعەتی خۆی دەربارەی پەیوەندییەکانی مەسیحی و موسوڵمانەکان دەگێڕێتەوە، کە زۆر جێگای سەرنجە بەتایبەتی کە ئەو بڕوانامەی دکتۆرای لە هزری ئیسلامییدا بەدەستهێناوە و بابەتی دکتۆراکەی (تێگەیشتنی ڕێسا خواییەکان لە تەفسیری (المنار) دا لە نووسینی مامۆستا (محمد عبده)دایە. کریستیان گەیشتووەتە ئەو دەرەنجامەی کە

پەیوەندی هاوسەنگ لە نێوان مەسیحی و موسوڵماندا لەسەر بناغەی هاونیشتیمانی بوون و پرۆسەی هاوبەش نەبێت نایەتەدی، ئەمەش پێویستی بە تێگەیشتنی قووڵ و دیالۆکی بەردەوام هەیە، ئەو پێی وایە. . ناوچەی بە یەکگەیشتنی رۆحی وەکو نوێژ و دەروون خاوێنکردن. بە یەکگەیشتنی نێوان ئەو دوو لایەنە دەبێتە هۆی لەناوچوونی کۆسپەکانی نێوانیان و لەناوبردنی هەر ئاستەنگێك لەهەر لایەکیانەوە بێت.

کرستیان پێی وایە هەموو کێشەیەك بە گفتوگۆ چارەسەر دەکرێت، ئەمەش بۆ جیهانی مەسیحی نایەتەدی تاکو لە ئیسلام وەکو خۆی تێنەگات، کە ئایینێکە نرخی ئیمانی و رۆحی خۆی هەیە و پێویستە لەو هەموو گومان و بیروبۆچوونە هەلأنە دووربکەوێتەوە کە لەدوای (١١)ی سبتەمبەری (٢٠٠١)ەوە لەجیهاندا هاتوونەتە کایە.

## بەهێزکردنی پێکهاتەی نەتەوەیی:

لەسەرەتای نەوەدەکانەوە، لە لیژنەی زانستنی سەندیکای ئەندازیارانەوە ئەندازیارێکی هاوڕێم هات بۆ لام و لاوێکی پیێ ناساندم وتی: ئەمە ئەندازیار ئەخنوخ فانوسە سەرۆکی سەنتەری رۆشنبیری ئەمەریکی لە قاهیرە.

یەکسەر پرسیارم لەو لاوە کرد، تۆ کوڕی خەباتگێڕی گەورە لویس فانوسی؟ وتی: بەڵێ، باوکم راوێژکاری سیاسی حەسەن بەننا بوو. هاوڕێکەم زۆری لاسەیر بوو ئەو هات ئێمە بەیەکتر بناسێنێ، کەچی ئێمە لە پێش هاتنی ئەودا یەکترمان ناسییەوە.. منیش چیرۆکێکی نێوان بەننا و فانوسم دەزانی بۆم گێڕانەوە.

ئەم چیرۆکە نووسەری ناودار مامۆستا (**عبدالحلیم ابوشقة**) بۆی گێڕامەوە لەچلەکانی سەدەی رابووردودا روویداوە، کاتێك دوو لاوی مەسیحی لە (**طنطا**)وە داخوازی پێشکەش دەکەن، تاکو پەیوەندی بکەن بە ریزەکانی برایانی موسولْمانەوە.

لێرەدا برایان دوو ڕایان دەبێت: رای یەکەمیان دەڵێت: ئەوە کارێکی گونجاوە و دەبێت، راکەی تر دەڵێت: نابێت. نامەیەك بۆ ئیمام بەننا دەنووسن و داوای رای ئەو دەکەن. مانگێك یان زیاتر تێدەپەڕێت وەڵامەکە ناگاتەوە.

بەڵام کاتێك ئیمام بەننا لە یادی لەدایك بوونی پێغەمبەردا ﷺ بۆ وەڵامدانەوەی بانگهێشتەکەیان بەو بۆنەیەوە هات بۆ لایان و هاوڕێ و راوێژکارە سیاسییەکەشی مامۆستا لویس فانوسی لەگەڵ خۆی هێنابوو و جگە لە ئیمام مامۆستا لویسیش لە ئاهەنگەدا وتاری پێشکەش کرد، و وتی: میسر خاوەنی شارستانییەتێکی دێرینە و لە پێش ئیسلام و لەسەردەمی ئیسلامدا بونیاد نراوە و پێویستە لەسەر موسوڵمان و مەسیحی بیپارێزن و لەسایەیدا پێکەوە بژین و هەموویان پێکەوە بۆ گەشەپێدانی هاوکاربن.

دوای ئاهەنگەکە برایان لەگەڵ رابەرەکەیان کۆبوونەوە لەسەر باسە پێشووەکە پرسیاریان لێکرد. لەوەڵامدا وتی: لەکاتی خۆیدا بەڕەزامەندی وەڵامی داوەتەوە، ئەی بۆ وەڵامەکەی نەگەیشتووە؟ پێدەچێت کەوتبێتە دەست یەکێك لەو برایانەی کە نەیاری وەرگرتنی ئەو دوو لاوە مەسیحییە بوون لەریزی برایانی موسوڵماندا.. ترسی ئەوەیان هەبوو بێت کە لێتێکچوونێك رووی دابێت، بۆیە پێیان باش بوو چاوەڕێ بکەن.

وەنەبێ ئیمام بەننا تەنیا یەك راوێژکاری مەسیحی هەبوو بێت، بەڵکو کۆمەڵێك لەپیاوانی گەورەی مەسیحی لەوەرگرتنی هەڵوێستی سیاسی

نیشتیمانی دروستدا یاریدەدەری بوون.. چونکە دەیویست هەمووان بەرەو پێش ببات. . نەك تەنیا دەستەیەك یان تاقمێك... نیشتیمانیش پێویستی بەهەموو دەستێکی دڵسۆز هەیە و هەموو کەسێکیش پێویستە ڕێزی بیروباوەڕ و راوبۆچوونی بگیرێت [١٢٦].

**وآخر دعوانا أن الحمد لله ربّ العالمين.**

(١٢٦) التربية الحضارية عند الإمام البنّا، د.سيد دسوقي، ٢٠٠٦/١٢/٧.

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |



| | | |
|---|---|---|
| ١٢ | ســـــەدەیەك تەمـــــەنی نـــــوورین، مامۆســـــتا عەبدولكـەریمی مـودەڕیس بـە پێنووسـی خـۆی بناسە | ئـــا: عەبدولـــدائیم مـــەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵــەتی خیلافــەت، بوژاندنــەوەی كۆمەڵگــەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئـەدەبی گاڵتەوگـەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پـرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دكتـــۆر صـــەباح بـــەرزنجی پێشەكی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئـان وەحـی ئاسمانـە، نـەك ڕەنگدانـەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەكر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیـــسلامو سیاســـەت، لێكۆڵینەوەیـــەك لەمـــەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێكهـاتنی، ڕێكخـستنی، چـەكەكانی، هێـزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەكانی | ن: پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەكان لە پێشكەوتنە زانستییەكاندا | ن: د. كاوە فەرەج سەعدون |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | یەکـەمین دەستووری نووسـراو لـە جیهانـدا، بـەڵگەنامەیەکی گـرنگی سـەردەمـی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵلا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیـسلامنەناسیی، وەڵامێـك بـۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبولڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پاڕەزانی |
| ٢٦ | دوورگـەی بیناسـازان، چـیرۆکێکی پەروەردەییـە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسـینی: د. عەبدولحەمیـد ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانـی: ئامینـە صـدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمـان، تەسـەووف، ڕۆژهەڵاتناسـی، ژن، ڕەخنـەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجـە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیـەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامـادەکردن و وەرگێڕانـی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مـەلا ئیدریـسی بەدلیـسی، ڕۆڵـی لـە یەکخـستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسـەن مـەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |



| | | |
|---|---|---|
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب رەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٦ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:<br>ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٧ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٨ | کۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێڕی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفی محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |